# کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان

محەمەد رەسوڵ هاوار




بەرگی سێیەم

2007

وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٥١٠)



# کورد و باکوری کوردستان

## لە سەرەتایی مێژووەوە
## هەتا شەڕی دوهەمی جیهان

بەرگی سێهەم

نووسینی
محەمەد رەسول هاوار

چاپی دووەم

سلێمانی ٢٠٠٧

# کوردو باکوری کوردستان

## لە سەرەتایی مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان

نوسینی: محەمەد رەسوڵ هاوار

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

نەخشەسسازی بەرگ: دیاری جەمال

سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل

چاپی یەکەم ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك

چاپ: چاپخانەی کارۆ - سلێمانی ٢٠٠٧

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردنی ( ٥٧٩ )ی ساڵی ٢٠٠٧ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

## ناوەڕۆکی بەرگی سێهەم

## پێشەکی

لەگەڵ ئەوەشدا لەهەردوو بەرگەکەی پێشوودا بۆ هەریەکەیان پێشەکیەکم پێشکەشکردووە بەخوێنەرانی بەڕێز، بەڵام بەپێویستم زانی لەم بەرگەی دواییشدا پێشەکی‌یەك بخەمە بەرچاو.

لەهەرسێ بەرگەکەدا باسی زنجیرەیەك شۆڕش‌و ڕووداوو بەسەرهات‌و ڕاپەڕین کراوە کە بەداخەوە ئەو شۆڕش‌و ڕاپەڕینە یەك بەدوای یەکانە هەموویان کپ‌و خامۆش کراون‌و هەموو جارێك کورد لەئەنجامیا تووشی زیانێکی زۆری ماڵی‌و گیانی‌و ماڵ کاولی بووەو لەهیچیانا سوود لەڕووداوەکانی بەرلەخۆی وەرنەگیراوە.

مامۆستای مێژوونووسی گەورەی کورد ئەمین زەکی بەگ لەهەموو کەس زۆرتر هەستی بەوە کردووە کە کورد دەرس‌و پەندی لەڕووداوو بەسەرهاتەکان وەرنەگرتووەو لەلاپەڕە (٢٤٤)ی کتێبە بەنرخەکەیدا (مێژووی کوردو کوردستان)، هەروەکو لەباسی دووهەمی بەشی سێهەمی ئەم بەرگەدا ئاماژەمان بۆ کردووە بەدورودرێژ باسی هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی کردووە بەشێوەیەکی گشتی‌و هی شۆڕشەکانی باکووری کوردستان بەتایبەتی‌و منیش پوختەی بۆچوونەکانی ئەوم لەوەرگێراوە عەرەبیەکەی ئەو کتێبەوە کردوە بەکوردی‌و ئەمین زەکی بەگ داخ‌و خەفەتی خۆی هەڵڕشتووە بەرامبەر بەو کەم‌و کووڕییانەی لەشۆڕشەکانی کوردا بەدی کرابون‌و هەروەکو مێژوونوسوو زانایەکی دووربین ئەوەی خستۆتە بەرچاو کە کلیلی سەرکەوتنی بزوتنەوەی نەتەوایەتیی کورد بریتییە لە

سەرکەوتنی خەباتو شۆڕشی کورد لەباکوری کوردستانداو بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە پیرۆزە پێویستە لەسەر کورد ئەو ڕاستیە بخاتە پێش چاو.

کاربەدەستانی ڕژێمی تورك هەر لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی کە زۆربەی میللەتان مافی ڕەوای خۆیان دەسگیربوو, ئەوانەی لەژێر باڵی عوسمانیدا بوون یەك لەدوای یەك لەتورکیا جیابوونەوەو تەنها مایەوە سەر کورد کە بەداخەوە نەخۆی بەشێوەیەکی ڕاستو دروست کەوتە خۆی بۆ دەسگیربوونی مافەڕەواکانیو نەبارودۆخی ناوچەکەو نە هەڵوێستی دەوڵەتان لەوەدا بوو ببێت بەلایەنگری کورد وەکو لەبەرگی دوهەمو سێهەمدا دێتە بەرچاوو حکومەتی تورك لەئەنجامی ئەمەدا نەخشەی توانەوەو لەناوبردنی کوردی کێشاو توانی گەلێك یاسای ناڕەوا دەربکات دژی کوردو بۆ قەدەغەکردنی زمانی کوردیو ڕێگەگرتن لەبلاوبوونەوەو پەرەپێدانی ڕۆشنبیری لەناوچە کوردنشینەکاناو شان بەشانی ئەمە ئەوپەڕی جەوروستەمی بەکارهێنا بۆ سەرگرتنی نەخشەکانیو بۆ ماوەی (٦٠-٧٠)ساڵ هەرچی لەتوانایدا بوو دژی کورد کردیو بەهەزارانی لەسێدارەداو سەدان هەزار خێزانی لەخاکی نیشتمانی خۆی دوورخستەوەو پەرەوازەی کردنو هەرچی بۆنی ناوی کوردو کوردایەتی لێ بهاتایە بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە لەناوی دەبرد, بەلام لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلاو ئەو هەموو نەخشانەی بۆ لەناوبردنی کوردو توانەوەی کورد کێشابووی بەهاوکاریی ئەو دەوڵەتە سەرمایەدارو ئیمپریالیزمانەی حکومەتی تورکیان کردبوو بەکوتەکی دەستی خۆیان بۆ بەکارهێنانی لەناوچەکەدا, ئەو هەموو تەقەلایانە هەمووی بێ سوود بووەو کورد لەباکوری کوردستانا کۆڵی نەداو ئامادە بوە جار لەدوای جار تاقمێك لەتێکۆشەرانو خەباتکەرانی ڕووبەڕووی ئەو ڕژێمە فاشستە بوونەتەوەو ئامادەیە تا بەمافی خۆی نەگات کۆڵنەدات.

لەڕاستیدا ڕژێمی تورك لەکۆنەوە تەنها بەوە وازی نەهێناوە مافی کورد لەباکووری کوردستانا پێشێل بکاتو ووشەی کوردو کوردستان لەهیچ چاپەمەنییەکی ناو ولاتیا ڕێگەی پێ نەدرێت ناویان بهێنرێت، بەڵکو هەوڵێکی هەمیشەیی داوە کورد لەبەشەکانی تری کوردستاندا بەمافی نەتەوایەتی خۆی نەگات کە نموونەی ئەمە لەشۆڕشەکانی شێخ مەحمودی قارەمانو سمکۆی شکاكو کۆماری کوردستان لەمهاباد بەسەرۆکایەتی قازی محمدی شەهیددا دەردەکەوێت، بۆیە لەم سەدەی بیستو یەکەمەدا پێویستە کورد هەنگاوێکی تازە بنێت بۆ پووچەڵکردنی نەخشەکانی ڕژێمی فاشستو بۆ گەیشتنی بەو قۆناغە پیرۆزە لام وایە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بەشێوەیەکی زانیاریانە نەخشەی چۆنیەتی گەیشتن بەمافە ڕەواکانی بکێشرێتو میللەتانی تری وەکو کورد لەژێر چەپۆکی داگیرکەران ڕزگاریان بوە هەر هەمان ڕێبازیان گرتۆتەبەرو هەوڵێکی زۆریان داوە کۆنگرەیەکی نیشتمانی پێك بێنن و کوردیش هەروەکو ئەو میللەتە ڕزگاربوانە ئیمڕۆ لەهەموو کاتێك زۆرتر پێویستی بەپێکهێنانی کۆنگرەی کوردستانی هەیە کە بتوانێت نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کوردستانی تیادا بەشدار ببن و یەکێك لەئەرکە گرنگو سەرەکییەکانی ئەو کۆنگرەیەش بریتیە لەدەستنیشانکردنی ستراتیژییەکی زانیاریانە بۆ خەباتی هەموو بەشەکانی کوردستان و لاشم وایە دوژمنانی کورد لەبەرئەوەیە خۆیان و نۆکەرو وابەستەکانیان کە هەندێکیان لەژێر پەردەی کوردایەتیدا دژی پێکهێنانی ئەو کۆنگرەی کوردستانیە دەوەستن، بەڵام خەیاڵی دوژمن خاوەو کورد واز لەمافە ڕەواکانی خۆی ناهێنێت تانەگات بەئامانج.

لەندەن —هاوار

## بەشی یەکەم

## شۆڕشی ئارارات (ئاگریداغ)

پێشەکی:

لەدوای شکانی شۆڕشی پیران و ئەو کارەساتەی بەسەر کوردا هات, حکومەتی تورکی فاشستی لەدڕندەیەتیی خۆی نەکەوت و لەجاران زۆرتر کەوتە سەر سەودای لەناوبردنی کورد بۆ ئێجگاری و دەستیکرد بەبەجێهێنانی ئەو نەخشەیەی لەمێژبوو ئامادەی کردبوو بەنیازی ئەوەی جارێکی‌تر کورد لەباکووری کوردستانا لەتوانایدا نەبێ هیچ جۆرە بزوتنەوەو جموجولێك بکات بۆ داواکردنی مافی کوردو بۆ ئەو مەبەستە وەکو لەدوا باسی شۆڕشی پیراندا باسکراوە دەستیکرد بەلەسێدارەدان و زیندانکردن و کاولکردنی ماڵ‌ودێهاتی کوردو گواستنەوەی بەکۆمەڵ بۆ شوێنە دوورەکانی دوورلەکوردستان بۆ توانەوەیان لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا.

بەرامبەر بەو هەڵوێستەی حکومەتی تورکیا تێکۆشەران و سیاسەتمەداران و ڕۆشنبیرانی کورد کەوتنە خۆیان و بڕیاریاندا دەست بەشۆڕشێکی جەماوەری بکەن بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو نەخشەیەی بۆ لەناوبردنی کورد کێشرابوو, لەهاوینەهەواری (بحمدون) یەکەم کۆبونەوە بەسرا کە لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاردرا ڕێکخراوو کۆمەڵەکانی کورد کە هەبوون هەمویان هەڵوەشێنرێتەوەو لەهەموویان کۆمەڵێکی یەکگرتوو پێك

بێت بەناوی (خویبون)ەوەو کۆمەڵی خۆیبون بڕیاریدا یەکێك لەناوچەکانی کورد هەڵبژێرێت کە بکرێت بەبنکەی ئەو شۆڕشەو بۆ ئەو مەبەستە ناوچەی ئارارات (ئاگریداغ) هەڵبژێرراو (احسان نوری پاشا) کرا بەسەرکردەی ئەو هێزانەی لەئاگریداغدا بڕیاردرا دەست بەشۆڕش بکرێت تیایاو بەرەزامەندێتی (خویبون)، احسان نوری پاشا دەستیکرد بەهەڵبژاردنی کاربەدەستانی ناوچەی شۆڕش‌و دانانی سەرکردەکانی هێزەکان‌و بۆ ئەو مەبەستە (ئیبراهیم پاشای هسکی) کە هەندێ لەسەرچاوەکان بە «برۆ» یا بە «ئیبراهیم هسکی تیللی» ناویان بردووە کرا بەلێپرسراوی بەڕێوەبردنی کاروباری ڕۆژانەی ناوچەکانی شۆڕش، کە ئەو ئیبراهیم پاشایە تا دوا هەناسەی وەك شۆڕشگێڕێکی دلێری کۆڵنەدەر لەپێناوی ئەم شۆڕشەدا خەباتی کرد.

لەباسەکانی شۆڕشی ئاگریداغدا کە کراوە بە ١٣) باس بەپێی ئەو سەرچاوانەی دەستگیرمان بوەو لەشۆڕشەکە دواون هەوڵئەدەین تا کۆتایی هێنان بەشۆڕشەکە هەموی بخەینە پێش چاوی خوێندەوارانی بەڕێزو لەناوەڕۆکی ئەم بەرگەدا (فهرست) ئەو سیازدە باسە دەبینرێت.

***باسی یەکەم:***

## هەڵوێست لەباکوری کوردستانا بەشێوەیەکی گشتی‌و لەناوچەی ئاراراتدا بەشێوەیەکی تایبەتی

لەبەرگی دوهەمدا لەکۆتایی باسی شۆڕشی پیراندا باسی تاوانی تورکەکان کرا دژی دانیشتوانی ناوچەکانی شۆڕش‌و کار بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو تورکە دڕندەکان دەستیانکرد بەکوشتن‌و سزادان‌و ئاوارەکردن‌و ڕاگوێزانی کورد بەکۆمەڵ بۆ ناوچە تورك نشینەکان بەنیازی توانەوەیان لەپۆتەی تورکداو ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیرانی کورد لەوانەش کە بەشدارییان لەشۆڕشی پیراندا نەکردبوو لەلایەن کاربەدەستانی حکومەتەوە ڕاونران‌و ناچارکران وڵات بەجێ بێڵن‌و ڕووبکەنە وڵاتانی بێگانە بۆ ئەوەی لەوێوە نەخشەی ڕاپەڕین‌و شۆڕشێك ئامادەبکەن دژی ئەو حکومەتە دڕندەیەی بەشێکی زۆری لەناوچەکانی کورد کاولکردبوو، وەلەجیاتی ئەو کوردانەی بەکۆمەڵ گوێزرابوونەوە بۆ شوێنە دوورەکان ئەو تورکانەی لەناوچەی (کوسوفو)دا بون پەلکێش کران‌و لەخاکی کورددا نیشتەجێ کران.

بەداخەوە هەروەکو لەزۆر شوێنی تریشدا بەرلەمە باسمانکردووە, کورد لەدوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی بەدواوە گەلێك ڕاپەڕین و شۆڕشی بچڕبچڕی کردووەو ئەگەر لەشوێنێکدا شۆڕش بەرپاکرابێت کوردی ناوچەکانی‌تر لێی بێدەنگ بون و بەبیریانا نەهاتبوو کە دوای سەرکەوتنی حکومەت بەسەرشۆڕشی ئەو ناوچەیەدا نۆرەش دێتە سەر ناوچەکانی‌تر, کە ئەم ڕاستیە لەبێدەنگ بوونی کوردی ناوچەکانی ئاراراتدا زۆرباش بەدی دەکرێت کەچۆن ساتێك شۆڕشی پیران دەستی پێکرد لەناوچەکانی ئاراراتدا هیچ جۆرە جم‌وجوولێکی کورد ڕووی نەدا بۆ ئەوەی باری شۆڕشگێڕانی پیران سووك بکرێت, بەڵکو شۆڕشی ئاگری داغ کاتێك ڕوویدا کە حکومەتی تورك دەستی خۆی لەشۆڕشگێڕانی پیران وەشاندبوو, خۆی بەهێزکردبوو, کارێکی واشی کردبوو لەو شۆڕشەدا هەڵوێستێکی وای هێنابوە پێشەوە کورد لەناو خۆیدا دووبەرەکی‌یەکی ناخۆش و خراپی تیادا پەیدا بوبوو کە بریتی بوو لەکولاندنەوەی کۆنە برینەکانی ناکۆکی نێوان سونی و علوی کەکاتی خۆی بەهۆی سوارەی حمیدیەوە پەیدا بوبوو, ساتێکیش کورد لەدەرەوەی وڵات بیری لەپێکهێنانی شۆڕشێکی‌تر کردەوە بۆ پارێزگاریکردن لەخۆی و لەخاکی نیشتمانی خۆی, بارودۆخی ئەو ڕۆژانەو هەڵوێستی دەوڵەتان گەیشتبووە قۆناغێك کە کورد بەئاسانی نەیدەتوانی شۆڕشێکی‌وا بەرپا بکات کە بتوانێت دوژمن ناچاربکات واز لەو نەخشە جەهەنەمییەی خۆی بێنێت کە بۆ نەمان و لەناوبردنی کورد دەمێك بوو نەخشەی کێشابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر کۆڵی نەداو شۆڕشی ئاگریداغ هەڵگیرسا ئەگەرچی بەداخەوە سەرەنجامی ئەمیش وەکو هی شۆڕشەکانی‌تر وابوو, باشترین سەرچاوەیەك کەباسی ڕەفتارو دڕندەیەتی تورك و هەڵوێستی کاربەدەستانی

تـوركی كردبێـت بەرامبـەر بـەكورد بريتييـە لەسـەرنجی چـەند نووسـەرێكی بێگانـە كـە (سـريا بـدرخان) لەپاشـكۆی كتێبەكەيـدا سەرچـاوە/ ٧٩ ئـەو سـەرنجانەی بڵاوكردۆتـەوەو ئێمـەش لێـرەدا سـەرنجی ئـەو نووسـەرانە وەرەگێڕين بۆ كوردی بۆئەوەی خوێنەری بەڕێز باشتر ئاگاداری دڕندەيەتی توركە كماليەكان بێتو باشتر لەمەڵە زلەكانی ميللەتەكەی خۆی تێ بگات.

لەلاپـەڕە(٦٩)ی كتێبەكـەی سورە يابدرخانـدا سەرچاوە/٧٩ ئـەو باسـەی بڵاوكردۆتـەوە كـە لەلايـەن (Harry.a.framk) لـە ٢ی نـوڤمبری ١٩٢٧دا بـلاوی كردۆتـەوە دەربـارەی سياسـەتی حكومـەتی توركيـا بەرامبـەر بـە كـورد كـە وتوويەتی:

((لەم ڕۆژانەدا لەو گەشتەی بۆ توركيام كردبوو گەڕامەوە, بەڵام بەداخەوە گەشـتەكەم تـەواو نـەكردبوو چـونكە كاربەدەسـتانی تـورك ڕێگـەی ئـەوەيان لێگرتم بچم بۆ (ئەرزروم).

لەكاتێكـدا بـەر لەئيسـتە بـەناو (٦٠)وڵاتـدا گـەڕابووم لـەهيچ لايـەكيان ڕێگەی هاتوچۆم لێ نەگيرابوو ساتێك هـۆی ئـەو ڕێگرتنـەم لەكاربەدەسـتانی تورك پرسی هۆی چيە ڕێگە بەبێگانە نادرێت بچێتە ئەو ناوچانە لەوەرامدا بەئاشكرا پێيان ووتم نەك هـەر لـەتۆ بـەڵكو ڕێگـە بـەهيچ بێگانەيـەكی تـريش نادرێت بچێتە ئەو ناوچانە.

ساتێك ويستم بچم بۆ (خربوط)و (دياربكر)و (قارص) بۆ ئـەو شـوێنانەش هـەمان وەرامـيان دامـەوە چـونكە ئـەو ناوچانە لەلايـەن حكومـەتی توركيـاوە بەناوچــە داخراوەكــانی وڵات دەژمێــررێنو نــابێ بێگانــە بۆيــان بچــێتو لەدواييدا ئەو ئەمريكاييانەی ماوەيەكی زۆرە لەتوركيادا دەژينو قسەكانيان جێگـەی بڕوايـە هـۆی ئـەو ڕێگرتنـەيان بـۆ ڕوون كردمـەوە. سـەير ئەوەيـە,

لەگەرمەی شەڕی جیهانیدا, لەولاَتانی ڕۆژئاوادا مەگەر تەنها شوێنی کۆڕی شەڕەکان ڕێگەی هاتوچۆیان بگیرایە, بەلاَم والێرە لەتورکیا کوردەکان تووشی کارەسات دەبن کەچی ڕێگەی بێگانە لەهاتوچۆکەران دەگیرێت...

تورکەکان بەوە ناسراون زۆر دڕندەن و پێویستیان بەوە هەیە یەکێك جڵەویان بگرێتە دەست و ڕێگەی ئەو دڕندەیەتیەیان لێ بگرێت.

بێجگە لەکورد, گەلێك یۆنانی و ئەرمەنی و کریستیانەکانی تر لەتورکیادا تووشی کارەسات و ئەشکەنجەو لەناوچوون هاتوون تەنها لەبەرئەوەی باوەڕیان بەئاینەکەی خۆیان هەبوە, بەلاَم وا لەدوای ئەو کریستیانانە نۆرەش هاتۆتە سەر کوردەکان کە بەزۆری وایان لێ دەکەن کلاَوی نیشتمانی خۆیان داکەنن و بەزۆرەملی کلاَوی ئەورووپییان پێ لەسەر دەکەن.

هەندێجار تەنها هەر لەبەرئەوەی پارێزگاری هێشتن و مانەوەی هەندێ لە کەلەپووری باووباپیرانی خۆیان دەگرن ئەم پارێزگاریکردنەیان تووشی ئەشکەنجەو کوشتن و ئاوارەکردن دەبن و هەموو ماڵ و موڵکیان لێ زەوت دەکرێت سەیریش ئەوەیە ئەگەر کورد پارێزگاری لەو مافە ڕەوایەی خۆی بکات ئەمەی بەیاخی بون و دژایەتیکردنی حکومەتی کمالیان لەسەر حساب دەکەن.

ئێمە زۆرجار لەدەرەوەی تورکیادا هەواڵی کوشتاری یۆنانیەکان و ئەرمەنیەکانمان دەبیستەوەو هەواڵەکانیان دەگەیشتە دەرەوە چونکە دۆستی وایان هەبوو ئەو ڕووداوو کارەساتانەیان دەگەیاند بەولاَتانی دەرەوەو هەندێ جار لەئەنجامیا پروپاگەندەیەکی زۆریش دژی تورك دەکرابەلاَم کورد ئەو جۆرە دۆستانەی نەبوەو نیەتی کە دەنگ و هاواریان

بگەنێتە دەرەوە بۆیە هەمیشە دەنگو هاواری کوردەکان بەئاسانی لەلایەن تورکەکانەوە کپوخامۆش دەکراو کەس پێی نەدەزانی.

زوربەی ئەرمەنی خاکی ولآتی خۆیان بەجیٚ هێشتووە لەناو تورکیاداو ئەو مسینیرە کەمانەش کە ماونەتەوە تەنها ڕێگەی ئەوەیان هەیە لەقوتابخانەکاندا هەر ئەو دەرسانە بڵێنەوە کە لەقوتابخانە تورکیەکانا دەوترێتەوەو بۆ وتنەوەی هەر دەرسێکی تریش پێویستە حکومەت پێشەکی ئەو دەرسانە پەسەند بکاتو ڕێگەش بەهیچ تورکێك نادرێت فێری دەرسەکانی ئەو مسینیرانە ببێت.

حکومەتی تورکیا فەرمانی دەرکردووە کە پێویستە منداڵە ئەمریکاییەکان لەناوچەکی وەکو (طوروس)دا پێویستە لەسەریان ڕۆژانی یەکشەممەش هەر دەبیٚ دەوامی قوتابخانە بکەنو لەجیاتی انجیل دەبوایە قورئانیشیان فێربکرایە (ئەوسا هێشتا تورکیا وەکو ئەمڕۆ ڕۆژی یەکشەموو نەکرابوو بەڕۆژی پشوودان لەجیاتی ڕۆژی هەینیو ئیمڕۆ خوێندنی قورئانیش لەقوتابخانەکانا قەدەغە کراوە).

نووسەر ئەڵیٚ: لەڕاستیدا ئەم هەڵوێستەی تورك تەنها لەبەر دڵسۆزی نەبوە بۆ ئاینی ئیسلام بەڵکو بۆ ئەوە بووە ئەو منداڵانە ناچاربکرێن زمانی تورکی فێربن.

ئەو خەستەخانانەی مسینیرەکان بەڕێوەیان دەبردن جاریٚ هێشتا ماون بەلآم دەبیٚ هەموویان بەفەرمانی کاربەدەستانی تورك بڕۆن بەڕێوەو مووچەی کارگوزارەکانی ئەو خەستەخانانەش دەبوایە هەر لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە دەستنیشان بکرایە.

له (ئانا دۆل)دا تاقه دەزگایەکی میسینری ئافرەتانی تێدایەو ساتێك هەوڵدرا ئەندامێکی تازە بخرێتە سەر دەستەی بەڕێوەبەری ئەو دەزگایە حکومەت بەهیچ جۆرێك رێگەی ئەوەی نەداو ساتێك هەر یەکێك لەو میسینرانە بیویستایە بچێتە دەرەوە دەبوایە هەرچی ماڵ و موڵکی هەبوو دەسکاری نەکردایەو بەجێی بهێشتایە کە ئەمەش بۆ ئەوە بوو ئەوانە نەچنە دەرەوە نەوەکو هەواڵ و دەنگ‌وباسی ناوچەکەیان بگەیەنن بەدەرەوەو بەفەرمانی مستەفا کەمال پاشا خەستەخانەی ئەمریکاییەکان لە (Marsivam) داخرا چونکە سیخوڕێکی تورك ڕاپۆرتێکی دەربارەی قسەیەکی بەڕێوەبەری خەستەخانەکەی بەحکومەت گەیاندبوو کە وتبووی دیموکراتیەت بەهەڵواسینی خەڵك و بەدکتاتۆریەت سەرناگرێت.

پەنجا پرۆفیسۆری ئەمریکی لەقوتابخانەی میسینرەکانا هەڵواسران چونکە هەندە فۆتۆگراف لەقوتابخانەکەدا بینرابوو کە تاقمێك فتبولیانکردبوو, کراسەکانیان شین و سپی بوو کە ئەو دوو ڕەنگە ڕەنگی ئالأی یۆنان بوو لەکاتێکدا ئالأی تورکیش بەسەریانەوە هەر هەڵواسرابوو.

نووسەر لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێت:

وەکو چۆن میسینیرەکان ناچاردەکران تورکیا بەجێ بێڵن, بەو شێوەیە بازرگانەکانیش نەیان دەتوانی بەپێی پێڕەوو بڕیارەکانی حکوومەت کاروباری خۆیان ببەن بەڕێوەو ژیانی خۆیان مسۆگەر بکەن بۆیە ئەوانیش ناچاردەبوون تورکیا بەجێ بێڵن.

یەکێك لەکۆمپانیا گەورەکانیان کەهی توتنە سیٚجار کەل‌وپەلی خۆیان پێچایەوە بۆ ئەوەی لە ئەستەمبوڵەوە بگوێزنەوە بۆ یۆنان بەلأم هەموو

جارێك ڕێگەیان لێ دەگیراو بۆ دواجار كە لێپرسراوی كۆمپانیاكەم بینی هێشتا هەر بەئومێدی ئەوە بوو ڕێگەی ڕۆیشتنو دەربازبوونی پێ بدرێت.

نووسەری ئەو باسە بەدوورو درێژی باسی ئەوەی كردووە كە مستەفا كەمال بەناوی پێشكەوتنخوازیەوە هەرچییەكی كردبوو بۆ دانیشتوان هەمووی بێ سوود بوو, هەموو چالاكی‌یەكانی كاربەدەستانی حكومەت بریتی بوو لەپروپاگاندە كردن بۆ (غازی مستەفا كەمال) و بیریان لەخەڵكی برسیو دواكەوتووی وڵات نەدەكردەوە..)

سریا بدرخان لەكتێبەكەیدا لەلاپەڕە (٧٣)یدا چەند برگەیەكی لەو كتێبە بلاوكردۆتەوە كە لەلایەن (G.Bie Rovmdal) لەساڵی ١٩٢٦دا لەلایەن قونسوڵی‌تەی ئەمریكاوە لە ئەستەمبوڵ چاپكراوە لەوەدا دەربارەی توركیا وتراوە:

١- ژمارەی توركیا ئیمڕۆ لە(٧,٥)ملیۆن تێپەڕناكات كە ساڵانە (٩٠)ملیۆن دۆلار بۆ ئەو ژمارەیە تەرخان دەكرێت.

٢- ئەو قەرزانەی لەسەر توركیا كۆبۆتەوە بریتییە لە(٧٩١,٩٨٥,٨٧٧)دۆلار حكومەتی توركیا پێشنیازی كردوە بایی (٥٨٦)ملیۆن موڵكی حكومەت بفرۆشرێت بۆ ئەوەی بەشێكی ئەو قەرزەی پێ بداتەوە.

٣- لەكاتی خۆیدا ئەوانەی لە بازرگانیدا كاریان دەكردو خەریكی هێنانو بردنی كەل‌وپەلی بازرگانی بوون لە(٦٦٪)یان یۆنانی و ئەرمەنی بوون, كە زوربەی ئەوانە دەركران باری ئابووری ووڵات تەواو شلۆق بوو خۆشیان نەیان دەزانی چۆن چارەسەری ئەو كێشەیە بكەن.

لێرەدا ئالەم بارودۆخەی ئەو ڕۆژانەی تورکیادا لەجیاتی ئەوەی کەمالیەکان کاروباری وڵات چارەسەر بکەن، هەرچی لەتوانایاندا بوو تەرخانیانکردبوو بۆ کڕینی چەك و زۆرکردنی ژمارەی سەربازو جەندرمەو پاش شۆڕشەکەی پیران کوردیان ناچارکرد دوو شۆڕشی تریش بەرپا بکات دژی حکومەت بۆ ئەوەی واز لەو ڕەفتارە درندەییەی خۆی بێنێت و دەسبەرداری ئەو نەخشەیە بێت کە بۆ لەناوبردنی کوردو کاولکردنی کوردستانی ئامادەکردبوو.

دوای ئەو چەند یاداشتە، سورەیا بدرخان لەلاپەڕە(٧٥)ی کتێبەکەیدا کورتە باسێکی گەشتێکی گەریدەیەکی ئاوسترياسی کردووە کە لە٢٨ی دیسەمبری ١٩٢٨دا چووە بۆ تورکیاو لەو یاداشتەیدا بەدوورو درێژ باسی دواکەوتنی باری ئابوریی تورکیای کردووە کە بێگومان چ کوشتاری ئەرمەنی و چ دەرکردنی یۆنانی چ ئەو زنجیرە شۆڕشانەی کورد کە بەناچاری دژی تورکی کەمالی کردبووی هەموویان هۆی سەرەکی بوون بۆ ئەوەو نووسەر لەکۆتایی گەشتەکەیدا وتوویەتی:

(کەمالیستەکان بەهیوای ئەوەن لەماوەی (٢٥)ساڵدا باری وڵات بەتەواوی بگۆڕن کە دڵنیام ئەو بۆچوونەیان شتێکی زۆر دوورە بەم عەقڵیەتەی هەیانە بەو ئاواتەی خۆیان ناگەن..

خەڵك لەوپەڕی برسێتی و کەساسیدایە، کاروباری بازرگانی ڕاوەستاوە، پیشەسازی لەپلەیەکی زۆر نزمدایە.. خەڵك بێ پارەو پوولەو حکومەتیش موفلیسەو ئەوروپاییەکان هەروەکو جاران قەرزیان نادەنێ).

***باسی دوهەم***

## هۆی هەڵبژاردنی ناوچەی ئارارات بۆ شۆڕشێکی تازە..

لەبەرگی یەکەمدا لەبەشی جوگرافیای باکوری کوردستاندا باسی چیای ئارارات کراوە کە بەچیای (ئاگری) بەناوبانگەو بەرزترین چیایە لەباکوری کوردستانداو لای ئەرمەنیەکان بەشوێنێکی زۆر پیرۆز دەژمێررێت کە پێی دەڵێن (ماسیس).

چیای ئارارات دەکرێت بەدوو بەشەوە, ئاراراتی گەورەو ئاراراتی بچووك‌و بەپێی بۆچوونی دکتۆر (ولید الأعظمي) سەرچاوە (٢٣) بەرزترین لووتکەی چیای ئاراراتی گەورە بریتییە لە(٥١٦٨) مەترو بەرزترین لووتکەی ئاراراتی بچووك (٣٩١٤)مەترە بەڵام دکتۆر عبدالرحمن قاسملو لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (١٦) بەرزترین لووتکەی چیای ئاراراتی بە (٥٢٢٦)مەترو کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) بەرزترین لووتکەی ئاراراتی گەورەی بە(٥١٧٥)و هی ئاراراتی بچووکی بە(٣٩٩٦)مەتر داناوە بەڵام (منذر الموصلي) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٢٥) بەرزترین لووتکەی ئاراراتی گەورەو بچووکی هەروەك‌و ئەوەی (ولید الأعظمي) داناوە کە دیارە سەرچاوەی هەردوکیان هەر یەکێکە.

احسـان نـوری کـه سـەرکردەی شۆڕشـی ئـارارات بـووە لەکتێبەکەیـدا سەرچاوە(٦١) لەباسی ناوچەی ئاراراتدا وتوویەتی:

((لای کریسـتانەکان وایـە کەشـتی نـوح لەسـەر چـیای ئـارارات گیرساوەتەوەو ئاشـوریەکان بـە(ئورارتـو)و عبرییـەکان بـە (ئـارارات)و (هـیرۆدوت)ی یۆنـانی بـە(ئـالارد) ناویـان بـردووەو هـەروەکو وتمـان ئەرمەنیەکان بەئاراراتیان وتووە (مارسیس)و وەکو احسان نوری باسی کردووە بۆ یەکەم جار ناوی (ئورارتو) لەسەر تاشەبەردێك نوسراوە کە لەلایەن (شلما نصر)ی پاشای ئاشورییەکان لەساڵی ١٢٦٠ی پێش زایین نوسـراوەو مێژوونووسـی بـەناوبانگ (مورگـان) وتوویـەتی دەوڵـەتی ئارارات دوو هەزار ساڵ پێش زایین هـەبووەو بەپێی کتێبەکەی (مورگان) ئەو دەوڵەتەی پێی وتراوە (کاردوکیا) وەیا (توسباس) کە پایتەختی دەوڵەتی ئورارتوی کورد بوە.

لەسـالأنی (٨٢٥-٨٠٠)ی پـێش زاینـدا پادشـای ئـاگری نـاوی (منئاش)بوە کە بریتییە لەهەمان ئەو (مناش چفا)یەی کە لەئاوێستادا ناوی هاتووەو لەشانامەی فردوسیدا بە (منوچك) ناوی هاتوە.

(هـیرودوت)ی مێژوناسـی یونـانی لەکتێبەکەیـدا باسـی عەشـیرەتی (ئالاروت)ی کردووە کە عەشیرەتێکی بت پەرست بون لەناوچەی (نـاین)دا کە دەسەلأتی ئەم عەشیرەتە گەیشتبوە روباری (ئاراس) کە ئەم ناوچەیە بەشوێنی طائفەی (ئاریزانت)ی (میدی)ش بوەو وادیارە ووشەی ئارارات لەناوی ئەو طائفەیەوە هاتووە.

منـذر الموصـلي لەکتێبەکەیـدا سەرچـاوە (٢٥) وتوویـەتی: چـیای ئارارات سنورێکی خۆڕسکی نێوان تورکیاو ئێرانەو لەخاکی ڕوسیاشیان

جیا دەکاتەوەو بەشی زۆروی ئەم چیایە بەسەر دەشتی(ئاراس)دا دەڕوانێت و ئەو بەفرەی لەم چیایە دەتوێتەوە بەو دەشتانەدا دەڕوات و کاتی خۆی ئەم شاخانە پڕلەدارستانی چڕوپڕ بوە بەلأم ئیستە هەمووی ڕووتە جگە لەناوچەکانی ناوەڕاستی کە هاوین بەهۆی توانەوەی بەفر گژوگیاو بنچکی لێ سەوز دەبێت و باشترین لەوەڕگا پێك دەهێنێت بۆ مەڕو مالأت و ئاژەڵ.

صادق شرفکندی لەلاپەڕە(١٤٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە(١٧٠) هۆی هەڵبژاردنی چیای ئارارات بۆ بەرپاکردنی شۆڕش تیایا بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

((هەڵبژاردنی چیای ئارارات بۆ شۆڕش لەبەر ئەوە بووە لەڕوی جوگرافیەوە شوێنێکی ئێجگار باش و لەبار بووە بۆ شۆڕش و دراوسێی ئەرمەنستانیش بووە کە بەر لەمە لەساڵی ١٩٢٠دا ئەرمەنیەکان لەلایەن تورکەکانەوە لەشوێنی خۆیان هەڵکەنرابوون، بەلأم هەمیشە ئەو شوێنەی لێی دەرکرابوون لەدڵ و مێشکیانا هەرمابوو، لەولاشەوە ئەم ناوچەیە کەوتووەتە سەر سنووری ئێران کە بەشێك لەئاراراتی بچووك دەچێتە ناو خاکی ئێرانەوە.

ئەو ڕۆژانەی کە کورد بڕیاری شۆڕشی دابوو لەئارارات، شاری (تەورێز) مەڵبەندێکی سەرەکی ((داشناق)ە ئەرمەنەکان بوو، لەوێوە بەئاسانی دەتوانرا چەك و تەقەمەنی بگەیەنرێتە شۆڕشگێڕەکان و، ئینگلیزەکانیش لەو ڕۆژانەدا یارمەتی ڕەزا شایان دابوو بۆیە هەتا ڕادەیەك هەڵوێستی شای ئێران بەرامبەر داشناقەکان خراپ نەبوو، هەر لەبەر هەمان هۆش بوو کە ڕەزا

شا پەیوەندی بەکوردەکانیشەوە هەبوو، بۆیە چ ڕاستەوخۆ چ لەڕێگەی داشناقەکانەوە بەڵێنی یارمەتی بەبزوتنەوەکەی (ئارارات) دابوو)).

لەباسەکانی داهاتوودا ڕوون دەبێتەوە کەپشت بەستن بەبێگانەیەك کەخۆی دوژمنی کوردی ڕۆژهەڵات بووبێت شتێکی زۆر کورت بینانە بوەو دەردەکەوێ چۆن لەکاتی شۆڕشەکەدا هێزەکانی ڕەزا شا دژی کورد وەستان و بون بەلایەنگری تورکەکان.

### باسی سێ‌هەم

## خۆیبون

١- هۆی دروستبونی خۆیبون و چۆنێتی دروستبوونی

٢- ئەندامە چالاکەکانی خۆیبون و چالاکیەسیاسیەکانی خۆیبون

**یەکەم: هۆی دروستبوونی خۆیبون‌و چۆنێتی دروستبوونی:**

**لـەدوای شۆڕشـی پـیران‌و گـرتن‌و لەسـێدارەدانی زۆربـەی شۆڕشـگێڕان‌و ئەنـدامانی (ئـازادی) ڕۆشـنبیرانی کـورد لەوانـەش کـە بەشـدارییان نـەکردبوو لەشۆڕشی پیراندا بۆ ئەوەی لەجەورو سـتەمی تـورك دووربکەونـەوە بەشـێکی زۆریـــان ڕوویـــانکردە دەرەوەی وڵات‌و هەنـــدێکیان بـــۆ ئـــەوروپاو ئـــەمریکاو هەندێکیشیان ڕوویانکردە سوریا کە لەو ڕۆژانەدا لەژێر سایەی فرنسیەکاندا بوو، لەسـەرەتادا فرنسـیەکان بۆ ماوەیـەك ڕێگـەیان لـە چالاکیەسیاسیەکانی ئەوانەیان نەگرتبوو کـە ڕوویانکردبوە سـوریاو لوبنـان‌و لـەوێ وەکو لەدوایـدا باسـی دەکـەین توانیبویـان لەهاوینـە هـەواری (محمـدون) یەکـەم کۆبونـەوەی (خویبون) بکەن.**

دەربارەی چۆنیتی دروستبوونە(خویبون)و هۆی دروستبوونیو کۆبونەوەکانی هەندێ سەرچاوە لێی دواونو هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو سەرچاوانە باس بکەین.

قدری جمیل بەگ (زنار سلوپی) لەلاپەڕە (١٣١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) لەباسی چونیتی پێکهاتنی خویبونو هۆی پێکهاتنی وتوویەتی:

((دوای شۆڕشی پیرانو ئەو جەورو ستەمە زۆرەی تورکەکان بەرامبەر کورد دەیان نواند کوردی ناچارکرد بیر لەپێکهێنانی ڕێکخراوێکی گشتی سیاسی کورد بکاتەوەو بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخراوی (کورد تەشکیلاتی اجتماعیە جمعیتی) دوا کۆبونەوەی خۆی لەخانویەکدا کەناوی ((ئەحوالی مەدەنی عوسمانی)بوو بەستو لەو کۆبونەوەیەدا بڕیاردرا ئەو ئەندامانەی لەئەستەمبولدا بون ئەویَ بەجیَ بێڵن چونکە لە ئەستەمبول ماوەی هیچ جۆرە چالاکیەکیان نەبوو, ڕێگەی ئەوەیان نەبوو هیچ جۆرە جموجووڵو چالاکییەك بکەن, بەڵام هەندێ لەئەندامانی ئەو ڕێکخراوە لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی خۆیان نەیانتوانی ئەستەمبوڵ بەجیَ بێڵن.

هەر لەو سەردەمەدا حزبی (کورد میللەت فرقەسی) کە هاوکار بوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا لەگەڵ ڕێکخراوەکانی تردا نزیك بووەو کۆمەڵی (بووژانەوەی کوردستان-کە لەوەرگێڕانی کتێبەکەی (زنار سلوپی)دا بۆ عەرەبی بە (بعث کردستان)ناوی بردووەو ئەم کۆمەڵە کە ماوەیەك بوو چالاکییەکانی خۆی وەستاندبوو, بەڵام لەگەڵ ئەوانەی تردا هەموویان بڕیاریاندا هەموو ڕێکخراوەکان خۆیان هەڵوەشێننەوەو حزبێکی تازەی یەکگرتوو لەهەمووان پێك بهێنرێت.

ئەسـکەندەر بـەگ کـە کـاتی خـۆی ئەنـدامو نوێنـەری حزبـی (شـعبی کـوردی)بـوو پـاش دامرکانـەوەی شۆڕشـی پـیران چاوی بـە (محمـد شـوکری سەگڤان) و (احسان نوری)و هەندێ لـەهاوڕێکانی تـری کـەوت وەکـو ملازمـی یەکـەم (راسـم بـەگی خـەڵکی وان) و ملازمـی یەکـەم (خورشـید خـەڵکی خرطوتە) لەگەڵ هەندێك لەکوردەکانی تری باشووری کوردستانو هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە پێویستە بایەخ بدرێت بە دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ ئەو بارودۆخە سەختەی ئەو ڕۆژانەی کورد, بەڵام لەسـەرەتادا نەگەیشـتنە ئەوەی لە چ ڕێگەیەکەوە بچن بۆ ئـەو مەبەستە, پاش ئەمە ئەسکەندەر بەگ پەیوەندییەکی بەهێزی لەگـەڵ (علـی رضـا ئەفەنـدی کـوڕی شـێخ سـەعیدی پـیران) پەیـدا کـردوو بـۆی دەرکـەوت ئـەمیش لایـەنگری پێکهێنـانی کۆنگرەیـەکی گشـتی نەتەوایـەتی بـوو, شـەریف پاشـای خەنـدانیش کـە لـەپاریس بـوو ئاگـادارکرا لـەنیازی پێکهێنـانی ئـەو کۆنگرەیـە بـۆ ئـەوەی کوردەکانی ئەوروپا بەهەموویان چالاکییەکی سیاسی دەست پێ بکەن.

دوای ئـەوەی ئەسـکەندەر بـەگ بـۆی ڕوون بـوەوە زۆربـەی کوردەکـان بەپەرۆشـن بـۆ پێکهێنـانی ئـەو کۆنگرەیـە ئیتر کەوتنـە سـەر بیرکردنـەوە لەچـۆنێتی بەسـتنی ئـەو کۆنگرەیـەو دەستنیشـانکردنی شـوێنێك بـۆ بەستنی کۆنگرەکەو هەموویان بۆیان دەرکەوتبوو ئەگەر بەدەستو بردی شـتێك نـەکرێت ئـەوا تورکـەکان زۆری پـێ ناچـێت کـوردیش بـەدەردی ئەرمەنـەکان دەبـەنو نوێنـەری ئەرمـەنیش لەگـەڵ بیروبۆچـونی کوردەکانـا لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتن کـە ئـیتر پێویسـتە ئەرمەنیـەکانیش پڕوپاگەنـدەکانی خۆیـان دژی کـورد واز لێ بێنـن.و لەکۆبونەوەیەکـدا بڕیاردرا پێویستە ئەرمەنـەکان هاوکارولایـەنگری هـەموو جۆرە چالاکیو

بزوتنەوەیەکی کوردبن چ لەئەوروپاو چ لەئەمریکاشداو لەو کۆبونەوەیەدا ئەرمەنیەکان بەڵێنی ئەوەشیان دا جۆرە پەیوەندییەك سازبکەن لەگەڵ کوردە ئاوارەبووکانی دەرەوەی وولاتو واز لەو داخوازییە سەرنەگرتووەی جارانیش بێنن کە داوای دروستکردنی ئەرمەنیای گەورەیان دەکرد(لەباسی کێشەی سیڤەردا بەدووردرێژی باسی ئەوەمان کردووە چۆن بەپێی مادەکانی سیڤەر هەندێ لەناوچە کورد نشینەکان خرابوونە ناو چوارچێوەو سنووری ئەو ئەرمەنیایەی نیاز بوو بەپێی سیڤەر پێك بهێنرێت کە ئەمە هۆیەکی زۆر گرنگ بوو تورکەکان کردیان بەبیانو، توانیان ژمارەیەك لە کوردەکان بکەن بەلایەنگری خۆیان دژی ئەو بڕیارە کە کورد لەمەدا زیانێکی زۆری پێ گەیشت).

بەپێی کتێبەکەی زنار سلوپی بڕیاردرا لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٧دا بەسەرکردایەتی محمد شوکری صگبان لەدواییدا لەترسی تورکەکان رایکردوو خۆی گەیاندە عێراق بەلاَم زۆری پێ نەچوو لەوێ وزەی بەرداو لەو کوردایەتیە خەستو توندوتیژییەوە دەستیکرد بەڵاوکردنەوەی گەلێك قسەی بێ سەروبەر دژی بزوتنەوەکانی کورد بەئومێدی ئەوەی تورکەکان وازی لێ دێنن و لێی خۆش دەبن و رێگەی پێ ئەدەن بگەڕێتەوە بۆ تورکیا.

لەنامیلکەیەکیدا کەلەپاریس بەزمانی فەرەنسی لەساڵی ١٩٣٣دا بەناوی (کورد مسئلەسی)یەوە بلاَوی کردبووەوە هێرشێکی زۆریشی کردبووە سەر شۆڕشەکانی کوردو صلاح الدینی ئەیوبیشی بەڕەگەز بردبووەوە سەر

طـورانیـەکان‌و بـەپێچ‌و دەورە لەنامیلکەکەیـدا داوای لـەکورد کردبـوو واز لەکوردایەتی بهێنێت‌و خۆی لەبۆتەی تورکدا بتوێنێتەوە.

دەربارەی ئـەو هەڵوێستە ناپیرۆزانـەی محمـد شـوکری صـگبان, مامۆسـتا رفیـق حلمـی بـۆ پەرچـدانەوەی درۆو دەلەسـەکانی‌و بـۆ ڕیسـواکردنی, لەڕۆژنامـەی (الأیـام)ی عربیـدا لەسـاڵی ١٩٥٤ بەچـەند زنجیرەیـەك وەرامـی محمـد شـوکری صـگبانی داوەتـەوەو لەدوایـدا ئـەو زنجیرانـەی لـە(الأیـام)دا بـڵاوی کردبـووەوە کردبـووی بەنامیلکەیـەك لـەژێر نـاوی (مقـالات)و لـەو نامیلکەیەدا بەتایبەتی لەلاپەڕە (٢٤)یدا شـوکری صـگبانی کـردووە بـە دوو شوکری صـگبان, یەکەمیان بریتـی بـووە لـەو کـوردەی وەکـو شۆڕشگێڕێکی سەرگەرم کوردایەتی کردووەو ئەوەی دوهەمیان ئەو شوکری صەگبانەیە کە ورەی بەرداوەو کورد ووتەنی وەکو ڕێوی لەکونەکەی خۆی هەڵگەڕابووەوە).

دەربارەی ئەوانەی کە بەشدارییان کردبوو لە(خۆیبـون)دا, سـریا بدرخان لەکتێبەکەیـدا کـە لەفلادلفیابـە ئینگلیـزی بـڵاوی کردۆتـەوە, سەرچاوە(٧٩) لـەوەدا پێشـەکیەکی تیادایـە بـە پێنوسـی (Perlinde) لەمـەدا نـاوی هەنـدێ لەئەندامانی دامەزرێنەری خۆیبونی باسکردووە وەکو: ممـدوح سـلیم, محمـد شوکری صـگبان (کە لەهەندێ سەرچاوەدا بە صـگڤان نـاوی هـاتووە), مـولان زادە رفعت, احسـان نـوری پاشـا, ئـەوانی تـریش بریتـی بـوون لـە بنەماڵـەی بدرخان وەکو سریا بدرخان, خلیل رامز (نوسەر وتوویەتی مامی سریا بوە- بەپێی ئەمە بێ برای ئەمین عالی بدرخان بووە) لەگەڵ براکانی تـری سریا کـە بریتی بوون لە جلادت‌و کامەران.

لەکتێبەکەی ئـەمین زەکـی بەگدا سەرچاوە (٣٢) نجم الـدین کـوری محمـد علی عونی وەکو لەپێشەکیەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە وتوویەتی (محمد علی

عونی)ی ناوکو [illegible] ...ەرینەری حزبی خۆیبون لەقاهرەو سوریەو ناوچەکانی تری کوردستاندا لەگەڵ بنەماڵەی بدرخانیەکان و تێکۆشەرەکانی تری کوردا چالاکی [illegible]

دوکتور عبدالستار طاهر شریف لەلاپەڕە( [illegible] )ی کتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٠) دەربارەی چۆنێتی پێکهاتنی خۆیبون وتوویەتی:

((لەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٣٧دا لەهاوینەهەواری (بحمدون) لەلوبنان یەکەم کۆبونەوە لەلایەن ئامادەبوانەوە کرا بۆ پێکهێنانی حزبێکی نەتەوەیی یەکگرتووی کوردو لەو حزبەدا چوار ڕێکخراوی کورد تیایا بەشداری کرد کە بریتی بوون لە:

١- ڕێکخراوی پێشکەوتنی کوردستان (کۆمەڵی تعالی کوردستان)

٢- ڕێکخراوی کوردستان (صادق شرفکندی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٧١)بە (حزبی میللەتی کورد) ناوی بردووە).

٣- ڕێکخراوی نەتەوەیی کورد.

٤- کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد

لەئەنجامدا بەشداربوانی ڕێکخراوەکان و ئەوانەیتر کە ئامادەبوون هەموو یەکیان گرت و ڕێکخراوێکی یەکگرتوویان سازکرد بەناوی (خویبون)ەوە کە مانای سەربەخۆیی دەگرتەوەو بڕیاردرا بزوتنەوەی خۆیبون لەلایەن لیژنەیەکی هەمیشەییەوە ببرێت بەڕێوە کە بارەگاکەی هەتا ساڵی ١٩٢٨ لەحلب بوو، بەڵام دوای ئەوە ئەندامەکانی لەترسی استعماری فەرەنسی خۆیان شاردەوە.

بەپێی بۆچونی سەرچاوە (٤٠)جلادت بدرخان سەرۆکی ئەم کۆمەڵە بوە (جلادت بدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٦٠) باسی ئەوەی نەکردووە کەخۆی سەرکردەی خۆیبون بووبێت).

(لەباسی یەکەمی بەشی سێهەمی بەرگی دوهەمدا لەباسی بنەماڵە ناسراوە چالاکەکانی باکوری کوردستانا باسی چالاکیی جلادت بدرخانمان کردووە بۆیە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

دوکتور کەمال مەزهەر لەگۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا ژمارە ١٤١ی ساڵی ١٩٩٨ لەلاپەڕە ٤ی دا باسی خۆیبون و چەند ئەندامێکی ئەو حزبەی بەم جۆرەی خوارەوە کردووە:

((دوکیومینتەکانی وەزارەتی فرۆکەوانی حکومەتی بەریتانیا پەنجا جار ناوی (حاجو ئاغای هڤرکی)یان هێناوە کە سەردارێکی هۆزی هڤرکی بووە کە هۆزێك بوە لەناوچەی (طور عابدین) لەکوردستانی تورکیادا.

وەکو لەو باسەی دوکتور کەمالدا دەردەکەوێت تورکمانەکان فشارێکی زۆریان خستۆتە سەری و ناچاریان کردووە پەنا بباتە بەر سوریاو لەناوچەی (قبور البیض توریاسی)ی سەر بە(قامشلی) نیشتەجێ بووەو یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی خۆیبون کە حاجۆ ئاغا سێهەمین ناوی ئەو هەشت ڕابەرانەی خۆیبون بوو کە لەگەڵ (هاڤان پاپا زیان)ی نوێنەری بەناوبانگی داشناق ڕێککەوتن و بەهەموویان نامەیەکیان مۆرکرد کە ناوی ئەو هەشت ڕابەرە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١-شێخ علی رضا ئەفەندی (مەبەستی علی رضای کوڕی شێخ سعیدی پیرانە کە لەباسی شۆڕشی پیراندا ناوی هاتووە).

٢-مصطفى شاهين بەگی بەرازی (لەباسی سێهەمی بەشی شەشەمدا وێنەیەکی بلاوکراوەتەوە).

٣-حاجو ئاغای هەڤیرکی

٤-ئەمین ئاغای سەرۆکی هۆزی (رامان)

٥-کریم روستەمی خەلکی سلێمانی

٦-ممدوح سلیم

٧-جلادت عالی بدرخان

٨-دوکتۆر شوکری صگڤان

حاجۆ ئاغا هەموو ماڵو سامانی خۆی بۆ ئەو شۆڕشە تەرخانکردبوو بەپێی ئەو دوکیومینتانەی وەزارەتی فرۆکەوانێتی حکومەتی بەریتانیا باسی دوو نامەی حاجو ئاغای تیادا کراوە کە ناردویەتی بۆ شێخ احمد.(لام وایە مەبەستی شێخ احمدی بارزانی بێت) وە بۆ ئاغاکانی (مدیات) لەباکوری کوردستان (سەرچاوەی دوکتۆر کەمال بۆ ئەم باسە بریتی‌یە لە دوکیومینتی ژمارە (ibid.i.m.13a لەرۆژانی (٨ و ٢٤/ ١٩٣٠/٨). هەروەکو لەو باسەدا وتراوە, ساتێك تورکەکان فشاریان خستۆتە سەر حاجو ئاغاو ناچاریانکردبوو ڕووبکاتە سوریا تەنها تاقە کوڕێکی مابوەوە کە ناوی (نایف) بوە تورکەکان دەیگرنو لەدیاربەکر لەسێدارەی دەدەن.



ئەندامانی خۆیبوون لەکۆبونەوەی (بحمدون)دا

دوکتۆر کەمال مەزهەر لەباسێکی تریدا لەگۆڤاری (ڕەنگین)ی بغدادی ژمارە ۰۸۷)ی ساڵی ۱۹۹٦دا لەلاپەڕەی شەشدا باسی دوکیومێنتێکی کردووە کە لەبەشی شەشەمی فایلی ژمارە (۲۳-۱٤۱٦)ی وەزارەتی فڕۆکەوانێتی بەریتانیادا ڕاپۆرتێکی تیادایە کە لەڕۆژی (۱۹۳۰/۲/۲٦)دا لە (موصل)ەوە نێرراوە کە لەوەدا وتراوە.

(نیشانە بە/ ئای م/٤۲ب: بۆ

ئەرکانی هێزی ئاسمانی (استخبارات) بنکەی هێزی ئاسمانی، سەرکردایەتی عێراق بنکەی (هنێدی) وە وێنەیەکی ئەو ڕاپۆرتەش نێرراوە بۆ سەرپەرشتیکەری پۆلیسی موصل و بۆسەرپۆلی ژمارە (۳۰)ی فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی سەربەهێزی ئاسمانی ملکی بەریتانی لەموصل:

بابەت: دەربارەی بزوتنەوەی کوردایەتی کۆمەڵەی (خۆیبون) :

ئەمەی خوارەوە بریتییە لەنمونەی ئەو سوێند-خواردنەی دەبوایە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بیخۆن:

(بەشەرەف و بەئاینم سوێند دەخۆم لەڕۆژی مۆرکردنی ئەم بەڵێنەوە هەتا ماوەی دوو ساڵ چەك دژی هیچ کوردێك بەکارناهێنم مەگەر ئەو کوردە خۆی هێرش بهێنێتە سەر ژیان و ناموسم وەیا بۆسەر ژیان و نامووسی ئەوانەی بەپێی ئیلتیزاماتی خێزانی یا نەتەوەییەوە من لێیان بەرپرسیارم.

هەروەها لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا دەست لەهەموو تۆڵەسەندنەوەیەکی خوێن و هەموو جۆرە دوو بەرەکییەکی‌تر هەڵدەگرم و گشت توانای خۆم بۆ بەربەستکردنی خوێن ڕشتن تەرخان دەکەم کە لەنێوان هەر دوو کوردێکدا لەسەر ناکۆکی تایبەتیی خۆیان ڕووبدات و هەر کوردێك بەپێچەوانەی ئەم

بەڵێنــە ڕەفتــار بکــات بــەخائینی نەتــەوە دائــەنرێت و کوشــتنی هــەموو خائینێکیش کارێکی پێویستە).

دوهەم: چالاکیەسیاسیەکانی خۆیبون و ئەندامەکانی خۆیبون:

لەدوای ئەوەی کۆمەڵی، یا حزبی (خۆیبون) پێکهات ئەندامە چالاکەکانی هەریەکـەیان بـەپێی توانـاو لێهـاتوویی خـۆی دەسـتی کـرد بەچـالاکی کـە بەرلەدەستپێکردنی شۆڕش نواندنی چالاکی سیاسی یەکێك بوو لەکاروبارە گرنگـەکانی شـۆڕش کـە سـەرکردایەتی خۆیبـون بایـەخی پێدابوو کـە سریا بدرخان یـەکێك بـووە لـەو ئەندامـە چالاکانەی بەپێی بڕیـاری خۆیبـون بـۆی دانرابـوو بچـێتە ئـەو شـوێنانەی کـە پێویسـتە دانیشـتوانی ئـەو وڵاتانـە لەکێشەی کوردو لەتاوانبارێتی تورك بەرامبەر بەکورد ئاگاداربکرێن.

لەپێشـەکییەکی کتێبەکـەی سـریا بدرخانـدا، سەرچـاوە(٧٩)بەپێنوسـی (perlinde) باسێکی تیایە دەربارەی ئەو چالاکیە سیاسـی‌یەی سریا بدرخان کە وتوویەتی:

((هەرچـەند خۆیبـون لەلایـەن کوردەکانـەوە پێکهـاتبوو بـەڵام یارمـەتیدانی ئەرمەنیـەکانیش بـۆ هاوکـاریکردن لەگـەڵ کـوردا لەچالاکییەکانی خۆیبونـدا کـارێکی زۆر گـرنگ‌و بەسـوود بـوو، وەڕۆڵێکـی زۆر باشـی هـەبوو بـۆ ئـەوەی خۆیبـوون بتوانێـت پەیوەنـدی بـەزۆر شـوێنی جیهانـەوە بکـات بەتایبـەتی لەگــەڵ کــوردە ئاوارەکــانی ئــەمریکاو فەرەنســادا. تــوانرا ئــەو کوردانــەش لە(ئەنطاکیە)دا بون کە لەو ڕۆژانەدا لەژێر سایەو دەسـەڵاتی فەرەنسـەدا بـون لەگەڵ شۆڕشدا لەیەکتر نزیـك بکرێنـەوەو بەهۆی تەقەلای (سریا بدرخان) و (مـولان زادە) خۆیبـون تـوانی پەیوەندییـەکی بـەهێز لەگـەڵ ئەرمەنیـەکانا سازبکات‌و پێوەندیش بەشریف پاشای خندانیشەوە کرا کە لەپاریس بوو

بۆ ئەوەی ئەویش چالاکی خۆی بنوێنێت و لەڕاستیشدا توانی بیروبۆچوونی ئەرمەنیەکان بەرامبەر کورد بگۆڕێت و لەئەمریکادا دەستیکرد بەنوسین و بلاوکردنەوەی مقالات و چاپکردنی نامیلکەو کتێب لە(فلادلفیا) و لەو کتێبەیدا کە بلاوی کردەوە لەساڵی _١٩٢٨ دا بەناوی (the case ofkurdistan Against turkey) لەوەدا بەدوورودرێژ باسی دڕندەیەتی و ڕەفتاری تورکەکانی ڕوونکردنەوە بەرامبەر بە کوردو یونان و سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی تورکی خستۆتەبەرچاو.

دەربارەی ئەو چوونەی سریا بدرخان کە(perlinde) ئاماژەی بۆ کردووە لەدوکیومنتیکی ناو ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی بریتانیادا ژمارە (fo.371-13826) ڕۆژی (١٩٢٩/٤/١٨) نامەیەکی قونسولی بریتانیای تیادایە ژمارە (no.21) کە لە(دترونیەوە) ناردویەتی دەربارەی چالاکی سریا بدرخان کە ئەمە کورتەکەیەتی دەربارەی ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبوە:

((لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەو گوڕەشانەی تورکەکان دەیکەن, بەلام ڕوشنبیرانی کورد لەدەرەوەی ولاتەکەیان لەچالاکی خۆیان نەکەوتون کە یەکێك لەو ڕۆشنبیرانە (سریا بدرخان)ە کە زەعیمێکی کوردی خەڵکی ناوچەی بۆتانە (جزيرة ابن عمر)وا لەئەمریکا چالاکییەکی زۆر دەنوێنێت و بۆ باسی کوردو ڕونکردنەوەی کێشەی کورد هەوڵ و کۆشش دەکات و جەورو ستەم و تاوانەکانی کورد ئاشکرا دەکاو ڕوونیان دەکاتەوە. دوکیومنیتەکە لەسەری ئەرواو دەڵێت:

لەڕۆژی ١٩٢٩/٤/١٨دا سریا هاتە (دترویت) و لەوێوە چوو بۆ فەرەنسا کە هاوڕێیەکی ئەرمەنیشی لەگەڵدا بوو ناوی (گریگور وارتانیان-

ڤارتانیـان)بـوو کــه نوێنــەری وەفــدی ئەرمەنیــەکان بــوو خــەڵکی شــاری (یەریڤان)ە.

لەدوترویت نزیکی (١٠تا ١٢هەزار) کوردی لێیەو لەوانە پارە کۆکرایەوەو ئەرمەنیەکانیش کە ئیستە لایەنگری کوردن ئەوانیش پارەیان بۆ کۆکردەوەو نزیکەی (٥٠ تا ٦٠هەزار) دۆلارێك کۆکرایەوە (نەوتراوە ئەو ژمارەیە چۆن‌و کــەی گەیشــتونەتە ئــەمریکا) بەرلــەوەی ئــەمریکا بــەجێبێڵێت‌و ڕوبکاتــە فەرەنســە نامەیــەکی بلاوکــردەوە بــۆ ڕەئــی گشــتی لەئــەمریکادا دەربــارەی تاوانەکانی تورك.

ســریا کــە لەئــەوروپاوە هــاتبوو بــۆ ئــەمریکا لەلایــەن (موســولینی)یــەوە دەعوەت کرابوو, پازدە ڕۆژ لای ئەو مابووەوە بەئومێدی ئەوەوی موسولونی یارمــەتی کــورد بــدات‌و لەگەڕانەوەشــیدا لەئــەمریکاوە بــۆ ئــەوروپا وەزیــری دەرەوەی یۆنــانیش ٠ڤنزیلــوس) سـریای دەعوەتکردبــوو بــۆ (ئــەثینــە) بــەلام کاربەدەســتانی بــەریتانیا لەموصــل ڕێگــەیان بــە ســریا نــەدا,لقێکــی خویبــون لــەوێ بکاتــەوە, بــەڵکو فەرەنســیەکان لــە(حلــب) ڕێگــەیان پێــدا (بنکەیــەك- مکتبیك) بکاتەوە.

رووسە سوڤیتەکان زۆر مەبەستیان بوو پیوەندی بەخویبونەوە بکەن‌و بۆ ئــەو مەبەســتە نوێنــەری ســۆڤیەت لەویلایــەتی متحــدە داوای لەسریا کردبوو بەرلەوەی ئەمریکا بەجێ بێڵێت سەرێك لەویش بدات.

دوکیومنتیەکە لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

((سریا لەگەشتەکەی ئەوروپایدا وای ڕادەگەیانـد کـە کـورد لەتوانایدایە (١٥)هــەزار چــەکدار ئامادەبکــات لــەژێر ســـەرکردایەتی ئەفســـەرە کــوردە خانەنشینەکانا کە پلەی هەندێك لەو ئەفسەرانە لەسوپادا گەیشتبووە ڕادەی

جنرال‌و بلاوی ده‌كرده‌وه كورد ته‌نها پێویستی به‌چه‌ك‌و جبه‌خانه هه‌یه‌و سریا له‌زۆر شوێندا ئه‌و نامه‌و به‌ڵگه‌و دوكیومنیتانه‌ی پیشانی خه‌ڵك ئه‌دا كه هه‌موویان نیشانه‌ی ئه‌وه بوون توركه‌كان خۆیان ئاماده‌كردبوو بۆ له‌ناوبردنی كورد بۆیه داوای له‌له‌نده‌ن‌و پاریس ده‌كرد فریای كورد بكه‌ون)).

ده‌رباره‌ی ئه‌و باسه‌ی له‌و دوكیومنیته‌دا بلاوكراوه‌ته‌وه, دوكتور كه‌مال مه‌زهه‌ر له‌گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ‌دا, ژماره(١٤١)ی ساڵی ١٩٩٨ ئاماژه‌ی بۆ ڕاپۆرتێكی تر كردووه كه فایلی ژماره (٢٣-٤١٥-٨٨٠×٤٥٨٣)دا پارێزراوه ده‌رباره‌ی بزوتنه‌وه‌ی كورد له‌نێوان ١٩٢٩/٤/١٨ هه‌تا كانونی یه‌كه‌می ١٩٢٩ (لام وایه مه‌به‌ست ئه‌و ماوه‌یه بوه كه سریا بدرخان له‌چالاكیدا بووه له ئه‌وروپاو ئه‌مریكا), به‌پێی ئه‌و دوكیومینته‌ی دوكتۆر كمال ئاماژه‌ی بۆ كردووه, كاربه‌ده‌ستانی ئینگلیز كه‌وتبوونه سوراخی ئه‌و زانیاریه گرنگانه‌ی (جون كامیرون)ی قونسولی به‌ریتانیا له (دترویت) بۆ (چمبرلن)ی وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی به‌ریتانیای ناردووه‌و ئه‌م كاربه‌ده‌سته‌ی ئینگلیز په‌رێشانی ئه‌وه بووه بزانێت هۆی بایه‌خدانی سۆڤێت به خۆیبون چی بووه‌و ده‌ستیانكرد به‌وه‌ی بزانن ئاخۆ ئه‌و (ڤارتانیان)ه‌ی له‌دوكیومینتی قونسولی بریتانیادا له (دترویت) باسكراوه كێ بووه‌و چی كردووه (به‌ر له‌مه ئاماژه‌مان بۆ ناوه‌ڕۆكی ئه‌و دوكیومینته‌ی قونسولی بریتانیا كردوه له دترویت).

زۆری پێ ناچێت ئینگلیزه‌كان له‌فایله‌كانی خۆیاندا له بغداد زانیارییه‌كی به‌نرخ ده‌رباره‌ی ڤارتانیان ده‌دۆزنه‌وه‌و یه‌كسه‌ر سكرتێری باڵیۆزخانه‌ی به‌ریتانیا له‌به‌غداد كه كابتن (ڤیڤان مولت) بووه هێزی

ئاسمـانی بـەریتانیا لـە بغـداد ئاگـادار دەكـاتو پێـی دەڵێـت ئـەو نـاوی (ڤارتانیـان)ە نـاوێكی نەهێنییـەو بەپێی زانیارییـەكانی نـاو فایلـەكان كـاتی خۆی لـە شـوباتی ساڵی ١٩٩٢دا ملحقی سەربازی بەریتانیا لـە تاران پێـی ڕاگەیانـدبوین (مەبەسـت لەباڵیوزخانـەی بـەریتانیا لـە بەغـداد) كـە وەزیـری مفـەوەزی ئەوسـای یـەكێتی سـۆڤیەت لـەئێران وەكیلێكـی ئەرمـەنی بـەناوی (وایـز مبیكـوڤ)ەو نـاردبوو بـۆ بەغـداد كـە نـاوە ڕاستیەكەی (ڤارتانیـان یـا ڤارتانوڤ) بوە, بەسەروسیماو بەقسەكردنیا لەتورك دەچێتو تـەنها هـەر ئەو زانیاریەمان لایە كە لەدەوروبەری ساڵی ١٩٢٢دا كاری بۆ (ڕوتشین) دەكرد كە ئەمە ڕاست لەگەڵ ڕاپۆرتەكەی دترویدا دەگونجێت.

(إمزا – هولت)

دوكتور كەمال لەباسەكەیدا وتوویەتی: كار هەر تەنها بەوەوە نەوەستا بـەڵكو بـەدوای ئەمـەدا (سـیر گلبـەرت كلایتـون)ی منـدوبی سـامی وەلأمنامەیەكی تێروتەسـەل دەنێرێت بۆ وەزیـری مستعمرات لەلەنـدەنو جگە لەباسی ڤارتانیان باسی پەیوەندی سۆڤیەتو خۆیبون دەكاتو بێ پێچو پـەنا سـەغڵەت بـوونی بـەرزترین دەزگـاو كاربەدەسـتی ئینگلیـز دەخاتە پێش چاو, لەنامەكەیدا وتوویەتی:

((لەبارەی نوێنەری باڵاوە – بغداد ڕۆژی ١٩٢٩/٦/٧

١–شـەرەفمەند دەبم بـۆ نامـەی نـەهێنی ڕۆژی ١٩٢٩/٥/٦ تـان كـە ڕاپۆرتی قونسـوڵخانەی بـەریتانیا لـە دترویـت دەربـارەی چـالاكیەكانی سریا بدرخانو ڤارتانیانی لەوڵاتە یەكگرتووەكانی پێ ڕاگەیاندوین.

٢–لـەدوای نـاردنی تلگرافـی ژمـارە(٢١٣) كـە ڕۆژی ١٩٢٩/٥/٧ نـاردبووم, لـەدوای پشـكنینی فایلـەكانی ئەرشـیفی بارەگـا(مەبەسـتی

دائیرەی مەندوبی سامی‌یە) ئەوەمان بۆ ساغ بوەتەوە لەساڵی ١٩٢٢دا (ڤارتانیان) وەکیلی (م.روتشین)ی وەزیری مفەوەزی ئەوسای یەکێتی سۆڤیت بوە لەتاران و ئەمە بۆمان ئاشکرا دەکات بەڵشەویکان لەنزیکەوە پێوەندییان بەکۆمەڵی خۆیبوونەوە هەیەو لەوانەیە سۆڤیتەکان بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بۆ مەبەستی خۆیان بەکاربهێنن.

٣-بەپێویستم زانی دەزگای تحقیقاتی جنائی (کە ئینگلیزەکان لەو رۆژانەدا هەر خۆیان دەیانبرد بەڕێوە) ئاگاداربکەم لەناوەڕۆکی ئەو نامەو راپۆرتەی ناردبووتان و ئەوا منیش لەو ڕووەوە هەر زانیارییەکمان دەسکەوێت یەکسەر ئاگادارتان دەکەم.

٤-دائیرەی تحقیقاتی جنائی داوای وێنەیەکی سریابدرخان و ڤارتانیان دەکەن بۆ ئەوەی وێنەکەیان یارمەتیمان بدەن بۆ دۆزینەوەیان.

دەربارەی ئەم باسە, هەروەکو دوکتور کەمال ئاماژەی بۆ کردووە, لەدوکیومینتیکی تردا ژمارە(No:g.o.960) ڕۆژی ١٩٢٩/٩/١١ باسی ئەوە کراوە کە دەزگاکانی بەریتانیا لەلەندەن بەوەیان زانیوە کە سریا بدرخان و ڤارتانیان دەیانەوێ بچن بۆ عێراق بۆ ئەوەی لەوێوە بچن بۆ ئێران و هندستان و بەرامبەر بەوەزیری مستعمرات ڕۆژی ١٩٢٩/٥/٦ (گلبەرت)ی مندوبی سامی ئاگادار دەکات و ئەویش لە ١٩٢٩/٥/٢١دا داوا لەوەزیری مستعمرات دەکات بەهیچ شێوەیەك لەهیچ بالیوزخانەو کونسولخانەیەکی بریتانیادا لەهیچ شوێنێك ڤیزەی هاتن بە سریا بدرخان و ڤارتانیان نەدرێت بێن بۆ عێراق وەفەرمانێکی تایبەتیش دەرچێت بۆ ئەوەی ئاگاداری سنووربن نەوەکو بەقاچاخ و بەبێ ڤیزە خۆیان بکەن بەناو خاکی عێراقدا.

دوكيومينتەكـە دەچێتە سـەر باسـی جموجـوڵی سـریابدرخان كەچۆن چـوبوو بـۆ بـیروت و لـەوێ ڕۆژی ١٩٢٩/٧/٨ داوای ڤیـزە دەكـات لـە قونسـولخانەی بریتانیـا كـە نـاوی ئـەو قونسـولەی بیروت (هـ.سـاتو)بـوەو قونسولیش نامەیەك دەنێرێت بۆ مندوبی سامی لە بەریتانیا لەبغدادو بۆی دەنوسـێت: ئیمـڕۆ سـەرلەبەیانی سـریابدرخان هاتـە لام و پێـی وتم ئـەو لەمیصرەوە لەكاتی شەڕی جیهانیدا تۆ دەناسێت و نامەیـەكی بەفەرەنسـیش بۆخۆت نوسیوە لەسێ لاپـەڕەی گـەورەدا كـە ڕۆژی ٣٠/حزیـران نوسـیویەتی وا بۆ خۆتانی دەنێرم.

وەكـو لـە دوكیومینتەكـەدا باسـكراوە سـریا بـدرخان لـەو نامەیـەی بـۆ منـدوبی سـامی نـاردبوو پوختـەی مەسـەلەی كـوردو مێـژووی كـوردی هێناوەتـەوە یـادیو داوای یارمەتیـدانی حكومـەتی بـەریتانیای كـردووە بـۆ كورد بۆ ئەوەی كوردیش وەكو میللـەتانی تـری ناوچەكە بتوانێت لەجەورو ستەمی تـورك ڕزگـاری ببێت(دیـارە نامەكـەی سـریا بدرخان فەرەنسـی بـووە بۆیە دوكتور كەمال مەزهەر لەپـەراوێزی لاپـەڕە (٩)ی گۆڤارەكـەدا وتوویـەتی (سـینەم خـانم)ی بـرازای سـریا بـدرخان (مەبەسـتی سینەم خـانمی كچـی جلادت بدرخانە) ئەو نامەیەی بۆ وەرگێڕام.

سریابدرخان لەو نامەیەدا باسی دامەزراندنی (خویبون)و ئامانجەكانیو شێوازی كاركردنی بۆ مندوبی سامی باسكردووەو داوای لێكردووە ڕێگـەی بدرێتێ بچێت بۆ عێراق.

لەوەرامی ئەمـەدا منـدوبی سامی (گیلبـەرت كلایتون) ڕۆژی ١٩٢٩/٧/١٧ لەنامەكەیـدا بەئاشـكرا پـەردە لەسـەر ڕووی ڕاستی سیاسـتی حكومـەتی

بـەریتانیا لائـەداو بەنامەیـەك ژمـارە س.و.١٤٢٧ ڕۆژی ١٩٢٩/٧/١٧ بـۆ (ساتۆ)ی قونسوڵی بەریتانیا لەبیروت دەنوسێت و پێی دەڵێت:

نیشـانە بەتەلـەگرافی ژمـارە(٧٥/س) ڕۆژی ١٩٢٩/٧/١٧دا وێنـەی ئـەو نامەیـەت بـۆ دەنێـرم کـە باسـی چالاکیەکانی ئـەم دواییـەی سـریا بـدرخان دەکات کە بەئاشـکرا دەردەکەوێ چۆن هاتنی ئـەم پیاوە بـۆ عێـراق کارێکی زۆر نابەجێیەو بەحاڵ دێتەوە بیرم من ئەم کابرایەم لەکاتی جەنگدا دیوە کە ئـەمیش یـەکێك بـووە لـەو باڵنـدە شـوومە بـێ شـومارانە کـە لـەکاتی خۆیـدا دەزگـای ئیسـتخبارات پێوەنـدی پێـوە دەکـردن, بـەڵام لـەم بارودۆخـەی ئێسـتەداو لەبـەرخاتری ئامـانج پلانـە ئاشـکراکانی ئـەو (مەبەسـت سـریا بدرخان)ە نامـەوێ هیچـیتر دەربـارەی کـارە تایبەتیـەکانی وەربگـرم کـە تـا ڕادەیەك پیاو بێزار دەکەن.

هەروەکو دوکتور کمال باسیکردووە, مندوبی سامی ئەو باڵندە شوومەی بە (Stormy Petral) ناوبردووە, لەڕاستیدا ئینگلیزەکان ئەمەیان هەر بە سریا بـدرخان نـەوتووە, بـەڵکو هـەروەکو لەلاپـەڕەکانی (١٧ و ٢١)ی گۆڤـاری ڕۆشنبیری نوێی ژمارە (١٣٦)ی ساڵی ١٩٩٥ هـەمان شتیان بەشێخ احمدی بارزانیش وتووە.

نامەکـەی منـدوبی سـامی بـۆ قونسـوڵی بریتانیـا لـەبیروت لەسـەری ڕۆیشتوەو وتوویەتی:

(نـازانم ئـەوەی سـریا بـدرخان باسـیان دەکـات دەربـارەی ڕادەی خۆئامادەکردنی کورد هەتا چ ڕادەیەك ڕاستەو لەگەڵ ڕاستیدا دەگونجێن کە لام وایە زیادە ڕوییان تیادا بەدی دەکرێت و ئەوەی ئەو دەیـەوێ قەناعـەتمان پێ بکات تورکەکان زۆر لەوە زاڵترن بەسەر بارودۆخەکەداو هیوادارم وابێت

(مەبەست ئەوەیە بڵێ هیواداره زاڵ بوونی تورکەکان ڕاست تر بێت)، چونکە هەرچۆنێك بێت هەرجۆرە ڕاپەڕینێك ئەو ڕاپەڕینەی بەو شێوازەی ئەو بۆی دەچەپێت تەنها دەبێتە مایەی کارەسات و گۆبەند لەگشت لایەك بۆیە پێویستە بەری لێ بگیرێت (یەعنی ڕێگە بەبزوتنەوەی کورد نەدرێت).

إمزا / کلاتیوف

دەربارەی ئەم هەڵوێستەی مندوبی سامی بریتانیا کە کاربەدەستێکی گەورەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە، ئەمە یەکەم هەڵوێستی ئاشکرای بەریتانیا نییە بەرامبەر بە کورد، بەڵکو وەکو چۆن هەڵوێستی بەریتانیامان لەشۆڕشی پیراندا بەرامبەر کورد شیکردەوە، لەباسی هەڵوێستی دەوڵەتاندا بەرامبەر بە شۆڕشی ئاگریداغ دەچنە سەر باسی هەڵوێستەکانی تری بەریتانیا بەرامبەر بە کورد.

## باسی چوارەم

### پێوەندیو هاوکاریکردنی کوردو ئەرمەنی لەخۆیبووندا

لـەدوای ئـەو تەقـەلا سـەرنەگرتووەی کۆمـەڵی ئـازادی کـە نیـازوابوە سـەرکردایەتی شۆڕشـی پـیران بکـات وەکـو لەباسـی شۆڕشـی پیرانـدا ڕوون بۆتەوە پاش گرتنـی خالد بەگ جبرانو یوسف ضیاء بەگ, ئەو شۆڕشەی نەخشـەی بـۆ کێشـرابوو لەنـەورۆزی سـاڵی ١٩٢٥دا, ئـیتر سـەرکردایەتیو ڕێبەرایـەتی ئـەو شۆڕشـە کەوتـە دەسـت شێخو ئاغاو دەرەبەگـەکانو لەگـەڵ ئەوەشدا زۆربـەیان بەوپـەڕی پاکیو دڵسـۆزیەوە خۆیـان بـەختکرد لـەپێناوی کوردو کوردستانداو هەتا دوا هەناسەیان نە لەبەردەمی دادگاکانی تورکداو نە لەبەردەمی پەتی قەنارەدا لەدەربڕینی هەستی پاکی خۆیان بەولاوە ملیان بـۆ کاربەدەسـتانی تـورك کـەچ نـەکردوو لـەو خـەباتکردنو خۆبەکوشتدانەی بڕیاریـان لەسـەردابوو پەشـیمان نەبونـەوە, بـەڵام بەداخـەوە نەشـارەزاییان لەکاروباری شۆڕشگێڕیو لەشکرکێشیداو نەبوونی نەخشەیەکی ڕێكو پێك بۆ شۆڕش کارێکی وایانکرد شۆڕشـەکە لەماوەیەکی کەمدا تێکبشـکێنرێت, لەبەرئەمـە ئـەو تاقیکردنەوەیـەی شۆڕشـی پـیران ئەوەنـدە تـاڵو سـەخت بـوو کـوردی ناچـارکرد بـیر لـەپێکهێنانی حزبێکـی یـەکگرتووی ڕێـكو پێـك

بکاتەوەو نەخشەی ئەوەی کێشا سەرکردایەتیەکی تایبەتی بۆ کاروباری شۆڕش پێك بێت لەگەڵ سەرکردایەتییەکی تری تایبەت بەکاروباری بەجێهێنانی ئەو نەخشەیەی کە بڕیاردرا بهێنرێتە دی , بەو جۆرە (خۆیبون) پێکهێنراو لەڕێکخراوی ئەم جارەدا حسابێکی وردتر بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی تازە کرا ئەگەرچی بەداخەوە ئەنجامی ئەمیش لەکۆتاییدا هەروەکو ئەوەی شۆڕشی پیرانی بەسەرهات لەبەر ئەو هۆیانەی لەکۆتایی باسی ئەم شۆڕشەدا دەیخەینە پێش چاو.

شۆڕشگێڕانی ئاگریداغ بۆ ئەوەی دەرس لە کەمو کوڕییەکانی شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکانی پێشوو وەربگرن هەوڵی دوو شتیان دا, یەکەم تەقەلایەکی زۆریاندا شۆڕشەکە بکەن بە شۆڕشێکی جەماوەری بەربڵاو نەك شۆڕشێکی ناوچەیی وەکو ئەوانەی (مەلاطیە و کوجیگری و درسیم‌و پیران),و هەوڵیشیاندا یارمەتی‌و هاوکاری‌یان لەلایەن ئەوانەوە دەستگیر ببێت کە ئەوانیش وەکو کورد گیرۆدەی جەورو ستەم‌و دڕندەیەتی تورکەکان بوبوون کە باشترین نمونەیان بریتی بوون لە ئەرمەنیەکان کە جارەها لەلایەن چ تورکی عوسمانی‌و چ لەلایەن کمالیەکانەوە کوشتاریان لێ کرابوو, کە لەڕاستیدا دەبوایە لەمێژ بوایە هەردوو میللەتی کوردو ئەرمەنی هاوکاری یەکتر بوونایە بەتایبەتی لەو ڕۆژانەی کە هەردوکیان هاودەرد بوون‌و دەبوایە ئەو تەبایی‌و هاوکاریکردنەی هەردوولا لەکاتی داڕشتنی پەیمانی سیڤەردا بیری لێ بکرایەتەوەو ئەرمەنیەکان خۆیان نەخستایە گێژاوی ئەو خەیاڵ پڵاوەی دەیان ویست ئەرمەنیای گەورە پێك بێنن بەجۆرێك کە بەشێکی زۆری ناوچە کورد نشینەکانی باکووری کوردستان بخەنە ناو چوارچێوەی ئەو سنوورەی بڕیاردەرەکانی سیڤەر لەژوور هەموویانەوە

بەریتانیا نەخشەی ئەو بارە ناڕێکەیان نەکێشایە کە نەکوردو نە ئەرمەنی هیچیان سوودیان لەسیڤەر وەرنەگرتوو, تورك لەهەردوکیان زۆرتر دەسکەوتی لێ دەستگیر بوو هەرچۆنێك بووبێت تازە کارلەکار ترازابوو, تورکەکان ئەرمەنیەکانیان قەڵاچۆ کردبوو ئەوی ڕزگاریشی بوبوو ئاوارەو دەربەدەر کرابوو, کارگەیشتبووە ڕادەیەك وەختێك داواکرا شوێنێك تەرخان بکرێت بۆ ئەرمەنیەکان لەناو خاکی تورکیادا, نوێنەری ئینگلیز لەوەرامی ئەو داخوازیەدا بێ پێچ و پەنا وتبوی: کوا ئەرمەنی لەتورکیادا ماوە هەتا شوێنێکیان بۆ تەرخان بکرێت؟!

چ کوردو چ ئەرمەنی, لەکاتی تەقەلادانی دروستبوونی خۆیبوندا, هەردوکیان تازە بیریان لەوە کردەوە کە پێکەوە هاوکاری بکەن دوای ئەوەی ئەرمەنیەکان مایە پووچ دەرچووبوون لەتەقەلاکانی پێشویانا و حکومەتە بێگانەکانیش دەستیان بڕیبوون و بەهیچ شێوەیەك لایان لێ نەدەکردنەوەو کار گەیشتبوو بەوەی ئەرمەنیەکانی سۆڤێتیش وایان لێ هاتبوو تەقەلاکانی ئەرمەنیەکان بەسەرکردایەتی ئەرمەنیە قەومیەکان کە (داشناق)بون بەبزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانەی سەر بە ئیمپریالزمیان لەقەڵەم دەدان لەکاتێکدا ئەو ئیمپریالزمەی ئەوان باسیان دەکرد کە لەبەریتانیادا ڕوون دەبووەوە, کاروباری بەرژەوەندیەکانی خۆی لەگەڵ تورکەکانا مسۆگەر کردبوو,و لەلایەکەوە تورکەکانیان لەدۆستایەتی سۆڤیەت دورخستبووەوەو لەلایەکی تریشەوە پاش مۆرکردنی پەیمانی لۆزان تورکیایان ناچار کردبوو ئیتر بیرلەداواکردنەوەی ویلایەتی موصل نەکاتەوە..

ئا لەم بارودۆخە تازەدا کوردو ئەرمەنی ناچاربوون ناکۆکیە کۆنەکانی خۆیان بخەنە لاوەو ئەوەی نەیانتوانیبوو لەو ڕێککەوتنەی شریف پاشاو نوبار بوغوص پاشادا بیهێننەدی بڕیاریاندا لەکۆمەڵی خۆیبوندا لەسەر بناغەیەکی تازە لاپەڕەیەکی دۆستایەتیو هاوکاری بکەنەوە دەربارەی تەقەلادانو چۆنێتی دەستپێکردنی هاوکاری کوردو ئەرمەن لەخۆیبوندا سریا بدرخان لەلاپەڕە/٥٠ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٧٩ وتوویەتی:

((یەکەم کاری خۆیبون ئەوە بوو تەقەلایەکی بێ ووچان بدات بۆ پێکهێنانی دۆستایەتیو هاوکاریکردنی کورد لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا.

من(مەبەست سریا بدرخان)ە کە لەم کتێبەدا (مەبەست سەرچاوە ٧٩) دەربارەی پەیوەندیی کوردو ئەرمەنی دەدوێم, لەلایەکەوە هەست بە خەمو خەفەت دەکەمو لەلایەکی تریشەوە هەست بەوە دەکەم کە هەندێك ئیشی چاك کراوە.

ساتێك تورکەکان دەستیان بەئەشکەنجەو سزادانو کوشتاری ئەرمەنیەکان کردو بەوپەڕی دڕندەیەتیو بێ بەزەییانە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکردن ئەوە ئەوپەڕی خەمو پەژارەی ئێمەی تیابوو, بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ ئەرمەنیەکانا لەڕووداوو بەسەرهاتەکانمان لەیەکتر خۆشبووین ئیتر ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی خۆشیو شادمانیمان بوو بۆ سارێژکردنی زامە کۆنەکانمان.

لەماوەی سێ هەزار ساڵدا کوردو ئەرمەنی هاوسێی یەکتر بوونو لەو هەموو ماوە دورو درێژەدا هەتاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم, هەردولایان پەیوەندییان باشبوو لەگەڵ یەکترداو ڕێزیان لەیەکتر دەگرتو فولکلورەکانی کوردی پڕن لەدەربڕینی هەستی دڵسۆزیو

خۆشەویستی بەرامبەر بەدراوسێکانی لەکاتێکدا ئەو فولکلورانە پڕن لەگلەیی‌و نارەزاییی‌و دەربڕینی بێزاری بەرامبەر بە تورکەکان‌و لەگەڵ عەرەب‌و فارسەکانیشدا ئەگەر پەیوەندییەك هەبووبێت نەگەیشتبووە رادەی ئەو دۆستایەتیەی لەنێوان کوردو ئەرمەنیدا هەبووەو ناوی ئەرمەنی لەلای کورد بەهیچ شێوەیەك بەخراپە ناونەبراوە.

بەداخەوە ئەوەی لەنێوان کوردو ئەرمەنیدا ڕوویدا لەپەیمانی (پاریس)ی سالّی (١٨٦٥)ەوە دەستی پێکرد کە تورکەکان(مەبەستی عوسمانیە) دەستی کردبوو بەهاندانی کوردو چرکس دژی ئەرمەنی بۆ ئەوەی ئاگری دوژمنایەتی نێوانیان خۆش بکات (سریا بدرخان) لەباسی چرکسیەکانا وتوویەتی:

ئەمانە بەرەگەز ئارین‌و شوێنی هەرە کۆنیان لەنێوان ژووری سنوری جورجیاو ڕوسیادا بوەو لەپاش شەری (قرم) سالّی ١٨٦٥ ژمارەیەکی زۆریان ئاوارەکران بۆ تورکیاو هاتنە سەر ئاینی ئیسلام‌و بەناو ولاتی عوسمانیدا بلاّوبوونەوە کە ژمارەیان (١٥٠)هەزار کەسێك دەبوو, هەموویان مرۆڤی ئازاو ڕەوشت بەرزن.

(لەڕاستیدا ئەوەی کە سریا بدرخان باسیکردووە کە گوایا ناکۆکی کوردو ئەرمەنی بەهۆی تورکەوە بوە, بریتییە لەنیوەی ڕاستی باسەکە, نیوەکەی تری بریتییە لەرۆڵی میسنیرەکان کە ولاّتانی ڕۆژئاوا بەناوی پارێزگاریکردن لەئاینی کریستیانەکانەوەدەیان ناردن بۆ ناوچە کوردنشینەکان‌و کریستیان نشینەکان‌و هەتا هاتنی ئەوان دەستی پێنەکردبوو کورد لەگەڵ کریستیانەکانی هاوسێیدا تووشی هیچ گێرەو کێشەو ناکۆکیەك نەبووبوو بەلاّم لەدوایدا هەردوو هۆکە یەکیان گرت‌و بوون

به بەلاّ بەسەر کوردو کریستیانەکانیشەوە هەروەکو لەبەرگی یەکەمدا لەزۆر شوێندا ئەم ڕاستیە ڕوون بۆتەوە بەتایبەتی لەباسی دەوڵەتەکەی بدرخان پاشادا).

سریا بدرخان دەربارەی ڕۆڵی تورکەکان بۆ تێکدانی نێوان کوردو ئەرمەنی وتوویەتی:

(کورد هیچ سودێکی لەدوژمنایەتیکردنی ئەرمەنی دەستگیر نەبوو، تورکەکان بەو تێکدانەی نێوان هەردوولا لەلایەکەوە ویستیان ئەرمەنیەکان لاواز بکەن و لەلایەکی تریشەوە ویستیان ناوی کورد لای دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بزڕێنن، بۆیە ساتێك بیر لەپێکهێنانی خۆیبون کرایەوە دەرسیان لەبەسەرهاتەکانی پێشوو وەرگرت و هەردوو لایان دانیان بەهەڵەکانی خۆیانا ناو کوردو ئەرمەنی لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دوژمنی سەرەکی هەردولا تەنها بریتییە لە ڕژێمی تورك و لاپەڕەیەکی تازەی مێژوییان کردەوە بۆ قۆناغەکانی داهاتوو).

دەربارەی هاوکاریکردنی کوردو ئەرمەنی لەسەردەمی خۆیبووندا، زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٤١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) باسی ئەوەی کردووە کە کورد لەو ڕۆژانەدا پێویستییەکی زۆری بەدۆستایەتی و هاوکاریکردنی ئەرمەنی هەبووە، چونکە کورد وەکو ئەرمەنیەکان ئەو توانایەی نەبوو دەنگی بێزاری خۆی و باسی هۆی شۆڕشەکەی خۆیبون بگەیەنێت بەولاّتان و لەلایەکی تریشەوە هەوڵدرا ڕێگە نەدرێت جارێکی تر کێشەیەکی تری لەو جۆرە پەیدا ببێتەوە لەنێوان هەردولایانا کە لەکاتی پەیمانی سیڤەردا ڕوویدابوو.

لەلاپــەڕە (٣٢٣) هــەتا (٣٢٧)ی بــەرگی یەکــەمی کتێبەکــەی شــێخ مــەحمودی قارەمــان‌و دەوڵەتەکــەی خــواروی کوردســتان, سەرچــاوە (٨٠)کورتــە باســێکی پەیوەنــدی کــوردو ئەرمــەنیم باسکردووە, لێــرەدا بەپێویستم زانی ئەوەی پەیوەندی بەم باسەوە هەیەو بۆ ڕونکردنەوەی بارو هەڵوێستی کوردو ئەرمەنی پێویست بێت لێرەدا دوبارەی بکەمەوە:

(کورد لەکۆنەوە پەیوەندی بەدەوڵەتی ئەرمەنیەوە هەبووە ئەگەرچی لەکوردستانی تورکیاو ئێراندا عوسمانیەکان‌و شاکانی ئێران هەمیشە هەوڵیانــداوە هەســتی ئــاینی ئیســلام لــەناو کــوردا دژی ئەرمەنیــە کریستیانەکان بۆخۆیان بەکاربێنن‌و ڕووسی قەیسەریش ساڵەهای ساڵ هەوڵی ئەوەیان داوە هەستی ئاینی کریستیان لەناو ئەرمەنیەکانا دژی کورد بەکاربێنن.

کورد لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا کە وەکو سەرباز لەکاتی شەڕەکانی تورکدا دژی وڵاتان‌و میللەتانی نەیاری عوسمانی بەزۆرە ملی‌و بەناوی غەزاو بەناوی پارێزگاریکردن لەئاینی ئیسلام پەلکێش کرابوون بۆ کۆڕی شەڕەکان‌و بەهەزارانیان بەخۆڕایی‌و تەنها لەپێناوی تورکدا کوژرابوون کە بەشێك لەو شەڕانە ئەوانە بووە کە تورکەکان چ لەزەمانی عوسمانیداو چ لەزەمانی کەمالیەکانا کوردیان کردووە بەگژ ئەرمەنیەکانیداو بەخۆڕایی ئەو برایەتی‌و دۆستایەتی‌و دراوسێتیە مێژوییەی ساڵەهای ساڵی نێوانیان تێکچووەو کەللە ڕەقەکانی هەردولایان حسابی ئەوەیان نەکردووە ئەوەی لەو ناکۆکیانەیا سوود بەخش بووە تەنها بریتی بووە لەکاربەدەستانی تورکی دوژمن‌و خوێنەخوێی هەردولایان, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ لەناو هەردولادا هی وا نەبووبێ هەستی بەو هەڵە زلەی هەردولا نەکردبێت‌و

بارەها لەناو ڕۆشنبیرانی ئەرمەنیدا زۆریی واهەبووە ڕاستیەکان ڕوون بکاتەوەو بۆ میللەتی ئەرمەنی ئاشکرا بکەن کە تاوانی ئەو کوشتارانەی لەئەرمەنی کرابوو ئەکەوێتە ئەستۆی کاربەدەستانی تورك و ئەو چەند ئاغاو دەرەبەگەی کورد کە تەنها بۆ سوودی تایبەتی خۆیان بوبون بەبەشێك لەدەزگا شەڕکەرەکانی حکومەتەکانی تورك بەبێ ئەوەی هیچ سودێکی تیابێت بۆ میللەتی کورد.

دەربارەی بیروبۆچوونی هەندێ لەڕۆشنبیرانی ئەرمەنی بەرامبەر بەکورد لەلاپەڕە (٣٢٤)ی بەرگی دووهەمی ئەو کتێبەدا کورتە باسێکی ئەو نامیلکەیەم بلاْوکردۆتەوە کە لەلایەن (روبین پاشا)ی ئەرمەنیەوە لەساڵی ١٩٢٥دا لەڕۆژنامەی (تروشاك)ی ئەرمەنی ژمارە (٢٤٣)کە لەشاری (جنوا)ی ئیتاڵی بلاْوکراوەتەوەو باسی ئەو نامیلکەیە کاتی خۆی لەگۆڤاری (کاروان)ی ژمارە( ٦٨)ی ئەیلولی ١٩٨٨ لە بەغداد بەپێنوسی ئەحمەد ئیسماعیل بەرزنجی بلاْوکراوەتەوە کە نامیلکەکە بەقەوارەی (١٥)لاپەڕە بووەو لەژێر ناوی (کورد لەکەیەوە خەریکە) بلاْوکراوەتەوەو دوکتور کەمال مەزهەریش لەکتێبەکەیدا (کوردستان لەساڵەکانی شەڕی جیهانیدا) باسی ئەو ڕۆژنامە ئەرمەنیەی کردووە کە ئۆرگانی (تاشناق)ەکان بوە.

بەپێی ئەو نامیلکەیە تاشناقەکان لەساڵانی نەوەدی سەدەی نۆزدەهەمدا لەگەڵ عەبدولڕەحمان بەدرخان لەجنێف کۆبۆتەوە بەنیازی یەکگرتن و هاوکاریکردنی کوردو ئەرمەنی و هەروەکو دەردەکەوێت ئیماعیل حەقی شاوەیس نیشتمانپەروەریش بۆ بەهێزکردنی دۆستایەتی و بەهێزکردنی پەیوەندی کوردو ئەرمەنی چەند باسێکی لەڕۆژنامەی (تروشاك)دا بلاْوکردۆتەوە ئەو نامیلکەیەی (روبین پاشا) کە لەساڵی ١٩٢٥دا بلاْوی

کردۆتەوە لەساڵی ١٩٢٧دا لەلایەن (علی عرفان)ەوە کە وەکو علی عرفان خۆی وتوویەتی نامیلکەکەی روبین پاشا لەلایەن دۆستێکەوە لە ئەرمەنیاوە کردبووی بە تورکیو ئەویش کردویەتی بەکوردیو لەساڵی ١٩٢٧دا بڵاوی کردووەتەوەو لەپێشەکیەکەیدا علی عرفان وتوویەتی:((هەر بە ئیملاکەی خۆی بڵاوی دەکەمەوە).

((رجا ئەکەم هەموو لاوانو میللەت پەروەرانی کورد بەدیقەت تەماشای ئەم سێ چوار پەڕە قسانە بکەن، بزانین پیاوێکی ئەجنەبی (مەبەستی روبین پاشا)یە چۆن مەسائیلێکی کوردایەتی ئەزانێو لەجێگایەکی دوورەوە نەشری ئەکات. مع ما فیە ئێمە طبیعی لەوان زیاتر ئەبێ هەموو مەسائیلێکی وەتەنەکەمان بزانین بۆخاتری ئەوەی لەفکر نەچێتەوە)).

کورتە باسەکەی روبین پاشا کە علی عرفان وەری گێراوە بۆ کوردی دەڵێت:

((ئیستا ئەوی زیهنی تورکەکان ئیشغال بکات مەسەلەی کوردەکانە چونکە کوردەکان خەباتی رزگاریو سەربەخۆیی دەکەنو ئەو تۆمەتانەش ڕەت دەکاتەوە کە گوایە حوولانەوەکەیان بەهاندانی بێگانەکانە. من وا ئەزانم ئەمە شتێکی ئەسلی نییە چونکە میللەتانی تر لەژێر زولمو ئیستبدادی تورك نەجاتیان بوو، کوردەکانیش ئەیانەوێ خۆیان رزگار بکەن، سیاسەتی تورکەکان لەگەڵ کوردەکانا وەیا بەرامبەر بەوان هەر ئەوە بوو کە بەرامبەر نەتەوەکانیتر بەکاریان دەهێناو زیاد لەمەش میللەتو عەنعەناتی خۆیان لەبیر ببەنەوەو لەگەڵ تورکەکانی وەسەطی ئاسیادا ئیرتباط پەیدا بکەنو ببن بەیەكو ئەو میللەتانەی لەبەینیاندان مەحویان بکەنەوە، بەرامبەر بەمە کوردەکان کەوتنە خۆیان تا نەتوێترێنەوە،

سیاسەتی تورکیا لەوەدا بوو چونکە ئەو دوو نەتەوەیە(کوردو ئەرمەن) خاکەکەیان لەپاڵ یەکدا بوو بۆیە بەیەکجار نەیانتوانی پەلاماری هەردوکیان بدەن و بەتەواوەتی ژێردەستەیان بکەن, لەبەر ئەوە بەواسیتەی مەعنەویاتەوە دوژمنایەتی خستبوە بەینیانەوە, دەولەتی عوسمانی هەر بەوەشەوە نەوەستا بەلکو هەتا لەبەینی کوردەکانیشدا دیسانەوە بەواسطەی تەفرەقەی مەزاهیبەوە (مەبەستی سونی و علوی)یە, عەداوەتێکی گەورەی خستبوە بەینیانەوە.

بدرخانیەکان زۆر تەرەقیانکردبوو لەناو کوردەکانداو خانەوادەیەکی موقەدەس بون و لەهەموو کوردێك زۆرتر بۆ جیابوونەوە لەتورك و بۆ ئیستقلال سەعیان دەکردو تورکەکان فەرقیان بەمە کردو دەسبەجێ سیاسەتێکی زۆر بەشیدەتیان لەعلیهان تعقیب کردو ئەم سیاسەتە لەساڵی ١٨٤٥-١٨٦٥ دەوامی کرد, نتیجە قسمێکی زۆر لەعائلە گەورەکانی کورد هیجرەتیان پێکرا بۆ قفقاس و تورکەکان حکومەتەکانی ئەوروپایان واتێگەیاندبوو کە کوردەکان زۆر ئەزیەتی ئەرمەنی ئەدەن بۆیە نەفیان دەکات, کە ئەرمەنیەکان بۆ تأمینی ئیستقلال نمایشیانکرد تورکەکان هەست بەم جموجولە دەکەن و سیاسەتیان وەرگیرا بەسەر عەلەیهی ئەرمەنیەکان و کوردەکانیان کرد بەئالەت و هۆزەکانی چەکدارکرد کەزولم لە ئەرمەنیەکان بکەن و ئەم سیاسەتە هەتا سالی ١٨٨٠ دەوامی کرد وەنەتیجە تورکەکان ئەرمەنیەکانیان بەکورد زەعیف و بێ قوەت کرد.

لەدوای محارەبەی روس لە معاهەدەی (برلین)دا موافقی (٦١) لەخصوص ئەم مسئەلەیەوە کوردەکان مسئول کران و تورکەکانیان سەربەست کرد کە تەجزیەی کوردەکان بکاو ئینتیقامی ئەرمەنیان لێ بسێنێت, بەو جۆرە

ئیمجاره تای تەرازووی کورد لەسیاسەتی عوسمانیدا سەری کردو سووك بوو)).

روبین پاشا لەباسەکەیدا بەم جۆره رەخنەی لەکورد گرتووه کە وتوویەتی:

((عوسمانلییەکان لەناو کوردەکانا سوارەی حمیدییان داناو گەورەکانیان کردن بە سەرکردەو ئیتر بەمە لەخۆیان بایی بوونو لەناو میللەتەکەی خۆیانا دەستیان کرد بە دەسدرێژیومسائلی میللی خۆیان لەبیر چووەوه کە ئەمە زەرەرێکی زۆری بەخشی بەکوردو بەئەرمەنی.

کە شەری جیهانی دەستی پێکرد تورکەکان بریاری لەناوبردنی ئەرمەنیەکانیانداو زیانێکی زۆریان بە ئەرمەنیەکان گەیانو لەو کوشتارانەی کە روویدا کوردەکانیشی گرتەوه. لەگەڵ ئەوەشدا لەپەیمانی سیڤەردا بەڵێن درابوو کە سەربەخۆیی بدرێ بەکوردو ئەرمەن بەلام سەری نەگرتو دوبارە کورد کەوتە هەڵەیەکی ترەوه کە بەهاندانی تورکەکان دیسانەوه نیوانی کوردو ئەرمەنیو ئاسووری تێکچوو)).

روبین پاشا لەباسەکەیدا سەرسورمانی خۆی بەرامبەر هەلوێستی دەوڵەتێکی ئەوروپایی بەم شێوەیە دەربریوه کە وتویەتی:

((نازانم لە بێ طالعی کوردەکان بوو یاخود لەبەر سیاسەتی تر بوو کە ئومێد نەدەکرا فرنسیەکان لەجیاتی ئەوەی یارمەتی کورد بدەن کەچی بەپێچەوانەوه یارمەتی تورکیان دا (مەبەستی ئەو رێگەدانەی حکومەتی فرنسی بوه بەبەکارهێنانی شمندوفەری رێی حلب لەلایەن تورکەکانەوه دژی شۆرشگێرەکانی شۆرشی پیران وەکو لەباسی ئەو شۆرشەدا روونکراوەتەوه)، جگە لەفەرنسە دەوڵەتە ئەوروپاییەکانیش هیچیان نەکرد بەرامبەر بە تاوانەکانی تورك)).

## باسی پێنجەم

### پرۆگرام، پێڕەوی خۆیبون، بڵاوکراوەو چاپەمەنیەکانی

دامەزرێنــــەرانی خویبــــون، وەکـــو چـــۆن دوو ســــەرکردایەتیان بـــۆ کۆمەڵەکەیان و بۆ ئەو شۆڕشەی بڕیاری لەسەر درابوو پێکهێنـابوو کە وەکو وتمـان ســەرکردایەتی یەکـەمیان بریتـی بـووە لـەو ڕێکخـراوە سیاسـیەی نەخشەی کاروباری خۆی کێشابوو بۆ بەڕێوەبردن و بەجێهێنانی تـەکتیك و ســتراتیجی شۆڕشــەکەیان و ســـەرکردایەتی دوهـــەمیان بریتـــی بـــووە لەسەرکردایەتی شۆڕش بەڕێبەرایەتی (أحسان نوری پاشا) وەکو لەدواییدا بەدووردورودرێژی باسی دەکەین و خۆیبون یەکەم ڕێکخراوی کورد بووە کە بەر لەدەستپێکردنی شۆڕش پرۆگرام و پیرەوێکی بۆخۆی دەستنیشانکردبوو بۆ ئەوەی ببێت بە ڕێبازێك لەسەری بڕۆن و پێڕەوی بکەن.

پرۆگرام و پێـڕەوی خۆیبوون لەلایـەن دەستەی بەڕێوەبـەری خۆیبوونـەوە ئامادە کراوە لەژێر نـاوی (نظامنـا مـری عمومی وە پیمـان میللـی) کە لـە(١١) لاپـەڕەی گـەورەدا لەسـاڵی ١٩٢٨دا بـەزمانی تـورکی بڵاویانکردوتـەوە کـە ناوەڕۆکەکـەی بریتــی بــووە لــە(٣٠)مــادە کــە هــەروەکو لەپاشــکۆی سەرچـاوە(٤٠)دا لەلاپـەڕە (٢٩٧)دا بڵاوکراوەتـەوە, بـەڵام بەداخـەوە چ ئـەم

بڵاوکـراوەی نـاو سەرچـاوە (٤٠)و چ ئـەو فوتوکوپیـەی مامۆسـتا ئـەنوەر سـوڵتانی بـوی ناردوم کـە وتوویـەتی ئـەو پروگرامـە لـەفایلی ژمـارە(-Ari.23 415)ی سـاڵی ١٩٢٨ لـەناو دوکیومینتـەکانی هێـزی هـەوایی بریتانیـا هـەردوکیان زۆر لـێڵن‌و ناخوێنرێنـەوەو بـۆ ئـەوە ناشـێن فۆتۆکوپیـەکانی بڵاوبکرێنەوە تەنها فوتوکوپیی بەرگەکەی بڵاودەکەنەوە.




# خویبون

## جڤاتا ولاتێ کوردا

# نظامنامهٔ عمومی

# و پیمان ملّی

سرنیوهك

١٩٢٨

فوتوکوپی بەرگی نظامنامەکە

نظامنامەکە کراون بەم بەشانەی خوارەوە, هەروەکو خۆیان چۆن نوسراون بەو شێوەیە بڵاوی دەکەینەوە:

١- سەرەتا (کە بەمقصد ناوی هێنراوە)

٢- شرائط دخول

٣- تشکیلات

٤- تشکیلات عسکر وجبهەلر

٥- پروپاغاندا

٦- مرکز عمومی

٧- قونغرە (کۆنگرە)

٨- مواد شتی

٩- پەیمان میللی

١٠- قونغرە قراری صورەتی

(بەر لەمە لەباسی سێهەمدا چۆنێتی سوێندخواردنی ئەندامەکان بڵاوکراوەتەوە)

دەربارەی بڕیارەکانی خۆیبون, جلادت بدرخان لەلاپەڕە(١٠٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٦٠) باسی ئەوەی کردووە چۆن سەرۆك عەشیرەت و پیاوە ناودارو ناسراوەکانی کورد بڕیاری بەستنی مونتەمەرێکیان دابوو کە کۆبونەوەکانی نزیکی مانگ‌ونیوێکی خایاندبوو, لەو کۆبونەوانەدا بڕیار لەسەر گەلێك شت درا لەوانە:

١- هەڵوەشانەوەی هەموو کۆمەڵ و ڕێکخراوە کوردییەکان بۆئەوەی لەهەموویان کۆمەڵێکی گەورەی یەکگرتووی کورد پێك بهێنرێت کە ئەندامە کۆنەکانی ئەو کۆمەڵانەو ئەندامانی تازە هەموویان تیایا بەشداربن.

٢- درێژەپێدان بەخەبات و شۆڕش دژی حکومەتی تورك هەتا ئەو کاتەی دوا سەربازیان لەخاکی کوردستان دەردەکرێن و نیشتمانی کوردیان لێ پاك دەکرێتەوە.

٣- بەر لەدەستپێکردنی شۆڕش پێویستە ئەمانەی لای خوارەوە بخرێنە بەرچاو:

أ- دانانی سەرکردەیەکی گشتی بۆ هەموو هێزە نیشتمانیەکان.

ب- ڕێکخستنی هێزەکان بەشێوەیەکی سەربازیی ڕێك و پێك و دابینکردنی تازەترین چەك و جبەخانە بۆیان.

ج- دامەزراندنی بنکەیەکی گشتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو بۆ سەرکردایەتی باڵای کورد لەیەکێك لەچیاکان.

٤- سازکردنی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ حکومەتی ئێران و شەعبی فارسی برامان.

٥- دامەزراندنی پەیوەندییەکی دۆستانەی هەمیشەیی لەگەڵ هەردوو حکومەتی عێراق و سوریا وەتەنها داوای ئەوەیان لێبکرێت بڕیارەکانی ئینتیداب چ جۆرە چارەنووسێکی تیادا دەستنیشانکراوە بۆ کورد بەجێ بهێنرێت و لەمە زیاتر داوای هیچی تریان لێ نەکرێت.

جـلادت بـدرخان لەلاپـەڕە (١٠٩)ی کتێبەکەیـدا باسـی پەرەسـەندنی خۆیبـوونی کـردووە کـە لەماوەیـەکی کەمـدا تـوانرا گـەلێك لقـی لـەناو کوردسـتان و دەرەوەدا پێکبهێنرێـت و دەستەی بەڕێوەبەر بڕیاریـدا (احسـان نـوری پاشـا) بکرێـت بەلێپرسـراوو دامەزرێنـەری هێـزی سـووپای کـورد لـە (ئـاگری داغ)و ئـەویش کاروبارەکـانی بەباشـی بـەجێهێناو ناوچـەیەکی سـوپایی لەچیا سەخت و گەردن گەشەکەی کوردستان کە ئاگری داغ بوو دامەزراند)).

دەربـارەی ئـەو بڕیارانـەی جـلادت بـدرخان باسـیکردووە، دکتـۆر عزیـز شمزینی لەلاپەڕە(٨٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٢) ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (رامبـو) کـردووە–چـاپی پـاریس ١٩٤٧ (کـریس کوچـرا لەکتێبەکەیـدا سەرچـاوە (٤١) نـاوی کتێبەکـەی رامبـۆی بـە- پـدر چـنگل نـاوبردوە)، لەکتێبەکەیدا رامبو باسی بڕیارەکانی خۆیبوونی بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە.

١- دامەزراندنی سەرکردایەتیەکی گشتی بۆ پێشمەرگەو خۆ ئامادەکردن بـۆ سـپیکردنی شۆڕشـێکی چـەکدارانەو دانـانی کۆمیتەیـەکی ناوەنـدی، دابینکردنی ئازووقە، پەیداکردنی چەك و کەرەسەی پێویست بۆ شۆڕش.

٢- دەستنیشـانکردنی شـوێنێك کـە بکرێـت بـە بنکـەی سـەرکردایەتی شۆڕش و بۆ چالاکیەکانی پێشمەرگە.

٣- بڕیاری پەیوەندی کردن لەگەڵ عێراق و ئێران و سوریا.

٤- احسان نوری پاشا کرا بەلێپرسراوی بەڕێوەبردنی کاروبـاری ئیداری (مەبەست ئیبراهیم پاشای هسکی‌یە کە زۆرجار بە (برو)ش ناوی هاتووە.

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٣٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە(٥٧) وتوویەتی احسان نوری پاشا تەنها هەر کاروباری شۆڕشگێڕی سوپای نەدەبرد بەڕێوە بەڵکو لەو چیا سەختەدا نەخشەی دامەزراندنی حکومەتێکیشی کێشابوو بەسەرۆکایەتی (ئیبراهیم حسکی - هسکی)، کە احسان نوری لەیاداشتەکانیا بە (ئیبراهیم هسکی تیللی) ناوی بردووە کە یەکێك بووە لەسەرۆکەکانی عەشیرەتی جلالی لەبنەماڵی (هەسووری).

دەربارەی بڵاوکراوەو چاپەمەنیەکانی خۆیبون، احسان نوری پاشا لەلاپەڕە (٧٥)ی یاداشتەکانیا سەرچاوە (٦١)باسی ئەوەی کردووە ساتێك چۆتە ئارارات بۆ دەستکردن بە دامەزراندنی بنکەو بەڕێوەبردنی کاروباری شۆڕش، لەوێ دەستیکرد بەدەرهێنانی ڕۆژنامەیەك بەناوی (ئاگری) بەڵام لەبەر ئەوەی لەوێ بەئاسانی کاغەزی دەست نەدەکەوت بۆ چاپکردنی ڕۆژنامەکە بۆیە لەدەرکردنی چەند دانەیەك بۆ هەر ژمارەیەك بەولاوە توانای چاپکردنی زۆرتریان نەبوو، هەروەکو خۆی باسیکردووەو وتوویەتی‌لەبەرئەوەی چاپخانەشیان نەبووە بۆیە ناچاربووین بەدەست ژمارەکانمان کۆپی دەکردو هەندێکی ترمان لەسەر (جلاتین) دەنوسیەوەو کە ئەو جەلاتینەشمان بەشێوەیەك بەکاردەهێنا لەپێشدا جەلاتینەکەمان دەکولاندو ساردمان دەکردەوە ئەوسا لەسەرمان دەنووسی و بەکارمان دەهێنا.

دەربارەی ئەو ڕۆژنامەیەی احسان نوری پاشا لەیاداشتەکانیا باسیکردووە، زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٣٥)ی کتێبەکەیدا باسی سرودێکی پێشمەرگایەتی کردووە کە لەلاپەڕە (١٣٦-١٣٧)دا بڵاوی کردۆتەوەو وەرگێڕی کتێبەکەی زنار سلوپی بۆ عەرەبی (ر.علی) وتوویەتی ئەو سرووده

لەلایەن (مصطفى جمعە)و پیاچوونەوەی (محمد علی شمس الدین) کراوە بەعـــەرەبی، کـــە وەرگێـــڕاوە عەرەبییەکـــەی لەلاپـــەڕەکانی (١٣٨-١٤٠)ی کتێبەکـەی زنـار سلوپیدا بڵاوکراوەتـەوە کـە ئەمـەی خـوارەوە فوتوکـوپیی سرودەکەیە بەشێوەکەی خۆیو بەپیتی لاتین.

# AGRI

Agrî Agrî tu agir bû
Nav dunyayê ser bilind bû
Li kûrdistan tu çira bû
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Ronayî direşand her deran
Agir di rijand ser seran
erd dihejand car caran
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Ji hirsate lav revî bû
Her kevirê te çûn agir bû
Wê çagê te dizanî bû
Turan neyarê arî bû
Hêlbe Agrî hêlbe Agrî
Bê şek disa hirsa te hat
Ew agiran bûne kelat

١٣٦

Kom bûn êdi ser te civat
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Şerq û Gerb basik girtîye
Ser sînga xue lav girtîye
Kûrmancara sitar bûye
Hêlbe agrî Hêlbe qgrî
Newalên te tijî xûn bûn
Xilxil tijî cendekbûn
Raste berê agir tu bû
Îro agir lawê.te bû
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Roja azadî ser te hilat
Ronika te da besra reşat
nav milleta azadî çand
Hêlbe agrî Hêlbe [illegible]
Ser sînga te sî girtîye
Ala kûrd pêl didîye
Kurdanre tu kawe bûye
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Hêlbe agrî Hêlbe agrî
Ji sawa te tirk digirî
te dît çawa rom revî
Hêlbe Agrî Helbe Agrî

١٣٧

**لاپەرە ١٣٦-١٣٧ای کتێبەکەی زنار سلوپی**

بەپێویستم زانی بەپێی توانا وەبەشێوەیەکی نزیک بەوەرگێڕانە عەرەبییەکە کە لەلاپەڕەکانی (١٣٨-١٤٠)ی کتێبەکەی زنار سلوپیدا بڵاوکراوەتەوە ئەو سرودە بکەم بەشێوەی کرمانجی خواروو:

ئاگری....ئاگری... تۆ بڵێسەی ئاگر بووی

تۆ سەربەز بویت لەجیهاندا

مەشخەڵێك بوویت لەکوردستاندا

تیشکی تۆ هەموو شوێنێکی ڕۆشنکردۆتەوە

پشکۆی ئاگرەکەت بەسەر هەموو لایەکدا دەبارێ

بێ پشوودان, جار لەدوای جار زەوی دێنیتە لەرزە

ڕاپەڕە ئاگری.......ڕاپەڕە ئاگری

ئەو پشکۆی ئاگرانە هەمووی دەربڕینی قینە

بەردەکانیشت وەکو پشکۆکان جۆشیان سەندووە

ئەوا ئیتر بۆت ڕوون بۆتەوە (طورانی)یەکان دژی (ئاری)یەکانن

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

گڕی ئاگرەکەت بوە بەدروشمو ناونیشان

ئەوا لەپێناوی تۆدا کۆبونەوە ساز دەکەن

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

وا ڕۆژهەڵاتو ڕۆژ ئاوا باڵیان کردۆتەوە

هەموویان هەر مەراقی تۆیانە

هەموویان بوون بەلایەنگری کورد

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

خوێناو ناو هەموو دۆڵەکانتی پڕکردۆتەوە

دەشت و دەر پڕە لەلاشە

ڕاستە تۆ قیبلەی ئاگر بوویت

بەڵام ئیمڕۆ وا لاوەکانت هەموو بوون بە ئاگر

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

ئەوا ڕۆژی سەربەستیت لەگەل هەڵات

ڕووناکی دەسکەوتی زۆرە

تۆ بووی تۆوی سەربەستیت لەناو میللەتا چاند

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

واسێبەر باڵی یەسەر سنگتا کێشاوە

ئاڵای کورد بەبەرزییەوە دەشەکێتەوە

تۆ بووی بە(کاوە)ی کورد

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

لەترسی تۆیە وا تورکەکان دەگرین

بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن (ڕۆم)ەکان ڕایانکرد

ڕاپەڕە ئاگری...... ڕاپەڕە ئاگری

احسان نوری پاشا لەیاداشتەکانیا سەرچاوە(٦١)، لەباسی گەرمەی شەڕەکەدا چەند دێڕێکی ئەو سرودەی تۆمارکردووە کە وادیارە بریتییە لەهەمان ئەو سرودەی زنار سلوپی بڵاوی کردۆتەوە لەگەڵ بوونی چەند جیاوازییەکدا کە بەهۆی وەرگێڕانەکەی هەردوو سەرچاوەکەوە پەیدا بووە، لەدوایدا لەباسی دەسپێکردنی شۆڕشدا ئەو دێڕانەی احسان نوریش بڵاودەکەینەوە کە لەیاداشتەکانیا تۆماری کردووە.

دوکتـور عبدالسـتار طـاهر شـریف کـه لەکتێبەکەیـدا سەرچـاوە(٤٠) باسی زنجیرە بڵاوکراوەکانی خۆیبـوونی کـردووە کە یەکێك لەو زنجیرانـە بریتی بووە لەکتێبەکەی (بلە چ شیرکوە – جلادت بدرخان) کە بەعەرەبی لەژێر ناوی (القضية الكردية – ماضي الكرد وحاضرهم) بڵاوکراوەتەوە.

دوکتـور عبدالسـتار لەلاپـەڕە (٣١٥)ی بـەرگی هەژدەهـەم و نۆزدەهـەمی گۆڤاری کۆری زانیـاری بغداد ساڵی ١٩٨٨، وتوویەتی نوسەری ئەم کتێبـە محمد علی عەونی بووە کە بەزنجیرەی ژمارە (٥) لەسـاڵی ١٩٣٠دا لە مصر بڵاوکراوەتـەوە بـەڵام مـن هـەر لام وایـە هـەر هـی جـلادت بـەدرخان بـووە بەبەڵگەی ئەوەی لـەو کتێبـەدا باسـی هەنـدێ ڕووداو کراوە کە هـەر یـەکێکی وەکو جلادت بدرخان کەخۆی لەو ڕۆژانەدا لەکۆڕی شۆڕشەکەدا بووەو دوور نییـە محمـد علـی عـەونی کردبێتـی بەعـەرەبی و چـاپیکردبێت و بەڵگەیـەکی تریش ئەوەیە لەهیچ ڕوداوێکدا ئامارژە بەوە نـەکراوە کە محمد علی عەونی لایـەنگری خۆیبـون بـووەو لەمصـردا چـالاکی نوانـدووە، لەکاتێکـدا وەکـو وتراوە جلادت بەدرخان بەسەرۆکی خۆیبوون هەڵبژێردرابوو).

دوکتور عبدالستار طاهر شریف لەلاپەڕە (٣١٥) گۆڤاری کۆڕی زانیاریدا ئامـاژەی بـۆ ئـەو بانگـەوازە کـردووە کـە خۆیبـوون ئاڕاسـتەی کوردەکـانی ئەمریکای کـردووە بەزمـانی تـورکی کە ئـەو بانگـەوازە ژمـارە (٧١)ی پێوەیـە کەلە ١٩٢٨/٦/٣٠دا دەرچووەو دوکتـۆر عبدالستار فوتوکۆپـی ئـەو بەیانـەی لەلاپـەڕە(٣٢٧)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە (٤٠)بڵاوکردۆتـەوە کـە لەسـەر ئـەو بانگەوازە نوسـراوە:(خۆیبون: ئامریکا دکی کوردلر بياننامەسی) و لەلاپـەڕە (٧٠)ی هـەمان سەرچـاوەدا ئـەو بەیانـەی وەرگێـڕاوە بـۆ زمـانی عـەرەبی و ئێمەش لێرەدا ئەو وەرگێڕانەی ئەو دەکەین بەکوردی(کرمانجی خوارو):

ئەی هاو وڵاتیانی بەڕێز

سەرەنجامی چارەنووسی پڕ لەئێش و ژان، ئەوا سەدان ساڵە ئەو کوردانەی کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی تورکەوە، هەر لەسەرەتاوە هەتا ئیستە هەمیشەو هەرجارەی بەشێوەیەك تەقەلای لەناوبردنیان دراوە.

ئەو کوردانەی لەناو حکومەتی عوسمانیدا بوون، والەماوەی بیست و پێنج ساڵدا لەلایەن کاربەدەستانی تورکەوە کەوتونەتە ژێر باری گرانی تواندنەوەو داپاچین و لەناوبردن لەناو مەکینەی سیاسەتی تورکدا !!.

باووباپیرانی ئێمە لەبەر گەلێك هۆ هەمیشە بۆ سوودی تورك کاریان کردووەو لەئەنجامی ئەوەدا سەدان هەزار کورد لەپێناوی گەورەیی تورکدا خۆیان بەختکردووەو ئەگەر دەوروبەری شورەی شاری (ڤینا) هەڵگەنرێ ئێسك و پروسکی کوردو گەورە پیاوانی کورد لەو میرو شەڕکەرانەی خۆیان لەپێناوی سەرکەوتنی تورکدا بەختکردبوو لەناو خاکدا دەدۆزرێنەوە.

کاربەدەستانی تورك لەسەدەکانی پێشووەوە کوردیان بۆ سوودو بەرژەوەندی خۆیان بەکارهێناوەو بەوەشەوە نەوەستاون و دەیانەوێ کورد بەجارێك لەناوببەن و بەتەمای ئەوەن ئیمپراتۆریەتی طورانی پێکبێنن و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە لەساڵی ١٩١٤دا کوشتارێکی زۆریان لە ئەرمەنیەکان کردوو دوای ئەوانیش دەستیان کردووە بەکوشتاری کورد کە تا ئیستە ملیونێك کوردی بێ تاوان بەخۆڕایی لەسەهۆڵبەندانی چلەی زستاندا دوورخراونەتەوە بۆ شوێنە دوورەکان بەبێ ئەوەی هۆی گواستنەوەیان بۆ دابین بکرێت و بەبرسێتی و تینوێتی پەرەوازەیان کردوون و لەشوێنە جیاوازەکاندا لەیەکیان دابڕیون و نیشتەجێیان کردوون کە بەهۆی ئەم ڕاگوێزانەوە پتر لە (٧٠٠)هەزاریان مردوون.

لەدوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی شەڕی یەکەمی جیهانی دۆڕان، بۆ ماوەیەکی کاتی نەخشەی کوشتارو لەناوبردنی کورد وەستێنرا، بەڵام مۆرکردنی پەیمانی لوزان لەجیاتی پەیمانی سیڤەر، تورکەکان بارودۆخی تازەیان بەهەل زانیو دەستیانکرد بەکوشتاری کوردو ئەمە ماوەی چوارساڵە شەوو ڕۆژ قەسابخانەیەکیان بۆ کوشتنی دایكو باوكو براو خوشكو منداڵانی ئێمە خستۆتەکار بەنیازی لەناوبردنی کوردو بەرامبەر بەم هەڵوێستو تاوانانەی لەکورد کرا سەرۆکەکانیان لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٧دا کۆبونەوەو بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵی (خۆیبون)یاندا بۆ ڕزگارکردنی کوردو کوردستانو بۆ گەیشتن بەم مەبەستە خۆیبون هەموو کوردی لەژێر باڵی خۆیدا گرد کردۆتەوە چونکە مانەوەی لەژێر دەسەڵاتو جەورو ستەمی تورکدا مانای لەناوبردی کوردو کوردستانە.

میللەتانی جیهان بێجگە لەکورد هەموو مافی خۆیان دەستگیر بووە بەڵام کورد هێشتا هەر لەژێر بەندایەتی تورکدایەو بەزورە ملی وایان لەکورد کردووە بەزمانی دوژمن بنوسێتو بخوێنێتەوە.

ئێتر کاتی خۆڕزگارکردن هاتووەو پێویستە کوردیش وەکو میللەتانیتر ئازاد بێتو حکومەتی تایبەتی خۆی هەبێت بۆ ئەوەی لەسایەی یاسای ئەو حکومەتەیانا بەباشی بژینو بگەن بە شادیو بەختەوەریو ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە پێویستە کورد لەهێزو توانای خۆی بگاتو بەباشی هەڵیسەنگێنێتو باوەڕی بەوەش هەبێت کە کورد هیچی کەمتر نییە لەتورکو ئێمەی کورد کە کەوتوینە ژێر دەسەڵاتیانەوە خۆمان لەوان بەکەمتر نازانینو بەپێچەوانەوە لەزۆر ڕووەوە لەوان باشترینو بارەها کورد خاکی وڵاتی تورکی پاراستبوو، فریای کەوتبوو، دەبێ هیچ گومانمان لەوەدا نەبێ

بەیەکێتیو تەبایی دەتوانین وڵاتەکەمانو میللەتەکەمان لەو زۆرداره ستەمکارو درندەیە ڕزگار بکەینو بەهاوکاریکردنی هەموو کوردێك بەو ئامانجە دەگەین کە ئەمەش پێویستی بەلەخۆبوردن هەیە لەگەڵ پێشکەشکردنی سەروماڵو لەم ڕێگەیەوە ئاواتەکانمان دێتەدیو شتێکی ئاشکراشە ئەو کوردانەی لەئەمریکادا دەژین وڵاتەکەی خۆیان لەبیر نەچۆتەوە پێویستە هەموو کوردێك خەباتکردن لەپێناوی وڵاتو میللەتدا بەئەرکی سەرشانی خۆی بزانێتو دەستی یارمەتی درێژبکات بۆ خۆیبون بۆ سەرکەوتنو ڕزگارکردنی کوردستانو پێویستە یارمەتیدانتان بۆ خۆیبون تەنها هەر بریتی نەبێت لەیارمەتیدان بەپارە, بەڵکو ئەو کوردەی لەئەمریکای وڵاتی زانستو خوورەوشتی باشدا دەژی پێویستە لەخەڵك بگەیەنیت کە کورد کۆمەڵێکی هەیە بەناوی (خۆیبون)ەوە کەبۆ سەربەخۆییو ڕزگارکردنی کوردستانی ژێردەستی تورك خەبات دەکات کە ئیمڕۆ ئەو تورکە بەو پەڕی دڕندەیەتیەوە کورد دەکوژێ, پێویستە هیچ کوردێکدەقیقەیەك لەکاتی خۆی لەکیس نەداتو هەمیشە ئەوەی لەبەرچاوبێت دەیان هەزار کورد ئیمڕۆ لەچیاکانی کوردستانا بۆ پاراستنی عەرزو ناموسی خۆیان خەبات دەکەنو لەپێناوی پاراستنی ئەو هەموو ژنو منالآنەی لافاوی خوێنیان هەستاوە تێدەکۆشێتو ئەرکی سەرشانی ئەو کوردانەیە کە لەئەمریکادان چەند لقێکی خۆیبون لەناو خۆیاندا پێك بێننو پێویستە لەسەر خوشكو برا هاوولآتیە خۆشەویستەکان هەمیشە ئەوەیان لەبیر نەچێت کێشەی میللەتەکەمان لەسەر بناغەی پاراستنی شەرەفو ناموسو بۆ ڕێزگرتنە لەمیللەتەکەمانو ئەوەی بەتەنگ میللەتەکەی خۆیەوە

نەیە ئەوە مانای ئەوەیە بەتەنگ ویژدانو نامووسی خۆیەوە نیەو هیچ کوردێکیش نییە کە نەیەوێ پارێزگاری لەوانە بکات.

ئەی کوردە بەشەرەفەکان: پێویستە بەوپەڕی تواناو دەسەڵاتەوە هەستی نەتەوایەتی بمانجوڵێنێتو بەهەموو شێوەیەكو بەهەموو ڕێگەیەك خەبات بکەین بۆ ڕزگاربوونی نیشتمانەکەمان چونکە ئیمڕۆ کاتی بزوتنەوەو چالاکییە ئەمەش تەنها بەتەباییو یەککگرتنی ناوخۆمان پێك دێت. با هەموو جیهان لەوە ئاگاداربکەین کورد ئەگەرچی لەوڵاتەکەی خۆشی دورکەوتبێتەوە بەڵام هەر کوردەو هەر نیشتمانەکەی خۆی خۆش دەوێتو بەهەوڵو تێکۆشانی هەموو لایەك ڕۆژی خۆشیو شادیو ڕزگاربوون لەئاسۆی نیشتمانەکەمانا هەڵدێ، ئەو وڵاتە ئیمڕۆ والەژێر جەورو ستەمی تورکدا کاولکراوە ڕزگاری دەبێت.

بژی کوردستان... بژی خەباتکەرانو تێکۆشەرە قارەمانەکانی کورد، بژی میللەتی کورد

مرکزی عمومی خۆیبون

١٩٢٨/٦/٢٠

حسن عرفه لەكتێبەكەیدا سەرچاوە(٥٢) باسی بەیانێكی كردووە كە وتوویەتی لەلایەن سەركردەكانی كوردەوە بەنهێنی لەتەواو خاكی كوردستانی عێراق و توركیادا بڵاوكرابووەوەو ڕونووسێكیشی نێررابوو بۆ كومیسیونی مافی نەتەوە یەككگرتووەكان لەپاریس و بیروت بەپێی كتێبەكەی حسن عرفه بەیانەكە بەم جۆرە بوو:

((برایانی كورد، ئێوە كە شایستەی ئەوەن كە نەتەوەیەكی گەورەتان لێ دروست ببێت چۆن ڕێگە بەوە دەدەن بێ دەنگ دەبن كە بەكۆیلەیەتی لەژێر چنگی توركدابن، ولاتە ئەوروپاییەكان بەڵێنی دەوڵەتێكی گەورەیان بەئێمەدا لەئێران و عێراق بۆ ئەوەی یەكبگرن و خەبات بكەن هەتا براكانمان لەژێر چەپۆكی توركەكان ڕزگار بكەین ولاتەكەمان سەربەست بێت كە لەچەرخەكانی كۆنەوە ولاتی خۆمانە)).

دەربارەی ئەم بەیانەی حسن عرفه باسیكردووە دوور نییە كورتەیەكی لەو بەیانەوە وەرگیرابێت كە لەلایەن دوكتور عبدالستارەوە لەتوركیەوە كراوە بەكوردی وەكو باسمانكردو ئەو بەڵێنەش كە وتویەتی ولاتەكانی ئەوروپا بەكوردیان دابوو بۆ پێكهێنانی دەوڵەتێكی گەورە مەبەستی پەیمانی (سیڤەر)ە بەلام لەم پەیمانەدا تەنها باسی كوردستانی باكوورو باشووری تیادا كراوەو كوردستانی ئێران بەشێك نەبووە لەدەوڵەتی عوسمانی بۆیە پەیمانی سیڤەر كوردستانی ئێرانی نەگرتۆتەوەو نازانم حسن عرفه لە چ سەرچاوەیەكەوە وەریگرتووە.

دوكتور عبدالستار طاهر شریف لەلاپەڕە (٧٦)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە (٤٠) باسی بەیانێكی تری كۆمەڵی خۆیبوونی كردووە بۆ وەرامی ئەو بڕیاری لێخۆشبوونەی حكومەتی تورك لە (٢٩/ی ئۆكتۆبەری/١٩٢٣)دا

بلاوی کردۆتەوە بەبۆنەی تێپەڕبوونی (١٠)ساڵ بەسەر دامەزراندنی حکومەتی جمهوری تورکیادا, بەیانەکەی خۆیبون دووبارە بەزمانی تورکی بلاوکراوەتەوە لەریزی ژمارە (٨)ی زنجیرەی بلاوکراوەکانی خۆیبون کە نوسەری سەرچاوە (٤٠) لەلاپەرە (٣٣١)یدا فوتوکوپی ئەو بەیانەی خۆیبونی بلاوکردۆتەوە وەلەلاپەرە (٧٦)دا هەمان بەیانی لەتورکیەوە کردووە بەعەرەبی کە وەرگێرانەکەی بۆ کوردی بەم جۆرەیە:

((بەڵێ تورکیا هەرکاتێ بیەوێو چۆنی بوێ دەتوانێت بەیانی لێخۆشبوون دەربکات بۆ سیاسیە داماوەکانی تورك بۆ ئەوەی سوود لەو بریاری لێخۆشبوونە وەربگرنو بەدڵنیاییەوە بگەرێنەوە بۆ ولاتی خۆیان, بەلام ئەو بەیانە نیشتمانپەروەرانو خەباتکەرانی کورد ئەو لێخۆشبوونە نایانگرێتەوە چونکە هۆی بناغەی ناکۆکیو دوژمنایەتی کورد بەرامبەر بەجمهوریەتی تورك لەبەر دواکەوتنی سیاسیو بێ مێشکی کورد نییە کە نەیتوانیبێت لەچۆنێتی رێبازی بەرێوەبردنی کاروباری حکومەتی تێبگات هەتا پیاو بیر لەوە بکاتەوە لەوانەیە بەپێی گۆرینی هەڵوێستو بارودۆخی رۆژانە گۆرانکاری لەو رێبازەدا بەدی بکات کە بەرەو باشی دەروات بۆ کوردو نیشتمانپەروەرانو خەباتکەرانی کورد بەکۆمەڵی خۆیبونیشەوە تەنها بۆ ئەوە تێدەکۆشنو خۆیان بۆ ئەوە تەرخانکردووە ئامانجە پیرۆزەکانی میللەتەکەیان بهێننە دی.

نیشتمانپەروەرانی کورد لەوە دڵنیان ئەگەر خوایاربێ رۆژێك دێت بگەرێنەوە بۆ خاکی خۆیان بەلام بۆ تورکیا نا بەڵکو بۆ نیشتمانی خۆشەویست کە بریتییە لەکوردستان, بۆ ئەو ولاتە کاولکراوەی دانیشتووەکانی لەبچوکترین مافی خۆیان بێ بەش کراون کە بریتییە

لەئازادیی گفت‌وگۆ کردن بەزمانی کوردی لەگەڵ فێربوون‌و نوسین بەزمانی کوردی.

بۆ ئەوەی ڕای گشتی دنیای شارستانێتی بارودۆخی کوردستانیان بۆ ڕوون بێتەوەو ئاگاداری کێشەی ئیمڕۆی کورد ببن بۆیە کۆمەڵی نیشتمانی کورد(مەبەستی کۆمەڵی خۆیبون خۆیەتی) بڕیاریدا ئەم ڕاگەیاندنە بلأوبکاتەوەو جارێکی‌تر ئەوە بسەلمێنێت کە تێکۆشەرانی کوردلەم ڕێبازە پیرۆزە لانادەن کە دەیان ساڵە میللەتی کورد لەپێناوی دەستگیربوونی مافەکانیا سەرو ماڵی خۆی بەخت کردووە, ئەم خۆبەختکردنەی بەهی ئەو هەستی نیشتمانیەوەیە کە لەدێرزەمانەوە لەمێشك‌و دڵی کوردا چەسپاوەو ئەم کۆمەڵە سوورە لەسەر پێڕەوکردنی ئەو ڕێبازەی ئاوات‌و هیوای میللەتی کوردی پێ دێتەدی کە ئەو هیواو ئاواتە بریتی نییە لەهیواو ئاواتی تاقە کەسێك بەڵکو هی هەموو میللەتی کوردە, تاکەکەس دەڕوات بەلأم میللەت هەر دەمێنێت‌و لەناوناچێت‌و ئەوانەی لایان وایە کورد واز لەم ڕێبازە دەهێنێت زۆر بەهەڵەدا چوون چونکە ئەوانەی ئاگادارو شارەزای ئەو بەسەرهات‌و کارەساتانە نین کەبەسەر ولأتەکەیانا هاتووەو دێت‌و لایان وایە کۆمەڵەکەیان بەرلەوەی بگات بەو ئاواتەی خۆیان بۆ بەختکردووە کۆڵ دەدەن‌و کۆمەڵەکەیان هەڵدەوەشێتەوەو مل کەچ دەکات بۆ جمهوریتی تورکیا, ئەو جمهوریەتەی هەموو ڕۆژێك بەجۆرێك سزای کورد ئەدەن‌و بەوپەڕی دڵڕەقی‌و بێ بەزەییانەوە ڕەفتار لەگەڵ ئەو کوردەدا بکەن کە دەیەوێ باشاشتی لەناو خاکی خۆیانا بژین‌و گوزەران بکەن.

لەساڵی (١٩٢٥)ەوە هەموو دەزگاکانی تورك بەجندرمەکان‌و بەدادگاکانی استقلالیانەوە هەرچی نەشێ بەکوردیان کردووەو سەدان گوندو شارۆچکەی

کوردیـان سـوتاندووەو کاولیـان کـردووەو دانیشـتووەکانیان لـەناوبردووەو هەزاران هـاوولآتی کوردیـان بەگوللـە کوشـتووەو لەسـێدارەیان داون‌و هـەموو جـۆرە ڕەفتـارێکی کاولکارانـەیان گرتۆتەبـەرو دەیـان هـەزار کوردیـان بـەپێ خاوسی‌و بەرووتی بەسەرماو سۆڵەو سەهۆڵبەندانی زستان ئاوارە کردووەو لـەولآتی خۆیـان دوریـان خسـتونەتەوە, بـەلآم لەگـەڵ ئەمەشـدا بانگـەوازی پیرۆزی نیشتمان هەتا بێت بەرزتر دەبێتـەوەو کۆڵنـادات‌و حکومـەتی تـورکی بەخوێن تینوو بەهـەموو توانـای خۆیـەوە نـەیتوانیوە دەنگی شۆڕشـگێڕانی کـورد کـپ بکـات‌و لەخـەباتکردن وازی نـەهێناوەو ئازایانـە ڕووبـەڕووی هێزەکانی تورك دەبێتەوەو هـەتا تـورك درێژەبدات بەلـەناوبردنی کـوردی بێ تاوان, چیاکانی کوردستان بێدەنگی بەخۆیانەوە نابینن‌و زنجیرەی خـەبات‌و تێکۆشانی کورد کۆتایی نایەت.

ئـەو تورکـەی کـە تـا ئیسـتە نـەیتوانیوە بەهـەموو هێـزو توانـای خۆیـەوە خـەباتی کـورد لـەناو ببـات پـەنای بردۆتـە بـەر درۆو دەلەسـەو خەڵەتانـدن‌و بـەڵێنی پـڕ لـەدرۆو دەسـتبڕین‌و بارەهـا تـا ئیسـتە بڕیـاری لێخۆشـبونیان دەرکردوە کە ئەمەی دواییان سێهەم جارەو لایان وایە کورد گەمژەو نەزانەو لەدرۆ دەلەسەو نەخشەکانیان نەگەیشتووەو بەئاسـانی دەستەمۆی ئەکات‌و تـۆ بڵێـی ئـەوەی ئـەو بڕیـاری لێخۆشـبوونە دەخوێنێتـەوە لای وابێـت ئـەوە بڕیاری دەزگایەکی بەویـژدانی شارستانێتی دۆستەو دەتوانێت بەپێی ئەو بڕیاری لێخۆشبوونە دەرفەتی ئـەوەی هـەبێت بەوپـەڕی سەربەستیەوە لـەناو خاکی ولآتی خۆیدا بژی‌و مافی هات‌وچۆکردن‌و قسەکردنی هەبێت؟! نـەخێر چونکە ئـەو لێخۆشـبونانەی هـەتا ئێسـتە بـەناو بـۆ کـورد دەرچووە هـەمووی بریتـی بـووە لەتەڵـەو داوو دەسـبڕین‌و ئەوانـەی بـەو لێخۆشـبوونانە

خەڵـەتێنرابوون‌و لەخشـتە بڕابـوون کـە هاتبوونـەوە ژێـر سـایەی حکومـەت ئەوی لەمردنیش ڕزگاری بوو‌بێت ئێستە لەناو زینداندان‌و چاوەڕوانی سـەرە مەرگی خۆیانن.

لێخۆشبوونی تورك لەکورد درۆیـەکی ئاشکرایەو خەڵەتاندنەو پێویست بە بەڵگە ناکات چونکە ئایا حکومـەتی تورك دەتوانێت دانـی پیادا بنێت‌و بـڵاوی بکاتـەوە چـەند کـەس لـەو ئاوارانـەی لـەئێران‌و سـوریاو عێراقـەوە گەڕابوونەوە بۆ تورکیاو ئەوانەی لەچیاکانی کوردستانەوە هاتبوون‌و خۆیان دابوو بەدەستەوە ئاخۆ ئیمڕۆ چـەند کـەس لەوانـە لـەژیانا مـاون؟! ئایـا لـە (٨٥٪)ی ئەوانـەی ئەگـەر نەشـوترێت (٩٥٪) لەوانـەی بەسـوێندی شـەرەفی تــورك هەڵخەڵــەتابوون دەیــان درۆو دەلەســەیان بــۆ هەڵنەبەســراوەو بەشێوەیەکی ناجوامێرانـەو ناپیاوانە نەکوژراون‌و لەسێدارە نـەدراون؟؟! کـە ئەم ڕاستیانە دەری دەخەن هەموو بەڵێنەکانی تورك وەکو صفری لای چەپ وان‌و هیچ بایەخێکیان نییە!! بەڵام لەگەڵ ئەو هـەموو درۆو خیانەتانـەی لـەو کوردانـەی بـەر لـە پێـنج سـاڵ لەمەوبـەر کـرا (مەبەسـتی ئەوانـەی شۆڕشـی پیرانـە) ئایـا بـەهیچ شێوەیەك توانیویانـە هەسـتی کوردایـەتیان لەمێشـکیانا نـەهێڵن؟ ئـەم لێبوردنـەی ئەمجارەشـیان هـەر بـەو ئاواتانـەیان ناگەیـەنێت بـۆ لەناوبردنی کورد.

ئیمڕۆ ئەو کوردەی دوورە وولاّتـە هیچـی نیـەو لەهـەموو مـافێکی ئاسـایی خۆی بێ بەشـەو ڕێگـەی ئـەوەی لێگیراوە بـەزمانی خـۆی بدوێ‌و بنوسێت‌و لـەناو وڵات ڕێگـەی ئـەوەی پێنادرێـت مەراسـیمە ئاینیـەکان بـەجێ بێنێـت‌و لەهەموو مـافێکی سیاسـی بـێ بەشـەو هـەمووی لێ قەدەغـە کراوەبەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هێشـتا هــەر بـەئیمانێکی نیشـتمانی بـەهێزەوە بـۆ مەبەسـتێکی

شەریف و خاوێن تێدەکۆشێت کە بریتییە لەڕێبازی هەموو مرۆڤێکی خاوەن شەرەف. نمونەی ئەو کۆڵنەدانە بۆ گەیشتن بەئامانجە پیرۆزەکان لەدوو قارەمانی کۆڵنەدەردا دەردەکەوێت کە بریتین لە (احسان نوری)و (فرزندە) کە هەردوکیان لەدنیایان گەیاند نیشتمانپەروەرێتی کوردو باوەڕکردن بەنەتەوایەتی کورد شتێك نییە بەهیچ جەورو ستەمێك کۆڵ بداتو وازی لێ ناهێنێت.

بەڵێ ئیمرۆ تورکەکان دەیانەوێ خۆیان لەشتێکی تردا تاقیبکەنەوە بەئومێدی ئەوەی کورد لەناو دەبەن یا هیچ نەبێ لاوازی دەکەن و بۆ گەیشتن بەو مەبەستەیان ئەگەرچی نەیانتوانیوە وورەی کورد بەربدەن, دەیانەوێ ڕێگەی فێڵ و تەڵەکەبازی بگرنەبەرو سوود لەدڵپاکی کورد وەربگرن بەلأم کورد هەتا بێت وورەی بەرزتر دەبێتەوەو بەرەنگاری هەموو تەقەلاکانی تورك دەبێتەوە.

تورکەکان هەمیشە بزوتنەوەکانی کورد بەبزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانەو بەڕێبازێکی چەتەگەری یاخوود بەوابەستەی بێگانەی لەقەڵەم دەدەن, کوردیش بەرامبەر بەو تەقەلایانەی تورك بۆ ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوای ڕوون دەکاتەوە کە ئەگەر تێکۆشان و خەباتی کورد بریتی بووبێت لەجەردەیی و چەتەیی, بەرگەی ئەوەی نەدەگرت کە لەماوەی دە ساڵدا کۆڵنەدات و درێژە بەو خەبات و تێکۆشانەی خۆی بدات.

ئایا ئیمرۆ لەسەر ڕووی جیهاندا لەحکومەتی تورك بەولاوە حکومەتێکی تری واهەیە هەموو دەسەلأت و توانای خۆی بۆ ئەوە تەرخان بکات نەتەوەیەکی تر لەناوبەرێت و هەموو تواناو دەسەلأتی خۆی بۆ ئەوە تەرخان بکات هەموو جۆرە ئازادیو سەربەستییەك لەو میللەتە قەدەغە بکات.

میللەتی کورد کە بازووی خۆی لێ هەڵکردووەو خەبات دەکات لەکۆڕی تێکۆشاناو هەمان ڕێبازی ئەو میللەتانەی تری گرتۆتەبەر کە بەرلەخۆی گرتویانەبەر بۆ مسۆگەرکردن و دەستگیربوونی مافی ڕەوای خۆیان و هیواداره بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی دەستی پیاوەتیو یارمەتی ئەدەبی بۆ درێژبکرێت, بەلأم بەداخەوە لەجیاتی ئەو یارمەتیدانە حکومەتەکان بەپێچەوانەوە نەك هەر یارمەتی نادەن بەڵکو کۆسپ و بەرهەڵستیش ئەخەنە بەردەمی و کاربەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو بوون بەلایەنگری تورك بۆ سەرنەکەوتنی کورد لەبزوتنەوە پیرۆزەکەیدا.

هەموو مرۆڤێکی ژیری خاوەن ویژدان ئەبێ دان بەوەدا بنێت ئەم ڕاپەڕین و شۆڕشە نەتەوەییەی کورد زادەی هەست و هۆشی چەند ملیۆنێکە کە ئیمرۆ ڕوو بەڕووی بەسەرهاتی ترسناك بۆتەوە, بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵنادات لەتێکۆشان و خەبات لەپێناوی ئازادیو ژیانێکی خۆشبەختانەو میللەتێکیش ئامادەبێت گیانی خۆی پێشکەش بکات لەپێناوی ئەم مەبەستە پیرۆزەدا هێز نییە کۆڵی پێ بدات و لەناوی ببات)).

*باسی شەشەم*

## خۆ ئامادەكردن بۆ ڕووبەڕوو بونەوە

**لەباسی چۆنێتی پێكهاتنی كۆمەڵی خۆیبوندا باسی ئەوە كرا چۆن دەستەی بەڕێوەبەری خۆیبون بڕیاریدا احسان نوری پاشا ببێت بەلێپرسراوی سەركردەی هێزەكانی شۆڕش لەچیای ئاراراتداو ئەویش كە چووە ئاراتو دەستیكرد بەڕێكخستنی كاروباری شۆڕشو ڕۆژنامەیەكیشی دەركرد بۆ ئەوەی ببێت بە ئۆرگانی كۆمەڵی خۆیبونو شۆڕشی ئاراراتو بەرلەمە لەباسی شۆڕشی پیراندا لەباسی پێكهاتنی كۆمەڵی ئازادیدا باسی ئەوە كرا چۆن توركەكان بۆ زراندنی ناوی احسان نوری پاشا گەلێك درۆو دەلەسەیان دەربارەی هەڵبەست بۆ ئەوەی لای شۆڕشگێڕانی كورد ناوی بزرێننو دڵی ئینگلیزەكانیشی لێ كرمێ بكەن, بەڵام ئەو درۆو دەلەسانە نەیانتوانی ناوی احسان نوری لكەداربكەن هەروەكو روبرت ئولسون لەكتێبەكەیدا سەرچاوە (٨٤) ڕوونی كردۆتەوەو ئەو دوكیومینتەی دەربارەی ئەو تەقەلا سەرنەگرتووەی توركی باسكردووە كە ژمارەی دوكیومینتەكە (Air 23-43) ڕۆژی ١٩٢٥/٢/٢٧ ئەوەندەی‌تر درۆو**

دەلەســـەكانی حكومـــەتی كەمالیـــەكانی پووچـــەڵ كردۆتـــەوەو ئـــەم هەڵبژاردنەشـی بـۆ سـەركردایەتی هێزەكـانی شـۆڕش نیشـانەیەكی تـرە بۆنیشتمان پەروەرێتیو بۆ دەم كوتكردنی تورك بەرامبەری.

وەكـو لەبەسـەرهاتو ڕوداوەكـانی شۆڕشـی ئاگریداغـدا ڕوون دەبێتـەوە احسـان نـوری پاشای شازادە بـەكاروباری سـوپاو شۆڕشـگێڕی بریتـی بـوە لەئەندازیارو نەخشەكێشـی كاروبـاری شۆڕشـكە بـەلاّم بەداخـەوە ئـەو كـەمو كوڕییانەی لەشۆڕشكەدا ڕوویدا لەگەڵ باری نالەبارو هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبـەر بـە شۆڕشەكە بەهـەموویان ڕێگەی سـەركەوتنیان لەشۆڕشـكە گـرت وەكو لەشوێنی خۆیدا بەدوورو درێژ باس دەكرێت.

احسان نوری لەدوای شكانی شۆڕشـكەو ناچاربوونی كـە پـەنا بباتـە بـەر ئێـران وەكـو پەناهەندەیـەكی سیاسـی لـەوێ دەسـتیكرد بـەتۆماركردنی یاداشتەكانی دەربارەی شۆڕشی ئارارات, بـەلاّم بەداخـەوە چونكە بیرەوەری یاداشتەكانی لەكاتی خۆیدا تۆمارنەكردووەو هێشتوویەتیەوە بۆ سـەردەمی ئاوارەبوونی بۆیە یاداشتەكان لەزنجیرەی ڕووداوەكانا هەست بەوە دەكرێت لەسەر یەك زنجیرەو بەپێی بەسەرهاتو ڕووداوەكان تۆمارنەكراون.

احسان نوری بێجگە لەو یاداشتەی كتێبێكی تریشی بەناوی (ژیانم)ەوە بـەزمانی كـوردی نوسـیوەو بـەزمانی فارسـیش لەسـاڵی (١٩٥٥)دا لـەتاران كتێبێكـی بـەناوی(تـأریخ ریـش ئـی نـژاد كـورد) چـاپكردووە كـە بریتییـە لە(١٤٦)لاپەڕەو مامۆستا صلاح بروراى لەتەمووزی ١٩٩٠دا ئەو یاداشتەی احسـان نـوری كـردوە بەعـەرەبیو لەبـەیروت یەكـەم چـاپی بلاّوكراوەتـەوەو هـەروەكو صـەلاح بـەرواری باسـیكردووە (انسـتتیوی پـاریس) لەسـاڵی ١٩٨٦دا ئـەو یاداشـتانەی بلاّوكراوەتـەوە لـەژێر نـاوی ( La Reolte de

Lagridagh-ARARAT) بەزمانی فەرەنسی لە(جنیف) چاپکراوەو هەروەکو صلاح بەرواری لەلاپەرە(١٠)ی پێشەکیەکەی یاداشتەکەدا باسی کردووە ئەو یاداشتە بەزنجیرە بەزمانی عەرەبیش لەگۆڤاری (هیڤی – هیوا)دا بلاوکراوەتەوە لەلایەن انستتیوی کوردەوە لەپاریس.

صلاح بەرواری لەلاپەرە(٦)ی پێشەکی ئەو یاداشتانەدا وتوویەتی:

((سەرکردەکانی ئەو هێزە لەژێر سەرکردایەتی احسان نوریدا بووە زۆربەیان بریتی بوون لە دەرەبەگو سەرۆك عەشیرەتو پیاوە ئاینیەکان کە لەناو ئەوانەدا دوو سەرکردەی زۆر ئازاو دلێریان تیا بووە کە بریتی بوون لە (بروهسکی)و (فرزەندە بەگ), هۆی سەرەکی سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشە بەهۆی ئەو ناکۆکیەوە پەیدا بوو کە لەنێوان (محمد بگ)و سید رسول)دا پەیدا بوو کە تورکەکان بەهۆی ئەو ناکۆکیەوە خراپترینو خوێنڕێژترین کوشتاریان لەکورد کرد لە(زیلان)دا (لەشوێنی خۆیدا بەپێی یاداشتەکەی احسان نوری ئەچینە سەر باسی ئەو رەخنەیەی احسان نوری لەهەردوکیانی گرتبوو).

صلاح بەرواریش هەر لای وایە کە احسان نوری لەدوا سالانی ژیانیا کە تەمەنی چوبوە سالەوە ئەو یاداشتانەی تۆمارکردووە کە لەماوەی پێنج سالی بەرلەکۆچی دوایدا کە لەسالی (١٩٧٥)بووە ئەو یاداشتانەی نوسیوەتەوە, بەلگەش بۆ ئەمە ئەوەیە لەیاداشتەکانیا ئاماژەی بۆ باسێکی ناو رۆژنامەیەکی تورکی کردووە کە لەسالی ١٩٦٩دا باسی ئەو یاداشتەی بلاوکردۆتەوە.

دەربارەی ژیانی احسان نوری پاشا بەپێی پێشەکیەکەی صلاح بەرواری , احسان نوری لەسالی ١٨٩٢دا لەشاری (بدلیس) لەگەرەکی (ئالی کولی)

لەدایك بووەو لەوێ گەورە بووەو (ئەكادیمی حربی) لەئەستەمبول تەواو كردووەو هەروەكو ئەفسەرەكانی تری كورد لەدوای تەواوبونی شەڕی جیهانی لەشەڕی ڕزگاربوونی توركیادا بۆ دابینكردنی سەربەخۆیی توركیاو ڕزگاركردنی لەدەوڵەتە داگیركەرەكان بەشداری كردووەو لەشەڕەكانا ئازایەتیەكی زۆری نواندووە (روبرت ئولسون لەكتێبەكەیدا سەرچاوە (٨٤) وتوویەتی: كاتی خۆی أحسان نوری سەركردەی سوپای شەشەمی دەوڵەتی عوسمانی بووەو لەدوای تەواوبونی شەڕی جیهانی یەكێك بووە لە نوێنەرانی دەوڵەتی عوسمانی لەمۆركردنی پەیمانی (مودراس- پەیمانی وەستاندنی شەڕ)و لەكاتی كۆبوونەوەكانی مودراسدا دژی هەڵوێستی ئینگلیزەكان بووە بەتایبەتی لە سیاسەتیانا بەرامبەر بە عێراق).

هەروەكو روبرت ئولسون لەلاپەڕە (١٩٤)دا ئاماژەی بۆ دوكیومێنتی ژمارە(Air23-43) كردووە كە لەلاپەڕە (٤٦)یدا وتراوە أحسان نوری پاشا لەساڵی ١٩١٩دا لەكاتی شەڕی (غالیبولی)دا دژی ئەفسەرەكانی تورك یاخی بووە, چەند ئەفسەرێكی توركی دەستگیركردوو بۆ ماوەی دوو مانگ خۆی كرد بەسەركردەی ئەو هێزەی دەستی بەسەردا گرتبوو, لەئەنجامی ئەمەدا دادگا كراو دوورخرایەوە بۆ بدلیس و هەر كە گەیشتە بدلیس پەیوەندی بە جمعیتی ڕاپەڕینی كوردەوە كرد (Society For the Riseof Kurdistan)و بەپێی بڕیاری ئەو جمعیەتە ڕاپەڕینی (بیت الشباب) جێ بەجێكرا (لەبەرگی دوهەمدا باسی ڕاپەڕینەكەی بیت الشباب كراوە), بەلأم هەروەكو روبرت ئولسونیش باسیكردووە بێجگە لەو دوكیومێنتە لەهیچ سەرچاوەیەكی تردا باسی ئەو ڕاپەڕینەی أحسان نوری نەكراوە لەشاری غالیبولیدا.

احسان نوری لەسەرەتادا کە هێشتا دەستی کمالیەکان نەکەوتبووە ڕوو بەرامبەر بەکورد، وەکو هەندێ لەکوردەکانی‌تر بوبوو بەئەندامی کۆنگرەی (سیواس) کە لەبەرگی دووهەمدا باسی ئەو کۆنگرەیە کراوە، بەڵام دوای ئەوەی تورکە کمالیەکان لەبەڵێنەکانیان پاشگەزبوونەوە کە دابویان بەکورد لەساڵی ١٩٢٤دا ئیتر خۆی پێ نەگیراو ڕوویکردە بەرزاییەکان‌و هەروەکو لەبەرگی دووهەمدا لەباسی ڕووداوی (بیت الشباب)دا باسمانکردووە احسان نوری لەئەنجامی ئەو تلگرافەی یوسف ضیاء بەگ ناردبووی بۆ براکەی کە ئەمیش ئەفسەرێك بووە لەناو ئەو هێزەی احسان نوری پاشا سەرکردەی بووە، احسان نوری لەگەڵ ئەفسەرو سەربازە کوردەکانا کە روبرت ئولوف ژمارەی ئەوانەی بە (٥٠٠)کەس داناوە ڕوویانکردبووە چیاکان‌و لەحکومەت یاخی بوو.

احسان نوری لەدوای شکانی شۆڕشەکەی ئاگری داغ خۆی نەدا بەدەست تورکەکانەوەو هەروەکو لەدواییدا ڕووندەبێتەوە بەڵکو پەنا دەباتە بەر حکومەتی ئێران‌و لەوێ دەمێنێتەوە هەتا ساڵی ١٩٧٥دا موتورسایکلیك دەیکات بەژێرەوەو گیانی دەردەچێت لەکاتی پەڕینەوەیدا لەسەرجادەیەکی تاران‌و لەو ڕۆژانەدا وابڵاوبوبوەوە لەمەدا ساڤاکی ئێرانی دەستی تیادا بووەو بۆ ئەوەی احسان نوری بەشداری نەکات لەشۆڕشی ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ دا لەباشووری کوردستان کرابوو,لەتەمەنی (٨٣)ساڵیدا لەگۆڕستانی (بهشت زهراء)لەباشوری تاران دا نێژراوە.

احسان نوری پاشا لەیاداشتەکانیا بەرلەوەی بچێتە سەر باسی شۆڕشی ئارارات، باسی ئەوانەی کردووە کە هاوکارو لایەنگری شۆڕش

بـــوون و لێـــرەدا ئێمـــەش نـــاوی ئەوانـــە دەخەینـــە پـــێش چـــاو کـــە لەیاداشتەکانیا ناوی هێناون کە وتوویەتی:

((عربسـی کـە سـەرۆکی عەشـیرەتی (مکتـوری) بـوو لەناوچـەی (ئەگـدر) لـەباکوری ئاگریـدا دەژیا, لەلاپاڵەکەی تـری ئاگریدا (علوی بکـر) و (عبدالله خلف)ی سەرۆکی عەشیرەتی (قزلباش ئوغلی) کە یەکێك بوو لـەلاوە کوردە ئازاو ئازادیخوازانەی بەر لەچەند ساڵێك خۆیو عەشیرەتەکەی لەکوردستانی ئێرانـەوە هاتبوونـە کوردسـتانی تورکیـاو لەرۆژهـەلاتی ئاگریـدا نیشـتەجێ بوبـوو, هـەروەها (ئـەنوەر مـزراق) کـە لەبنەماڵـەی سـەرکردەکانی عەشـیرەتی (زیـلان) بـوو ئـەو بنەماڵەیـە هـەموویان بەشـداربوون لـەمێژەکانی ئاگریـدا هەرچەندە هەنـدێ لـەو عەشیرەتانەی لـەژوور چیاکەدا بـوون هێشتا وازیـان لەلایەنگرێتی حکومەت نەهێنابوو, بەلام ئالای کورد بەسـەر هـەموو چیاکەدا دەشەکایەوەو هیچ کاربەدەستێکی حکومەتی تورك نەیدەوێرا ڕووبکاتـە ئـەو ناوچەیە.



ئالآی کوردو دوو پێشمەرگە کە بنکەی سەرکردایەتیان لەئاگریدا دەپاراست (لەلاپەڕە (١٣٩)ی یاداشتەکەی أحسان نوری) وە لەلاپەڕە (٣٠٤)ی کتێبەکەی زنار سلوپی



**وێنەی حاجو ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی هەڤرکیو بەڕێوەبەری کاروباری ناوچەکانی مریات, میردین, شرناخ لەشۆڕشی ئاگریدا**

لەناوڕاستی هاوینی ساڵی ١٩٢٩دا (مەمۆ) و (نادر) هەردوو کوڕە ئازاکانی حسین پاشای سەرۆك عەشیرەتی (حیدری) لەگەڵ دوبرای تریان و ئامۆزایەکیان لەسوریەوە هاتنەوەو خۆیان گەیاندەوە ناو خاکی کوردستان و لەکاتی تێپەڕبوونیانا بەناوچەکانی (مدیات, بەشیری,کرزان, هەتاوی هەتاکو دوای موش)و لەوێدا پەلاماردران و سیانیان لێ شەهید بوو بەلآم (مەمۆ) و (نادر) خۆیان دەربازکردو گەیشتنە لای ئێمە)).

أحسان نوری لەلاپەڕە (٦٩)ی یاداشتەکانیا دەربارەی (کور حسین پاشا) و (حاجی موسی بەگ) وتوویەتی ((هەرچەند کور حسین پاشا لەشۆڕشی پیراندا لایەنگری حکومەت بوو, بەلآم کە شۆڕکەی پیران تەواو بوو تورکەکان وازیان لەویش نەهێناو لەگەڵ حاجی موسی بەگدا هەردوکیان ئاوارەکران بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ, بەلآم هەردوکیان بڕیاریاندا خۆیان لەشوێنی ئاوارەبوونەکەیان ڕزگار بکەن, حسین پاشا دەوڵەمەندو پارەدار بوو, ئاڵتونێکی زۆری هەبوو, توانی هەندێ ولآخ و تفەنگ بکڕێت و بیدات بەوانەی توانای چەکهەڵگرتنیان هەبوو, ژن و منداڵەکانیان لای دوو کوڕی خۆیان بەجێ هێشت و ڕویانکردە سوریاو لەوێ بوون بەمیوانی (حاجو ئاغا) کە یەکێك بوو لەسەرکردە ناسراوەکانی عەشیرەتی (هەڤرکی)و لەوێ بوون بە ئەندامی خۆیبون.

ساتێك ئەوانە گەیشتبونە سوریا بەپۆستەی ڕێکخراوی خۆیبوندا نامەیەکی ئەوانم پێگەیشت و منیش داوام لەخۆیبون کرد بیان نێرن بۆ ئاگری و ساتێك کەوتنە ڕێ بۆ ئەوەی بگەنە لای ئێمە لەڕێگەی عێراق و ئێرانەوە ئینگلیزەکان لەموصڵ گرتنیان و ناردنیانەوە بۆ سوریاو لەوێ حاجی موسی بەگ نەخۆشکەوت و لەسوریا کوچی دوایی کرد, بەلآم بەپێی

بڕیـاری خۆیبـون چـوار کـوڕو کوڕەزایـەکی حسـین پاشـا کـە لەکوردسـتانی تورکیـادا بـوون لەگـەڵ حسـین پاشـا خـۆیو (ئـەدۆ)و خوشـکەزایەکیو کوڕەزایـەکی کـە لەکوردسـتانی عێـراق بوون هـەموویان ڕویانکردە ئاگریو لەڕێگایانا تورکەکان ڕێگەیان پێگرتنو سیانیان لێ کوژرا (بەر لەمەش باسی هەمان شتی کردووە).

احسـان نـوری لەباسـی چۆنیتی چوونی کـور حسـین پاشـا بۆ ئاگریـداغ وتویـەتی کـە سـوریای بەجێهێشـت ڕویکـردە عێـراقو لـەوێ بـوو بـەمیوانی شێخ ئەحمەدی بـارزانی کـە لـەوێ (مـدنی) کوڕی حـاجی موسـی بەگیشـی لێ بوو, ساتێك ویستیان لای شێخ ئەحمەد بەجێ بێڵن (نوە بەگ) بەکور حسـین پاشا دەڵێ (مدنی) برازام حەزدەکات ئەویش بچێت بۆ ئاگری خۆزگە لەگەڵ خۆتانا بیبەن بۆ ئەوێ . حسین پاشا (مدنی) لەگەڵ خۆیدا دەیبات و لەگەڵ چەند سـوارێکدا دەکەونـە ڕێو لـەڕێگادا لەچیایەکدا (مـدنی) پلانێکـی زۆر ناجوامێرانـەو ترسـنۆکانە بـۆ کـور حسـین پاشـا ڕێـك دەخـاو حسـین پاشـاو هاوڕێکـەی کـە لەشـیرین خـەودا دەبـن هـەردوکیان دەکوژێـت و پـاش ئـەو کوشتنەی حسین پاشا (مدنی) خۆی ئەدا بەدەست تورکەکانەوە.

احسان نوری لەیاداشتەکەیدا لەسەری ئەڕوات و ئەڵێت:

((لـەدوای لێکۆڵینـەوەو چـوونە بـنج و بنـاوانی ئـەو کوشـتنە, بـۆ شـێخ ئەحمـەدی بـارزانی دەردەکـەوێ (نـوە بـەگ)ی بـرای موسـێ بـەگ دەورێکـی سەرەکیو گلاوی هەبووە بۆیە ئەو خیانەتە گەورەیـەی کردبوو لەسـەر ئەوە بڕیاری کوشتنی دەداو نایەڵێت (نوە بەگ) سوود لـەو لێخۆشبوونەی تـورك وەربگرێت کە دەریانکردبوو)).

بێجگە لەوەی احسان نوری لەیاداشتەکانیا دەربارەی شێخ ئەحمەدی بارزانی دەری کردبوو بەرامبەر (نوەبەگ) (حسین عرفە)ش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٢) باسی بەشداربوونی شێخ ئەحمەدو هاوکاریکردنی کردووە لەگەڵ شۆڕشگێڕانداو لەو ڕووەوە وتوویەتی:

((شێخ ئەحمەدی بارزانی هێزێکی (٥٠٠) سواری بەسەرۆکایەتی (فەرزەندی کوری حسین کوێر) نارد بۆ پەلاماردانی هێزێکی تورك کە لە(نورامار) بوو, بەڵام ئەو هێزە لەدوای شەڕێکی دورودرێژ کشایە دواوەو فەرزەندە کوژرا (لەڕاستیدا ئەم فەرزەندەیەی حسین عرفە لێرەدا باسی کردووە ئەو فەرزەندەیە نییە کە لەگەڵ احسان نوری پاشادا لەئارارات بووەو لەگەڵ احسان نوری پاشادا بەشداری کردووە لەو گفتوگۆیەی لەگەڵ کاربەدەستانی تورکدا کرابوو وەکو لەدوایدا لەباسی حەوتەمدا ڕوون دەبێتەوە).

احسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێت: بەو جۆرە (کور حسین پاشا) کە کاتی خۆی بوبوو بەلایەنگری حکومەت, ساتێك لەهاوینە هەواری (ئالاداخ) دەگەڕێتەوە لەڕێگایا لەچیای (تندوك) هێزێکی تورك بەرەنگاری دەبێتەوەو ئەوانەی لەگەڵیا بون بەشێکی زۆری کەل‌وپەل‌و مەڕومالاتەکانی خۆیان بەجێ هێشت‌و شێخ صالحی کوڕی شێخ عبدالقادرو شێخ یاسینی ئامۆزای کوژران‌و ئەوانەی‌تر بەشەڕەشەق خۆیان ڕزگار کردوو شێخ عبدالقادریش هیچ چاری نەما ئەویش پەنای بردەبەر شۆڕشگێڕانی ئاگری.

(سەیر ئەوەیە ئەم شێخ عبدالقادرە بەوپەڕی بێ ئابڕوییەوە, لەدوایدا کە شۆڕشی ئاگری‌داغ گەرم بوو لەنێوان شۆڕشگێڕان‌و حکومەتدا جارێکی‌تر

پەنای بردەوەبەر حکومەت وەکو لەدوایدا لەباسی دەستپێکردنی شۆڕشدا دەردەکەوێت).

احسان نوری لەلاپەڕە (٧٩)ی یاداشتە چاپکراوەکەیدا باسی ئەو شێخ عبدالقادرەی بەم جۆرە کردووە:

((لەبەهاری ١٩٣٠دا گوندەکەی شێخ عبدالقادر لەلایەن هێزی حکومەتو چەند کرێگرتەیەکی عەشیرەتی (کسکویی) بەسەرکردایەتی میر ئالای (فەرهاد بەگ) دەورەدراو ئەوانەی لەو گوندەدا بوون وەکو (تمرشملی، ئوس، فتو، چرکو، شێخ طاهر شێخ رەسولی کوڕی شێخ عبدالقادر ، علوی، ئیزیدی ئامۆزای) لەگەڵ چەند چەکدارێکی تردا بەجلی شەوەوە لەنوستندا دەستیان دایە چەکەکانیانو ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوەو (٢٠) سەربازیان بەدیل گرتو چەند مەترەلیوزیکی بچووکیشیان دەستگیر بوو.

احسان نوری دەڵێ: لەکاتی ئەم شەڕەدا منو (برۆ – کە مەبەست بروهسکی)یە لەگەڵ شێخ عبدالقادردا کەساتێك باسی ئەم شەڕەمان دەکرد، کوردێکی سەر بەحکومەت لە(ئاگری)یەوە هات بەخۆیو ئێسترەکەیەوە دوو لاشەی کوژراوی لەسەر بوو یەکێکیان لاشەی ئەفسەرێکی تورك بوو ئەوی تریان لاشەی (تمر کسکوی) بوو کە لەعەشیرەتی کسکویی کورد بوو، کاتی خۆی تمر وتبووی : من تورکمو کوڕی تورکم... بۆ وەرامی ئەو قسەیە (بروهسکی) پێی وتبوو، هیوادارم ڕۆژێك لەڕۆژان لەگەڵ برایەکی تورکتا بەجووتە پێکەوە لەیەك گۆڕدا بنێژرێن..

احسان نوری دەڵێ: کە ئەوەم هاتەوە بیر هەروەکو بروهسکی بۆی گێڕابومەوە هەردوکیانمان لەگۆڕێکدا ناشتنو ئەو دیلانەش کە نێررابوون بۆ بنکەی ئێمە، لەوێوە بەچەند پێشمەرگەیەکدا درانە دەست حکومەتی ئێران

بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەوانەوە بدرێنەوە بە حکومەت (لام وایە ئەگەر تورك دیلی وای دەست بکەوتایە هەر لەشوێنی خۆیدا دەیانکوشتن).

احسان نوری لەلاپەڕە (۲۹)ی یاداشتەکەیدا باسی چەند نیشتمان پەروەرێکی کردووە کە چووبونە پاڵ شۆڕش و وتویەتی:((ساتێك لەئاگری خەریکی ڕێکخستنی کاروباری شۆڕش بووین شۆڕشگێڕانی کورد پۆل پۆل ڕویانکردە چیای ئاگری..(فرزندەبەگ) کە لەعەشیرەتی (هسنی)بوو خۆیو کاظم بەگی برایو ئامۆزایەکیو چەند شۆڕشگێڕێکی تریئەو عەشیرەتە گەیشتنە ئاگریو بێجگە لەمانە, چەند سەرکردەیەکی تری کورد وەکو خالص بەگ کوڕی عبدالمجید بەگی سەیکی, تاج الدین لەسەرکردەکانی عەشیرەتی (زرکی), ئەدو عزیز حیدری, ئەحمەد حاجی برۆ لەگەڵ هەندێ لە براکانی, سید عبدالوهاب ئەفەندی وەسید رسول بەرزنجی ئامۆزای کە ئەمانە هەموو ئاوارەکرابوون بۆ (ازمیر) یەك لەدوای یەك خۆیان گەیاندە ئاگریو (هسکی) کرا بەوالی ئاگریو (تمرشمکی) کرا بەسەرکردەی دەرەك لەئاگری.

بەو بونەوە شۆڕشگێڕە نیشتمان پەروەرەکان سرودی ئاگرییان ووت, احسان نوری لەیاداشتەکەیدا ئەم چەند دێڕەی لەو سرودە تۆمارکردوە کە لەعەرەبیەکەوە کراوەتەوە بەکوردی.

ئەوا ئیمڕۆ دووبارە جۆشت سەندۆتەوە
کڵپەو گڕی ئاگرەکەت وەکو لووتکەی قەڵاکان بەرزو بڵندە
لەسەر لووتکەکانت کۆبوونەوەکان دەستی پێکرد
دە ئاگری کڵپە بسێنە.. کڵپە بسێنە ئاگری

بێجگە لەوانەی احسان نوری باسیکردون کە چوبونە پاڵ شۆڕش، حسن عرفەش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٢) ناوی چەند کەسێکی تری هێناوە وەکو (حسین کەوسەر، میرا، میری عبدالقادر ئابدال.

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٤٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) ناوی چەند کەسێکی هێناوە کە لەشۆڕشدا کرابوون بە کاربەدەست وەکو:

(تەیمور ئاغا- کە احسان نوری لەیاداشتەکانیا بەتمرشمکی ناوی هێناوە- کراوە بەسەرۆکی دەرەك، ملا حسین ئەفەندی کرا بە قائیمقامی کورخان، ئیبراهیم نانی – کرا بەمیری ناحیەی (بوطي)، حسن ئەفەندی – میری ناحیەی (ئورتی)، موسی ئاغا برکی بۆ ناحیەی (کوری)و عمرین ئاغا کرا بە قائیمقامی (کو ئاخان) کە ئەمانە هەموویان بەرەزامەندیی کۆمەڵی خۆیبون هەڵبژێررابوون و هەموشیان بەوپەڕی پاکیو دڵسۆزیەوە کاروباری شۆڕشیان دەبرد بەڕێوە.

زنار سلوپی (قدری جمیل بەگی دیاربەکری) لەلاپەڕە (١٤٤)ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن خۆیو هاوڕێکانی پێوەندیان بەشۆڕشگێڕانی ئاراراتەوەو بۆ بەستنی پەیوەندییەکی هەمیشەیی چۆن بڕیاریاندابوو ( z)بەگ دیارە نەیویستووە ناوە ڕاستەیەکەی باس بکات) بنێرن بۆلای شۆڕشگێڕان لەئارارات بەلاَم ئەو نوێنەرەیان لەسەر شاخی (تالوری) لەوڵاخەکەی دەکەوێتە خوارەوەو قاچی دەشکێو پەکی دەکەوێت و ناتوانێت بگاتە شوێنی مەبەست و لەجیاتی ئەو (جرجیس زادە.م.ئەفەندی) دەنێرن و دەگەڕێتەوەنەخشەو پلانەکانی شۆڕش لەگەڵ خۆیا دەهێنێت، اکرمی جمیل بەگ (برای قدری بوە) لەزیندانی دیاربکر بەربوبوو بۆیە هەمووما لەژێر چاودێری کاربەدەستانی حکومەتدا بوین

بۆیــه بڕیارمانــدا هــەموو مــاڵو موڵكمــان بــەجێ بــێڵینو لــەتوركیا دوربكەوینــەوەو چــووینه پــاڵ كۆمــەڵی خۆیبــونو كۆمــەڵیش بــەدڵێكی فراوانــەوه ســنگی بــۆ كردینــەوەو مــنو اكرمــی بــرام كــراین بەئەنــدامی لیژنەی مەركەزی.

دەربارەی هەڵوێستی حكومەت بەرامبەر بەو چالاكی جمو جووڵانەی شۆڕشــگێڕان, دوكتــور عزیــز شمزینــی لەكتێبەكەیــدا سەرچــاوه (٤٢)وتوویــەتی بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی شۆڕشــگێڕان حكومــەتی تــورك لەسالی ١٩٢٨دا نەخشەیەكی تازەی كێشا, بەپێی ئەم نەخشه تازەیه وڵات كــرا بەچــوار ناوچــەی ســوپایی كــه بەهەریــەكێكیان دەوتــرا (مفتشیەتی گشتی)و هەر ناوچەیه ئەم دەسەڵاتەی خوارەوەی پێدرابوو.

١- ناوچەی یەكەم (مفتشیەتی گشتی یەكەم) بریتی بوه لەمەڵبەندی دیــاربكر كــه هــەموو ناوچــه كوردنشــینەكانی (دیــاربكرو بــدلیسو وان, هەكاری, موش, ماردین, ئورفه, سعرت)ی دەگرتەوەو بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ناوچەیه(ئیبراهیم تالی) كه یەكێك بووه لەدۆستە نزیكەكانی مصطفی كمالو لەگەڵیا وهبی (والی سیواس) و (ئابدین ئوزمان) و (عونی دوغمان) كران بەكاربەدەستو بەڕێوەبەرانی ناوچەكە.

٢- مفتەشیتەی گشتی دوهەم – مەركزەكەی (تراكیا)بوو.

٣- مفتەشیەتی گشتی سێهەم –مەركەزەكەی (ئەرزروم) بوو.

٤- مفتەشیەتی گشتی چوارەم – مەركەزەكەی (ئەلازیك) بوو كه هەموو ناوچەكانی (ئەلازیك, درسیم, نبگول)ی دەگرتەوه.

## باسی حەوتەم

## تەقەلای درۆی تورک بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شۆڕشگێڕان

ساتێك تورکەکان هەستیان بەو جموجوڵەی کورد کردو هەواڵی چالاکیەکانی خۆیبوون و دامەزراندنی دەزگاو کاروبارەکانی شۆڕشگێڕەکانیان پێ گەیشت کە بەسەرکردایەتی احسان نوری لەئاراراتدا کرابوو، بەنیازی ساردکردنەوەی شۆڕشگێڕان و بۆ تێکدانی ڕیزەکانیان و بۆ لەخشتەبردنیان بەدرۆ جۆرە لێخۆشبونێکیان دەرکردو تەقەلایان دا بۆ کات بردنەسەرو بۆ خەڵەتاندنی کورد جۆرە لێخۆشبونێکیان بلاوکردەوەو داوای گفتوگۆکردنیان کرد لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا (ئەوەی شایانی باسە بەر لەمە لەباسی پێنجەمدا بەیانێکی خۆیبونمان بلاوکردەوە کە لەسەرچاوە (٤٠)دا کراوە بەعەرەبی و لەو بەیانەی خۆیبوندا بەدووردرێژ باسی دووڕوویی و فڕوفێڵەکانی تورکی تیادا کراوە).

کریس کوچرا لەلاپەڕە (٤٦٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) دەربارەی فروفێڵ و درۆو دەلەسەکانی کاربەدەستانی تورك و دەستبڕینی کورد وتوویەتی:

((تورکەکان لەساڵی ١٩٢٨دا بۆ ئەوە دەگەڕان لەهەل ومەرجێکی باش و لەباردا کوردەکان بخەڵەتێنن بەگفتوگۆکردن بەنیازی لێخۆشبوونی کوردو لەپێشدا خۆیان وانیشان ئەدا کە نیازیان وایە یاسایەك دەرکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری اعدامکردن و دەشیانەوێ یاسای لێخۆشبوونێکی گشتی بۆ کورد دەربکەن و ڕێگەبدرێت لەماوەی سێ مانگدا ئاوارەبووەکان بگەڕێنەوە شوێن و ناوچەکانی خۆیان و بۆ ئەو مەبەستە والی (بایزید) یان ڕاسپارد لەگەڵ سەرکردەکانی کوردا دەست بکات بەگفتوگۆکردن و والیش نامەیەکی نارد بۆ (هسکی تیللو) وەتێی گەیاند ئەو ڕاپەڕین و جم وجوڵەی ئەوان دەستیان پێکردووە شتێکی بێ هودەو کارێکی سەرنەکەوتووەو ڕەفتارێکی ژیرانە نییەو خوێندەوارەکانتان زۆر باش شارەزای ئەوەن حکومەتی تورك ماوەی (٦٠٠)ساڵە هەیەو هەر دەمێنێت و بەئێوە لەناوناچێت و بۆیە لێتان دەپرسم: ئایا ئەو هەزاران کەسەی تائێستا بەکوشت درابوون چ ئەنجامێکی هەبووەو ئایا هیچ سەرکەوتنێکتان لێی دەستگیر بووە؟!

حکومەت دەیەوێ فەرمانی لێخۆشبوون دەربکات و پێویستە لەسەر ئێوەش بەباشی بەپیر ئەو لێخۆشبوونەوە بچن ومن گلەییەکی زۆرم لە احسان نوری هەیە کە چۆن ئەفسەرێکی وەکو ئەو لەو پلەو پایەدا ئەبێ هەڵوێستی وابێت؟!

کریس کوچرا لەوەرامی ئەو نامەیەی والی بایزیددا ئاماژەی بۆ ئەو نامەیە کردووە کە (هسکی تیللی) لەنامەکەیدا زۆر جوامێرانەو پشت ئەستورانە بووە بەبیرو باوەڕی شۆڕشگێڕان و پێی وتووە:

((ئەگەر حکومەت نیازی پاکەو بەڕاستی دەیەوێ فەرمانی لێخۆشبوون دەربکات پێویستە بەر لەهەموو شتێك فەرمانێکی گشتی

دەربکـات بەمـەرجێك سەرانسـەری کوردسـتان بگرێتـەوە کـە لەگـەڵ پێداویسـتیەکان و بـارودۆخی ئـەم ڕۆژانـەدا بگونجێـت و ئەگـەر فەرمانەکەتان بەشێوەیەك بێت کە بڵێن فەرمانەکەتان بۆ لێخۆشبوونی چەند کەسێکی کێوی و وەحشی دەردەچێت, لام وایە دەرنەچونەکەی باشتربێت و هیچ کەسێکیش بەو جۆرە لێخۆشبوونە قایل نابێت و وا لەکورد دەگەیەنێت مەبەست لەدەرچونی تەنها بریتییە لەفریودان و دەستبڕین.

کورد شارەزاییەکی باشی هەیە دەربارەی نیازو مەبەستەکانتان و باش لەدەمارتان گەیوەو کەسیش خۆی بەکێوی نەزان ناژمێرێت, بەڵام بەداخەوە هەتا ئێستە کاربەدەستانی ئێوە لەو ڕاستی‌یە نەگەیشتوون!!

ئەگەر نیازتان باشەو دەتانەوێ فەرمانی لێخۆشبوونی وا دەربکەن ئایا هۆی چی‌بووە هەتا ئیستە ئەو هەموو خاووخێزان و ماڵ و منداڵانەی دوورتان خستونەتەوە ڕێگەی گەڕانەوەیانتان نەداوە؟! ئایا تاوانی ئەو دوورخراوانە چی‌بووە کە ئەمە دوو ساڵە ئاوارەو سەرگەردان کراون؟

(دەربارەی ئەو لێخۆشبوونەی لێرەدا باسکراوە لەباسی پێنجەمدا — لەباسی چاپەمەنیەکانی خۆیبووندا — بەیانێکی خۆیبوونمان بەکوردی بڵاوکردۆتەوە کە لەسەرچاوە(٤٠)دا بەعەرەبی بڵاوکرابووەوە لەوەدا باسی درۆو دەلەسەی تورك و فڕوفێڵەکانی کراوەو پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە).

کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا باسی هەوڵ و تەقەلادانی تورکی کردووە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شۆڕشگێڕانداو بۆ ئەو مەبەستە وەفدێکی ناردبوو کە لەنوێنەرێکی ئەنقەرەو حاکمی (قرەکلیسا) کە فەرماندەی هێزی (٢٩)ش بوو لەگەڵ قایمقامی ناوچەی (دیاردین و بایزید)و لەگەڵ ئیحسان نوریدا

لە(شیخلی کوپروو) کە (٣٠)کیلۆمەتر دوور بوو لە بایەزید لەڕۆژهەڵاتی ئاراراتدا کۆبوونەوە لەناوەراستی مانگی سبتمبری ساڵە ١٩٢٨دا, ئیحسان نوری (٦٠)سواری لەگەڵ خۆیدا بردبوو, هەر لەو کۆبوونەوەیەدا فەرمان بۆ ئیحسان نوری و هاوڕێکانی دەرچوو, وەفدەکە بە ئیحسان نوریان ڕاگەیاند کە حکومەت ئامادەیە بیکات بە ملحقی سوپایی لەیەکێك لەولاتەکانی ئەوروپادا کەخۆی شوێنەکە هەڵبژێرێت.

وەکو کریس کوچرا باسیکردووە ئەنجامی ئەو گفت‌وگۆ کردنە بێ ئەنجام بووە چونکە کوردەکان بەقسەکانی ئەندامەکانی حکومەت قایل نەبوون‌و لێی دڵنیا نەبوون.

دەربارەی ئەو گفتوگۆکردنەی کریس کوچرا لێی دوواوە, دوکتۆر عزیز شمزینی لەلاپەڕە (٨٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٢) باسی ئەوەی کردووە کە حکومەتی تورکیا لەسەرەتادا بۆی دەرکەوتبوو بەئاسانی بەشەڕ پەلاماردان شۆڕشەکەی کوردی پێ لەناو نابرێت بۆیە دەستیکرد بەفرۆفێڵکردن‌و داوای لە ئیحسان نوری کرد کە لەمانگی ئەیلولی (١٩٢٨)دا لە (شکلی کوپرو – وەکو بەرلەمە باسی ئەو شوێنە کراوە کریس کوچرا بە شیخلی کوپرو ناوی بردووە)و ساتێك ئیحسان نوری لەگەڵ ئەو وەفدە تورکیەی نێررابوو دەستی کردبوو بە گفتوگۆ کردن بەئاشکرا بۆی دەرکەوتبوو تورکەکان نەیان ویستبوو باسی چۆنێتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردو داخوازیەکانی میللەتی کورد بکەن‌و بەڵێنەکانیان بۆ کورد بریتی بووە لە لێخۆشبونێکی گشتی‌و بەجێهێنانی داخوازیەکانی تایبەت ئیحسان نوری‌و بەهیچ شێوەیەك بەلای چارەسەرکردنێکی بنەڕەتی تەواوی میللەتی کوردیان نەکردبوو بۆیە ئەو چوون‌و گفتوگۆ کردنە هیچ سودێکی نەبوو, دوای ئەوە حکومەت دەستی کردەوە بەهەمان ڕەفتاری جارانی.

بەڵام قدری جمیل بەگ لەلاپەڕە (١٤٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) کە وەکو بەرلەمە باسکراوە ئەندامی لیژنەی ناوەندی خۆیبوون بووە, دەربارەی ئەو تەقەلادانەی تورك بۆ ساردکردنەوەی کورد لەو نیازەی بڕیاریان لەسەردابوو وتویەتی: ئیحسان نوری لەگفتوگۆکردنەکەیدا ویستی ڕاستی نیازی تورکەکان تاقی بکاتەوە بۆیە چووە ئەو شوێنەی بۆ گفتوگۆکردن دەستنیشان کرابوو وەلە(پردی شیخلی) چاوی بەنوێنەری حکومەت کەوتووهەولّیدا بزانێت ئایا تورکەکان بەڕاستی بڕیاری گەڕانەوەی ئاوارەکان دەدەن‌و ئەو ماڵ‌و موڵکەی لێیان زەوت کرابوو هەموویان پێ ئەدرێتەوە یانا؟ بەڵام دەرکەوت نیازیان پاك نەبوو, ئەوەش کە عیصمەت ئینونو لەوتارێکیدا ڕایگەیاندبوو کە پێویستە بەیانی لێخۆشبوون دەربچێت‌و سەربگرێت بۆ ئەوەی کێشەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات چارەسەربکرێت هەرشێوەیەك بوو لەزنجیرەی فرتوفێڵی تورکەکان.

لەدوای بۆچوونی نوسەرانی ئەو سەرچاوانەی باسمانکرد, بابزانین ئیحسان نوری پاشای سەرکردەی هێزەکانی شۆڕشی ئارارات خۆی لەیاداشتەکانیا دەربارەی ئەو گفتوگۆکردنە چی وتووەو لەلاپەڕە (٣٩) یاداشتەکەیدا وتوویەتی:

(کە لەهاوینەهەواری (زوزان) بووین, سەرکردەی هێزی جەندرمەی تورك (عارف حکمت) داوای لێکردین چاومان بەیەکتری بکەوێت‌و ساتێك یەکترمان بینی وێنەی (پاشارخانم)ی خێزانمی بۆ هێنام کە ئەو وێنەیە کاتی خۆی لە (بایزید) گیرابوو.

عارف حکمت پێی وتم تاقمێك له ئەنقەرەوە دێن و حەزئەکەن چاویان پێت بکەوێت و ڕۆژی دوایی سەعات (٨) لەگەڵیا لەو شوێنەی دەستنیشانکرابوو یەکترمان بینی و وەفدەکەی ئێمە بریتی بوو لەخۆم و چەند سەرۆکێکی کورد لەگەڵ (٢٠)سواری ئازاو دلێری شارەزاو دنیادیدەو تورکەکانیش بە دوو ئۆتۆمبیل هاتن و دە سەربازیان لەگەڵ بوو, لەناو تاقمەکەی تورکدا دوو نوێنەری ئەنجومەنی میللی تورکی تیابوو کە یەکێکیان نوێنەری ئەستەمبوڵ بوو ئەوی تریان نوێنەری شاری (بایزید) بوو لەگەڵ سەرکردەی هێزی (قەرەکوسە)و چەند ئەفسەرو جەندرمەیەکیش.

پێشنیازەکانی کوردەکان لەگفتوگۆکردندا بریتی بوون لە:

١- گەڕانەوەی هێمنی و ئاسایش بۆ ناوچەی ئاگری.

٢- وازهێنان لەڕێگا گرتن و کاولکردن.

٣- گەڕانەوەی مەڕومالأتی بازرگانەکان (جەلەبچی) بۆ خاوەنەکانیان.

٤- ئیحسان نوری ئاگری بەجێ بێڵێت و بەهەر شێوەیەك خۆی بەباشی بزانێت بکرێت بە ملحقی سوپایی.

بەرامبەر بەمانەش بڕیاری لێخۆشبوون دەردەچێت بۆ ئەو هەموو کاولکارییانەی لەئاراراتیەکان کراوەو حکومەت هەموو جۆرە یارمەتی‌یەکیان دەدات بۆ ئەو مەبەستەو دڵنیایان دەکات لەبەجێ‌هێنانی ئەم بەڵێنەدا.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا دەڵێت:

منیش ئەمانەم هیچی قبووڵ نەکردوو بۆ وەرامی ئەو قبووڵ نەکردنە پێیان وتم: بگەڕێرەوە بۆ وڵاتەکەت و حکومەت ئامادەیە هەرچیت پێویست

بێت بۆ دابینکردنی ژیانێکی ئاسوودەیی خۆت هەموویت بۆ جێ بەجێ دەکات...

لەوەرامی ئەمەدا پێم وتن: من ئێستە لەولاتی خۆمدام و پێویستیشم بەهیچ شتێکی تایبەتی نییە بۆ خۆم چونکە لەڕاستیدا باوەڕم بەهیچ بەڵێنێکی دەوڵەتەکەتان نیە..

دووبارە پێیان وتمەوە تۆ چ دەوڵەتێك هەڵدەبژێریت بۆ ئەوەی تیایا بژیت ئامادەین لەو ولاتەدا کارێکت پێ بسپێرین و مووچەشت بۆ دەبڕینەوە..

دووبارە لەوەرامدا پێم وتن: نامەوێ ناوم لەپاڵ ناوی دەوڵەتەکەتاندا بێت...

وتیان ئامادەین پەساپۆرتێکی وات بۆ سازبکەین بۆ ئەوەی بەو پەساپۆرتە بچیتە هەر شوێنێك کە بەدڵت بێت و قونسوڵەکەمان لەتەورێز رادەسپێرین ئەو جۆرە پەساپۆرتەتان بۆ ئامادەبکات.

لەوەرامی ئەو پێشنیازەیانا پێم وتن: بەخۆڕایی خۆتان لەگەڵ مندا ماندوو مەکەن چونکە ناچم بۆ هیچ شوێنێك و من نۆکەری میللەتی کوردم و تەنها هەر ئەوان دەسەلاتی ئەوەیان هەیە هەرچیم پێ ڕاسپێرن بەجێی بهێنم و بەپێی بڕیاری ئەوان دەڕۆم بەڕێوەو ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن وەرامی ئەو ئالأیەی کورد بدەنەوە کە بەسەر لوتکەی چیای ئاگریدا دەشەکێتەوەو حکومەت بەچاوی خۆی دەیبینێت.

دەربارەی ئەو مەڕومالأتانەش کە لەبازرگانەکان سێنرابوون، باسی ئەوە لەگەڵ (فرزەندە بەگ) و (خالص بەگ)دا بکەن و لەوان بپرسن.

ساتێك یەكێك لەنوێنەرانی وەفدەكەی تورك ڕوویكردە فرزندەبەگو پێی ووت: هەتا ئەو مەڕو ماڵاتانە نەدرێتەوە دەست خاوەنەكانیان حكومەت لەتۆ خۆش نابێتو فرزندەش پێی ووت: ئێمەش داوای لێخۆشبوونمان لەحكومەت نەكردووەو پێویستیشمان بە لێخۆشبوونی ئێوە نیە.

ئیحسان نوری لەیاداشتەكەیدا لەسەری ئەڕواتو دەڵێت:

بێگومان توركەكان لەمەبەستی ئێمە باش تێگەیشتبوون كە بریتی بوو لە دوو وشە:

(سەربەستی بۆ كوردستان) كە هەڵكردنی ئالأی سێ ڕەنگی كورد نیشانەی ئەو داخوازییەی میللەت بوو.

ئەوەی هەردوولامان لەسەری ڕێككەوتین تەنها بریتی بوو لەوەی هێزەكانمان لەئاگری وازبێنن لەهێرش بردن بۆسەر (بایزید)و بەرامبەر بەحكومەتیش هێزی خۆی نەنێرێت بۆسەر ئاگری.

ئەفسەرێكی توركی وەفدەكە پێی وتم: چ ڕاسپاردەیەكت هەیە بۆت جێ بەجێ بكەین؟ لەوەرامدا پێم ووت: ڕێگە بەخێزانەكەم بدەن بچێت بۆ حلب.

ئیحسان نوری لێرەدا لەیاداشتەكانیا دەچێتەوە سەر باسی ئەو شێخ عبدالقادرەی لەباسی شەشەمدا وترابوو شێخ عبدولقادر كاتی خۆی ناچاركرابوو لەلایەن توركەكانەوە كە پەنا بەرێتە لای شۆڕشگێڕانو ئەوانیش بەسنگێكی فراوانەوە قبوڵیان كردبوو گرتبویانە خۆیان، بەڵام ئالەم كاتەدا دووبارە بایدایەوەو چووەوە ژێر سایەی حكومەتو بەمەشەوە نەوەستا بەڵكو چەكدارەكانی خۆی نارد بۆ بەرەنگاربوونی هێزەكەی (علوبشۆ)، بەڵام ئێمە فریای علو بشۆ كەوتینو چەكدارەكانی شێخ عبدالقادرمان ناچاركرد پاشەكشە بكات.

دانیشـتوانی گونـدی (کـانی کـورك) کـه گوندەکـەیان وێرانکرابـوو داوایـان لـه حکومـەت کـرد گوندەکـەیان بـۆ ئـاوەدان بکرێتـەوەو پـاش ئاوەدانکردنـەوەی چـەند کۆبوونەوەیـەکی دۆسـتانەی تیـادا کـرا لـەنێوان سەرکردەکانی کوردو ئەفسەرەکانی تورك لەبایزیدو (حمید ئیسماعیل) که گەورە پیاوی گوندەکە بوو میواندارێتی ئەو ئەفسەرانەی کرد.

دوای ماوەیـەك لەڕێگـەی والیـی بایزیـدەوە ئاگـادارکرام خێزانەکـەم گەیشتبووە سوریا. لەسەر داخوازیی تورك چەند لێپرسراوێکی حکومەت لەبایزید کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ سەرکردەکانی کوردا کرد له گوندی (کانی کـورك)و لـەم کۆبونەوەیـەدا تورکـەکان هەنـدێ لـەو سـەرۆکە کوردانەشـیان هێنـابوو لەگـەڵ خۆیانـا کـه سـەربەحکومەت بـوون, یـەکێك لەوانـه (تـەیمور کسکوی) بوو که سەرۆك عەشیرەتی کسکوی بوو که کاتی خۆی وتبووی من تورکم که بەو قسانەی دەیویست مەرایی بۆ تورکەکان بکات.

(لەباسی شەشەمدا باسی چۆنێتی کوشتنی ئەم تـەیمورە کراوە کە چۆن لەگەڵ تورکێکدا نێژرابوو لەسەر داخوازی (بروهسکی- هسکی تیللی) که دیاره ئـەو کوشـتنەی لـەو بەشـی شەشـەمەدا کـراوە دوای ئـەم کۆبوونەوەیـه بووە که ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا باسیکردووە).

لـەدوای ئـەو گفتوگـۆ سـەرنەکەوتوانە, زۆری پـێ نەچـوو ڕوداوێـك هاتـه کایـەوە کـه بەتـەواوەتی دەستی تورکـەکانی خسـته ڕوو, وه ئاشـکرای کـرد چۆن هەر لەسـەرەتاوە نیازیـان پاك نـەبووەو ئیحسـان نـوری لەلاپـەڕە (٤٣)ی یاداشتەکانیا باسی نەخشـەی تورکـەکانی کـردووە لـەو شـەڕەدا کە لـه(کـانی کـورك) ڕوویـداوە, کـه لەباسـی داهـاتوودا بەدووروودرێـژ باسـی ئـەو شـەڕەی کانی کورك دەکرێت.

## باسی هەشتەم

# ڕووبەڕوو بوونەوەو شەڕە گرنگەکانی شۆڕشی ئاگریداغ

لەدوای سەرنەگرتنی ئەو گفتوگۆیانەی لەنێوان کاربەدەستانی حکومەت و سەرکردایەتی هێزەکانی ئاگریداغدا, حکومەت بەر لەو گفتوگۆکردنانە نەخشەی خۆی کێشابوو بۆ لێدانی هێزەکانی کورد لەئارارات و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەنیازی حکومەتی تورک گەیشتبوو دەیزانی بەلەناوبردنی کورد نەبێت وازناهێنێت لەبەرئەوە بڕیاری شۆڕش بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی حکومەت و پارێزگاردن لەخۆ شتێك نەبوو حسابی بۆ نەکرابێت, بۆیە زۆری پێ نەچوو لەنێوان هەردوولادا شەڕوپێکادان دەستی پێکرد.

ئەو سەرچاوانەی دەربارەی شۆڕشکە دواون زوربەیان باسی چمکێکی شۆڕشەکەیان کردووە جگە لە ئیحسان نوری پاشای سەرکردەی هێزەکانی ئاگری کە لەیاداشتەکانیا بەدووروودرێژ باسی شەڕەکانی کردووە ئەگەرچی ئیحسان نوریو چ نووسەری سەرچاوەکان باسی ڕوداوەکانیان بەشێوەیەکی بچڕبچڕو بەزنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك تۆمارنەکردووەو ئیحسان نوری

خۆی لەدوایدا کە پەناهەندە بوو لەتاران دەستیکردووە بەتۆمارکردنی ڕووداوو بەسەرهاتەکان وەکو لەبیری مابێت بۆیە نەیتوانیوە لەو درەنگ وەختەدا باسی ڕووداوەکان بەپێی کاتیان تۆماربکات هەروەکو لەیاداشتەکانیا ڕوون دەبێتەوە, بێجگە لەئیحسان نوری ئەو کوردانەی تریش کەخۆیان ئەندامی خۆیبون بوونو هەندێکیان لەکۆڕی شەڕەکاندا ئاگاداری ڕووداوەکان بوون وەکو سریا بدرخانو جلادت بدرخانو قدری جمیل بەگ (زنار سلوپی) ئەوانیش باسەکانیان بەشێوەیەکی بچڕبچڕو لێک دابڕاو تۆمارکردووەو لەکتێبەکانیانا بلاویانکردۆتەوە لەبەرئەوە ناچارین کورتەو پوختەی ئەو سەرچاوانە کە نوسەرەکانیان چۆنیان باسکردووە بیانخەینە پێش چاوی خوێنەوارانی بەڕێز.

کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) هەستی بەم کەموکوڕییە کردووەو ڕەخنەی لەبەشداربووانی شۆڕشی ئاگریو ئەوانەی ئاگاداری ئەو شۆڕشە بوون گرتووە کە هیچ بایەخیان نەداوە بەتۆمارکردنی ئەم شۆڕشە مەزنەی کورد بەپێی زنجیرەی ڕووداوو بەسەرهاتەکان کەوا دیارە ئەمیش وەکو ئەم باسەی من تووشی ئەو ڕاستییە بووە بۆیە ناچاربووە باسەکەی لەژێر تیشکی ئەو سەرچاوانەدا بنوسێت کە بەشێوەیەکی بچڕبچڕو لێک دابڕاو باسەکانیان تۆمارکردووەو لەدوایدا لەکتێبەکانیانا بلاویان کردۆتەوە.

لەباسی چۆنێتی ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی کورد لەگەڵ هێزەکانی سوپای تورکدا هەوڵ ئەدەین کورتەیەکی سەرچاوەکان باس بکەینو بەیاداشتە دوورودرێژەکەی ئیحسان نوری پاشا کۆتایی پێ بهێنین کەچۆن

ئەنجامی شۆڕشەکە بەوە گەیشت وەکو شۆڕشەکانی تری بەرلەخۆی لەلایەن حکومەتی تورکەوە لەناوببرێت.

دوکتور عزیز شمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٢) لەلاپەڕە (٩١)یدا وتوویەتی:

((لەدوای سەرنەگرتنی گفتوگۆکانی نێوان کاربەدەستانی تورك و سەرکردایەتی هێزەکانی کورد لەئاگریداغ، سوپای تورك هێرشی کردە سەر هێزەکانی پێشمەرگە کە بەسەرکردایەتی ئیحسان نوری و فرزندەو چەند دلێرێکی تر بون و لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەدا هەروەکو (ڕامبۆ) لەکتێبەکەیدا (کوردو یاسا) چاپی پاریس ساڵی (١٩٤٧)دا باسی کردووە، هەرچەند هێزەکان و سوپای تورك باڵا دەست بوون بەڵام پێشمەرگەکان (١٧٠٠) سەربازیان بەدیل گرت لەگەڵ (٦٠)تفەنگ و (٢٤) هاون و (١٢)فڕۆکەی تورکیش خرایە خوارەوە.

بەداخەوە دوکتۆر شمزینی باسی شوێنی ئەو شۆڕشەی نەکردووە کە ئەو ژمارانەی بۆباسکردووە بۆ ئەوەی بەراوردیان بکەم لەگەڵ سەرچاوەکانی تردا، بەڵام ئەگەر ئەم شەڕە ئەوە بێت کە جلادت بدرخان و زنار سلوپی و سریا بدرخان باسیانکردووە کە باسی هەرسێکیان دەکەین ئەو ژمارانەی (ڕامبۆ) باسی کردووەو دوکتۆر شمزینی ئاماژەی بۆ کردووە لەگەڵ ئەوەی ئەمان باسیانکردووە یەك ناگرێتەوە، بێجگە لەمە لەوەی دوکتۆر شمزینیدا وتراوە شۆڕشگێڕانی کورد (١٧٠٠)تورکیان بەدیل گرتووە کەچی لەباسی چەکەکانیانا باسی (٨٤)چەکی کردووە... تۆ بڵێی چەکی ئەوانیتر دەست کورد نەکەوتبێت؟

جلادت بدرخان لەلاپەڕە (١١١)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٦٠)باسی شەڕێکی کردووە کە لەمانگی نیسانی (١٩٣٠)دا تورکەکان هەتا(٥)ی یۆنیۆی هەمان ساڵ یەك لەدوای یەك پەلاماری هێزەکانی کوردیانداو هەوڵێکی زۆریاندا بەزوترین کات کۆتایی بەو شەڕە بهێنرێت بۆ ئەوەی بلاۆنەبێتەوە لەشوێنەکانی ترداو هەرچی جموجدوڵی هێزەکانی سوپایان بوو هەموویان لەخەڵك شاردبووەوەو باسیان نەدەکرد. تالە(١١/ یونیۆ/١٩٣٠)دا پەلاماری ئاگریداغیانداو گەیشتنە شوێنە سەختەکانو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەناو دارستانە چڕەکانا خۆیان حەشاردا, بەلاّم کاتێك بەخۆیان زانی لە(ئیغدیر)و (تندرك)ەوە ئابلۆقەدرابونو ڕێگەی (ئەرجیش, وان, بدلیسو چیای سبحان)یان لێگیرابوو توانای ئەوەیان نەبوو بەرەو پێشەوە بچنو ناچاربوون تەنها هەر بەرگری لەخۆیان بکەنو شەڕ لەنێوانی هەردوولادا لە (١٢/یونیۆ/هەتا ١٣/یولیو) درێژەی کێشاو لەم شەڕەدا چەند هەزارێك کوژراووبریندار هەبوو لەگەڵ خستنەخوارەوەی (١٢)فڕۆکەو گرتنی (٦٠)تۆپو (٥٠)مەترەلیۆزو (٦٠)هەزار فیشەكو (١٥٠)چادرو (٣)هەزار تفەنگ لەگەڵ (٤٠)بار جبەخانەو پتر لە هەزار سەربازی تورك کۆڕی شەڕیان بەجێهێشتو ڕایانکردو تەنها فەیلەقی حەوتەمو هەشتەم مانەوە لەگەڵ پەڕاگەندەی چەند فەیلەقێکی‌تر.

لەئەنجامی ئەم شکانەدا حکومەت دەستی کرد بەگرتنی موالیدی (١٩٠١ هەتا ١٩٠٥) و هێرشەکەیان وەستانو دوایان خست بۆ سەرەتای مانگی (دیسمبری /١٩٣٠).

لەپاش ئەو هەموو ڕووداوو کوشتارانە ئیتر حکومەت نەیتوانی تاسەر دەنگوباسو هەواڵی شەڕەکان بشارێتەوە چونکە خەڵك بۆیان دەرکەوتبوو

گرتنی ئەو هەموو مواليدانە بەسەرباز شتێکی خۆڕایی نەبوو, بەتایبەتی گرتن‌و ناردنی سەرباز بۆ بنکەکانی سوپای حکومەت پارەیەکی زۆری دەویست لەکاتێکدا باری ئابووری وڵات لەوپەڕی پلەی نزمیدا بووە.

حکومەت بۆ هێورکردنەوەی ئەو ناڕەزاییەی لەگرتنی ئەو مواليدانەوە پەیدا بووبوو کەزۆربەیان ناچاردەکران خاووخێزانیان بەجێ بێڵن بەیانێکی دەرکرد بۆ کەمکردنەوەو قەوارەی کێشی ئەو هێزی پێشمەرگانەی کورد کە بەچەتەو ڕێگر ناوی بردبوون‌و وتبووی ئەوانە لەئێرانەوە بۆ دەستدرێژیکردن‌و ڕاووڕووت هاتبوون.

پاش ئەوەی شەڕەکە تەواو گەرم بوو حکومەت بەیانێکی تری بڵاوکردەوە ئەم جارە وتبووی: هەندێ مرۆڤی نەزان‌و خەڵەتێنراو, بەهاندانی ئەوانەی دژی جمهوریەتن‌و دژی هەموو جۆرە گۆڕانکارییەکن کە وڵات بەرەو پێشکەوتنی شارستانی دەبات جموجوڵێکی کۆنەپەرستانەیان دەستپێکردووەو حکومەت بڕیاری داوە لەناویان ببات. پاش ئەم بەیانەش, ساتێك هەواڵی ئەو هەموو زیانانەی لەحکومەت کەوتبوو بڵاوبووەوە ناچار حکومەت دانی بەوەدا نا کە یاخی بووەکانی کورد لەو شەڕەیانا دژی حکومەت دەیکەن هەموو جۆرە چەکێکیان هەیەو بەکاریان دەهێنن لەژێر سەرکردایەتی (خۆیبون)داو ئینگلیزو فەرنسیەکان بەوە تاوانبار کردبوو کە هانی کورد ئەدەن یارمەتی ئەو جموجوڵەی باکوور بدەن.

دەربارەی ئەو ڕوداوانەی جەلادت بەدرخان باسیکردووە,. سریا بەدرخانیش لەلاپەڕە (٥٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٧٩)تەنها باسی سەرەتای شەڕەکانی کردووە لەساڵانی (١٩٢٧ و ١٩٢٨)داو وتوویەتی:

((لەو شەڕەی لەنێوان شۆڕشگێڕانی کوردو هێزەکانی حکومەتی تورکدا ڕوویدا پێشمەرگەکانی ئاگریداغ توانیبویان (١٥)کەس لەسەرکردەکانی سوپای حکومەتو (٨٠٠)سەرباز بەدیل بگرنو (٢٠٠)تفەنگو (٣٠٠)گوللە تۆپیان دەستگیر بوو.

لەشەڕێکی تریشدا کە لە(دیسمبر/ ١٩٢٧)دا ڕوویدا لەفەوجێکی فرقەی نۆدا کە لەسنووری قەفقاسەوە هێنرابوو چوار ئەفسەری تورک کوژراو چەند سەربازێکیش بەدیل گیرانو (٢)تۆپو (١٥)ڕەشاشو گەلێك جبەخانە دەست شۆڕش کەوت (باسی زیانی شۆڕشگێڕانی نەکردووە).

دوابەدوای ئەمە لە(١٩٢٨/١/٣١) دا هێزی پێشمەرگە ڕێگەی (موتکی – بدلیس)ی گرت وەلەگەڵ چەند بەتالیۆنێکی تورکدا کە لە(موش)و ( karo killse) و (وان)دا بوون بەرەنگاری یەکتر بوونەوەو لەشەڕێکی سێ ڕۆژیدا کەلە (dell- tash)دا لەگەروی بدلیسد ڕوویدا کوردەکان سەرکەوتنو هێزی تورك کشایە دواوە پاش ئەوەی (٤٠٠)کوژراوو بریندداریان هەبوو کە لەناویانا (١٥) ئەفسەر بوو جگە لە تۆپو ڕەشاشو چەکی سوكو جبەخانە کە دەستگیری شۆڕشگێڕان بوو.

لە (١٩٢٨/٢/٢٤)دا سربیکی فرۆکەی تورك هەوڵیدا بۆردومانی بنکەی شۆڕشگێڕان بکات لەئاگریداو دوو فڕۆکەیان لێ خرایە خوارەوەو لە(١٩٢٨/٣/٢٤)دا هێزێکی کورد بەرەنگاری فوجی ژمارە (٩)ی تورك بووەوە لەناوچەی (بایزید)دا لەنێوان (تاپانلیو kaya burun)و لەدوای شەڕێکی سەختی دووڕۆژە تورکەکان هێزەکەی خۆیان کێشایە دواوە بۆ (zangzon زەنگ زوون) کە پازدە کیلۆمەتر لەبایزیدەوە دوور بوو.

لە(٣/سبتمبر/١٩٢٨)دا لەشەڕێکی تری درێژخایەندا کورد توانی فەوجێکی جندرمەی تورك لەناوچەی (جولەمیرگ)دا لەناو ببات و والیی بایزید لەناو گیراوەکاندا بوو ئیعدام کرا.

سریا بدرخان لەتەواوکردنی باسی شەڕەکاندا وتویەتی:

(( تورکەکان لەرقی ئەو شکاندن و زیانانەی لەو شەڕانەدا لێیان کەوت پەلاماری دانیشتوانی بێ تاوانی بێ چەکیان داو هەرچییەکیان دەست بکەوتایە لەژن و مناڵ و پیر بێ بەزەییانە دەیان کوشتن و هەروەکو چۆن کاتی خۆی کوشتاریان لە ئەرمەنیەکان کردبوو بەو شێوەش بەربوونە گیانی میللەتی کوردو نزیکی ملیونێکیان کوشت و بەو زستانە سەختەی ئەو ساڵە, لەژێر کرێوەی بەفروباراناو بەسەر سەهۆڵبەنداندا ئەو خێزانە کوردانەی گرتبویانن هەموو پێش خۆیان دان و بەسەدان کچی کوردیان لەکەس وکاریان جیادەکردەوەو دەیان ناردن بۆ ئەفسەرەکانی بنکە سوپاییەکان و هەندێکیشیان نێرران بۆ ئەنقەرە بۆ ئەوەی ببن بە نۆکەرو بەردەستەی کەمالیەکان و گوندە چۆڵکراوەکانیشیان هەموو سوتاند.

لەئەنجامی ئەو دڕەندەیەتیەی تورك, جمعیتی خۆیبون بەناوی حکومەتی کوردەوە لەئاگریداغ داوای لە حکومەتەکانی بریتانیاو ئەمریکاو فرنسەو ئیتاڵیاو حکومەتانی تر کرد لیژنەیەکی دوەلی بنێرن بۆ کوردستان بۆ لێکۆڵینەوەو ئاگاداربوون لەو هەموو تاوانانەی تورکەکان لەساڵی (١٩٢٥)ەوە بەرامبەر بەکورد کردبوویان)).

بەڵام قدری جەمیل بەگ زنار سلوپی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٥٧) باسی شەڕەکانی دوایی کردووە کە لەساڵی (١٩٣٠)دا لەئاگریداغ ڕوویدابوو بەبێ

ئەوەی باسی شۆڕشەکانی بەر لەو ساڵە بکات کە جلادتو سریا باسیانکردبوو.

سەرچاوە (٥٧) لەلاپەڕە (١٤٨)یدا باسی شۆڕشەکانی ساڵی (١٩٣٠)بەم جۆرە کردووە:

((تورکەکان بۆ لێدانی شۆڕشگێڕان بەسەرکردایەتی (صالح پاشا) هێزێکی (٤٠)هەزار پیادەو (١٠)طوپی بطاریەو (٥٥٠)ڕەشاشو (٥٠)فرۆکەی شەڕکەریان ئامادەکردوو لە (١٩٣٠/٦/١١)دا پەلاماری هێزەکانی شۆڕشیاندا.

بۆ بەربەستکردنی ئەو پەلاماردانە، هێزی شۆڕش بەسەرکردایەتی ئیحسان نوری پاشا بڕیاریدا ناوچەی دەسەلأتیان بپارێزنو ئەو هێزەی لەرۆژهەلأتی ئاراراتدا هەیان بوو پەلاماری بەشی دواوەی سوپاکەی تورکیدا لەناوچەکانی (ضیاءالدین، تندروك، باتنوس، ئالاداغ، سیبان، زیلان)و توانی هێزەکەی تورك بووەستێنێتو نەیهێشت بەرەو پێشەوە بڕۆنو لەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا کە هەتا (١٩٣٠/٦/٢٠)ی خایاند حکومەت هیچ جۆرە دەسکەوتێکی دەستگیر نەبوو، کوردەکان توانیبویان پتر لە(٣٠)ڕەشاشو (٦٠)باری حوشتر چەكو (٥٠٠)چادریان دەست بکەوێتو تورکەکانیش بەرامبەر بەمە دەستیانکرد بەسوتاندنی گوندەکانی ئاراراتو لەم شەڕەدا ژمارەیەکی زۆریش لەشۆڕشگێڕان شەهید بوونو هەندێکیشیان لێ بەدیل گیراو (٥) فرۆکەیش خرایە خوارەوە.

ئەم شەڕە لەنێوانی (١٩٣٠/٦/٢٠) هەتا (١٩٣٠/٧/٢٧)دا کە لەناوچەی (زیلان)دا ڕوویدا لەهەموو شەڕەکانی تر گەرمترو قورستر بوو.

ڕۆژنامەی (تایمس)ی لندنی لەژمارەی ڕۆژی (١٩٣٠/٧/٢٤)دا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەکانی تورك کردووە کە لەو ڕۆژانەدا وتبویان هێزی حکومەت پتر لە (٦٠)هەزار چەکدار بووەو هەروەکو تایمس باسیکردووە حکومەت لەو شەڕەدا سەرەڕای ئەوەی (٨٠٠)کوژراوو (٢٠٠٠) بریندارو (٧٠٠)کەسیان لێ بەدیل گیرابوو هیچ دەسکەوتێکی وایان نەبوو، بەپێچەوانەوە کوردەکان چەكو جبەخانەیەکی زۆریان لەهێزەکەی حکومەت دەستگیربوبوو.

تورکەکان بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو زیانانەی لێیان کەوتبوو دەستیان کرد بەسوتاندنی گوندەکانی کوردو (١٣٠)گوندیان کاولکردو سووتاند لەناوچەی ئاراراتداو (٢٠٠)گوندیشیان لەناوچەی (زیلان)دا سوتاندو پتر لە (١٠,٠٠٠)دەهەزار کوردی بێ چەكو بێ تاوانیان کوشت.

بەرامبەر بەو دڕندەیەتیەی تورك کوردەکان پەلاماری هێزەکانی تورکیاندا لەناوچەکانی (بۆرسو) هەتا (بایزید)و زیانێکی زۆریان پێ گەیاندنو دوو ئالیەی قورس بەچەكو جبەخانەکانیانەوە لەگەڵ (٢٤)ڕەشاش لەجۆری (دیکرن) و (٢٠)ڕەشاشی تر لەجۆری (هوجیکن) و (٦٠٠)تفەنگو ژمارەیەکی زۆر چەكو چەند جیهازێکی تلفونیان دەسگیربوو، بەڕەشاشەکانیان توانیبویان هەشت فڕۆکە بخەنە خوارەوە.

شەڕ لەهەموو جەبهەکاندا هەتا (١٩٣٠/٨/٢٠) درێژەی کێشاو کوردەکان توانیبویان شاخی (غدیر) بگرنو لەوێش هەندێك چەكو جبەخانەیان دەستگیربوو، پاش ئەمە دەستیان بەسەر دوو دەربەندی گرنگدا گرت کە بریتی بوون لە(زور) و (درون) کە لەناو ئەو چیایانەدا بوون دۆڵی ئاراراتیان لەدەشتەکانی (بایزید)و ئەشکرد جیا دەکردەوە. لەلایەکی ترەوە ئەو هێزەی لەژێر سەرکردایەتی (سید ئاغا خان)ی سەرکردەی عەشیرەتی (سیدان)

دابـوو بـەهاوكاری (علـی جـان ئاغـا)ی سـەرۆكی عەشـیرەتی (بـرازان) كـە هــەردوكیان پێوەندییــەكی بــەهێزیان هــەبوو لەگــەڵ خۆیبونــدا لــەدواوە لەهێزەكـەی توركیانـداو لـە(مـوش)و (ملازكـرد) شـەڕێكی قـورس ڕویـداو كوردەكان هەوڵی ئەوەیاندا ڕێگە لەهێزەكەی تورك بگرن بۆ ئەوەی نەگاتە ئارارات و لەگەڵ ئەوەشدا حكومەت لەماوەی سێ مانگدا بەبێ وچان تەقەلای گرتنی ئاراراتی‌دا بەڵام نەیتوانی بەشێكیشی بگرێت و ناوچەكانی ئارارتی گەورەو بچووك وەكو (توبراغ, قلعە, كاردەك, تندروك, ئالاداغ, میلیچ كیریك, ئیرحــیش, زیــلان, ئاغایــا, بــارگیری, ضــیاءالــدین لــەژێر دەســەڵاتی شۆڕشگێڕاندا مانەوەو وورەی تورك لەنزمیدا بوو)).

زنارسلوپی لەو باسەیدا ناوی سەركردەكانی هێناوە لەوانەی لەم شەڕەدا بەشداربوون كە بریتی بوون لە: فرزندەبەگ, خالد بەگ لە(حسنان), سید رسول, حسین ئاغا كە هەموویان لەژێر سەركردایەتی ئیحسان نوری پاشاو ئیبراهیم حسكی پاشادابوو (مەبەستی برۆهسكی تیللویە).

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٥١)ی كتێبەكەیدا باسی هەڵوێستی كردووە لە گەرمــەی ئــەو شــەڕەداو توركــەكان بــەبیانوی چارەســەركردنی كێشــەی سەرسنوور لەگەڵ ئێرانیـەكانا ئـەوەیان كـرد بـەبیانوو, هەنـدێ زەوی‌وزاری نـاو خـاكی توركیایــان وازلێهێنـا بـۆ ئێرانیـەكان بەمـەرجێك ئـەوانیش دژی شۆڕشـەكەی كـورد بوەسـتن و پـاش ئـەو ڕێكەوتنـە شۆڕشـی كـورد كەوتـە نێـوانی دوو ئـاگرەوەو بـاری شۆڕشـەكەیان زۆر قـورس و گـران و ئـاڵۆز بـوو ڕێگرتنــی ئێـران لەگەیشـتنی خواردەمـەنی و یارمـەتی‌تر كـارێكی وایكـرد برسێتی زەیـف لەشۆڕشـگێران بنێت و چاریان نـەما دەبوایە ئارارات بەجێ بـێڵن و هـیچ نـەبێ بـۆ پاراسـتنی مـاڵ و منداڵـەكانیان خۆیـان بگەیەننـە نـاو

خاکی ئێران و بەرامبەر بەم هەڵوێستە تازەیە ئیحسان نوری نامەیەکی نارد بۆ خۆیبوون و داوای یارمەتی لێکردوو لیژنەی ناوەندی خۆیبون بەرامبەر بەم داخوازیە بڕیاری ژمارە (١١٢)ی دەرکرد لە ڕۆژی (١٩٣٠/٦/١٠)دا کە بریتی بوو لەبڕیاری دەستپێکردنی شۆڕش لەباشووردا دژی سوپای تورك بۆ ئەوەی باری شۆڕشگێڕانی ئارارات سووك بکرێت (لەدواییدا لەباسی شیکردنەوەی یاداشتەکانی ئیحسان نوریدا دەچینە سەر باسێکی ئەو بڕیارەی خۆیبون و سەرکردایەتی هێزەکانی شۆڕش لەئاراتدا).

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٥٢)ی کتێبەکەیدا باسی ڕاپۆرتێکی ئیحسان پاشای کردووە کە تیایا وتراوە:

((سوپای تورك لە (١٩٣٠/٦/١١)دا هێرشێکی بەرفراوانیان کردۆتە سەر ناوچەکانی ئارارات، لەبەرئەوە دەستکرا بەلێکۆڵینەوە دەربارەی هەڵوێستی ناوچەکەو هەروەکو لەڕۆژنامەکانیشدا بڵاوکراوەتەوە (دیارە ڕۆژنامە تورکیەکان بووە) وادەگەیەنێت تورکەکان لەم هێرشە گەورەیەی ئەم جارەیانا مەبەستیان لەناوبردنی کوردە لەناوچەکانی (ئاگری، وان، بدلیس، ئەرزروم)و هێزەکانیان لەڕێگەیانا هەر گوندێکیان هاتبێتە بەر کاولیانکردووە دانیشتوانی بێ چەکیشیان لەناوبردووەو بەتەمای ئەوەن دوای سەرکەوتن بەسەر ئاراراتدا پەلاماری ناوچەکانی ڕۆژئاواو باشوریش بدەن بۆ ئەوەی هیچ کوردێکی تیادا نەمێنێت.

زنار سلوپی ئەڵێ: ئەگەرچی لەتواناشدا نەبوو ئەو هێرشە بەرفراوانەی تورك بەربەست بکرێت بەڵام لیژنەی ناوەندی خۆیبوون بڕیاریدا هێرشێك لەباشورەوە بۆ باکور دەستپێبکرێت پێش ئەوەی ڕێگە لەپێشکەوتنی کوردەکان بگیرێت.

بۆ ئەو مەبەستە پشت بەخوا بڕیاردرا شەوی دووشەمەی ڕێکەوتی (٤/٣ / ١٩٣٠/٨)بەپێی ئەو نەخشەیەی ئامادەکرابوو هێرش دەستپێبکرێت.

زنارسلوپی لەلاپەڕە (١٥٣)دا باسی بڕیارێکی تری خۆیبوونی کردووە کە بەرلەمە داوا لە ئەندامانی خۆیبوون کرابوو لەوانەی لەناوچەکانی باشووردا بوون دابەش ببن بە شەش تاقمو هەر لەسنوری عێراقەوە هەتا (جرابلس) بگرێتەوەو من خۆم (زنارسلوپی – قدری جميل بەگ) لەناو ئەو هێزە لەژێر سەرکردایەتی اکرمی جميل پاشادا بوو (کە برای خۆی بووە)، هێزەکە لەجەبهەیەکدا کە پانایییەکەی لەویلایەتی (ماردین)ەوە گەیشتبووە ناوچەی (دیریك).

بەرلەوەی هێرش دەست پێ بکات ئەو هەنگاوانەی پێویست بوون هەمووی خرایە بەرچاو، پێوەندی بەئەندامانی خۆیبونەوە کرا کە یەکێك لەوانە (محمود علی شیر ئاغا) بوو کە خەڵکی (قرحی) بووە ئەویش بەنهێنی گەیشتە لامان (لەدواییدا محمود علی شیر ئاغا گیراو لەلایەن تورکەکانەوەاعدام کرا) بێجگە لەو (سعدون حمی قاسو ئاغا)ی خەڵکی (مشکینان) و (ئەلیاس ئەفەندی) کە لەبنەماڵەیەکی ناسراوی (دیریك) بوو لەگەڵ بنەماڵەی (حاجی عوسمان رەشو ئاغا)دا هەموویان بوون بە هاوکاری شۆڕشو ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ بەشداریکردن، بەڵام بەداخەوە ئەو نەخشەیەی بۆ دەستپێکردنی شۆڕش لەشەوی (٤/٣/ /١٩٣٠/٨)دا دانرابوو سەری نەگرت چونکە بڕیار وابوو، لەو شەوەدا لە(دیاری بیندا) کۆببنەوە کە شەش کیلۆمەتر دوور بوو لە(ماردین)و ساتێك من گەیشتمە ئەوێ (محمود علی شیرو)و (سعدون حمی قاسو) لەجیاتی خۆیان هەردوکیان دەڵێن خۆتان

(مەبەست قدری جمیل بەگو تاقمەکەیەتی) بچن (ماردین) ئابلوقە بدەن ئەوسا ئەوانیش ئامادەی پشتگیری کردن دەبن کە ئەمە لەگەڵ بریاری پێشویانا یەکی نەدەگرتەوە کە بریار وابوو ئەوان دەوری ماردین بگرن و هێڵی تەلەفون و تەلەگراف ببڕن پێوەندی ناوشار لەگەڵ دەرەوەدا نەهێڵن.

بەرامبەر بەم هەڵوێستە ناچاربووین واز لەپەلاماردانی ماردین بێنین و لەجیاتی ئەوە بریاردرا بەو هێزە کەمەی هەمان بوو ڕووبکەینە چیای (مازیداغ)و خزمەکانی علی شێرو پێیان ڕاگەیاندین هیچ کەس ئاگاداری نەخشەی هێرش بردنی نەکردون و ئامادەش نەبوون لەو ڕاپەڕینەدا هاوکاریمان بکەن لەگەڵ ئەوەشدا کە (سعدو حمی قاسو) خۆی و ژمارەیەك لەچەکدارەکانی هاتنە لامان بەڵام بەشدارینەکردنی کوردەکانی تر لە(خورس) وورەی ئەویشیان لاواز کرد ئەگەرچی هەر بەلایەنگری ڕاپەڕینەکە مانەوە, بەڵام تاقمەکەی ئەلیاس ئەفەندی کە چاویان بەهەڵوێستی ئەوانی تر کەوت ئەوانیش خاوبوونەوە هەرچەند چەند ڕۆژێك لەناو چیاکان مانەوە بەهیوای ئەوەی ئەو بزوتنەوەیە دەست پێدەکات, ساتێك زانیان هیچ جموجوڵێکنەبوو ئەوانیش گەڕانەوە بۆلای مرکزی خۆیبون.

لەلایەکی ترەوە, دوو سەرکردەیتر کە (حاجو ئاغا) و (جلادت بدرخان) بوون, هەردوکیان لەگەڵ هاوڕێکانیانا سەرکەوتن بۆسەر چیای (هڤیرکا) وساتێك (حسنانی)یەکان معارەزەیان کردوو نەیانتوانی هیچ پێشکەوتنێك بەدی بێنن ئەوانیش گەڕانەوە بۆ بنکەی خۆیبون.

زنارسلوپی لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

لەهەموو هەڵوێستێك خراپتر هەڵوێستی محمود بەگی ئیبراهیم پاشای میللی بوو کە سەرکردەی ناوچەی چوارەم بوو لەگەڵ هەڵوێستی •بوزان

بەگ)ی سەرکردەی ناوچەی دووەم کە هەردوکیان کاتی خۆی بڕیاریاندابوو هاوکاری بکەن کەچی کە کاتی پێویست هاتە پێشەوە هیچیان لەشوێنی خۆیان نەبزوان‌و تەنها ئەو هێزەی بوزان بەگ ناردبوی پەلاماری بنکەیەکی پۆلیسیاندا لەنزیك ناحیەی (سورج).

لەئەنجامی ئەم جم‌و جوڵانەدا حکومەتی ئینتداب (مەبەست حکومەتی فرنسەیە کە لەو ڕۆژانەدا سوریا لەژێر چاودێری ئەودا بووە) هەرچی ئەندامانی خۆیبوون بوو هەموویانی گواستەوە بۆ ناو وڵات‌و خۆیبوون بەرامبەر بەم هەڵوێستە بەیانێکی بە عربی‌و فرنسی‌و ئینگلیزی بڵاوکردەوە لەو بەیانەدا هۆی ڕاپەڕینەکەی بڵاوکردەوەو ڕایگەیاند مەبەست لەو جم‌وجوڵە پارێزگاری کردن بووە لەمافی میللەتی کورد بەهیوای ئەوەی لەڕێگەی ئەمەوە ڕەئی گشتی جیهان بەکێش بکرێت بەئومێدی دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆی.

پروفیسور حسرتیان لەلاپەڕە (١٤٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٩) بەکورتی باسی شۆڕشەکەی ئاراراتی کردووەو ئاماژەی بۆ ڕوداوەکانی دوایی کردووە لەساڵی (١٩٣٠)داو وتوویەتی:

((دوای سەرنەگرتنی گفتوگۆکانی کاربەدەستانی تورك لەگەڵ کوردەکاندا, لەسەرەتای ساڵی (١٩٣٠)دا کوردەکان لەچیای ئاراراتدا نزیکی (٢ – ٣) هەزار چەکداریان هەبوو, حکومەتی تورکیش بێجگە لەو هێزانەی لەو ناوچانەدا هەیبوو هێزی تریشیان بۆ نێردراو کەشەڕ دەستی پێکرد لەسەرەتادا تورکەکان توشی زیانێکی زۆربوون‌و نزیکی دوو هەزار سەربازی تورك بەدیل گیرا لەگەڵ (٦٠)تفەنگی ڕەشاش‌و (٢٤)ئۆتۆمبیلی عسکری‌و (١٢)فڕۆکە خرایە خوارەوە, بەڵام دوای ئەوە هێزێکی زۆریان بۆ هات‌و

ژمارەی چەکدارەکانی حکومەت گەیشتە چل هەزار ئیتر بەپاڵپشتی فرۆکەکان شۆڕشگێڕەکانی کوردیان ناچارکرد پووبکەنە سەر سنووری ئێران و تورکیاو کوردەکانی ئێران لەدەوروبەری (ماکو)یارمەتی کوردە شۆڕشگێڕەکانیانداو کوردەکانی (وان)یش بوون بە هاوکاریان و ژمارەی چەکدارەکانی کورد هەمووی گەیشتە نزیکی (١٠)هەزار چەکدار, بەلام ئالەو بارودۆخەدا ئێرانیەکان ڕێگەیاندا بە هێزەکانی حکومەتی تورك بچنە ناو خاکی ئێرانەوەو بەمە تورکەکان بۆیان ڕەخسا لەپشتەوە لەکوردەکان بدەن و ڕێگەی هاتوچۆکردنیان لێ بپڕن)).

حسرتیان پاش ئەو کورتە باسە ئەچێتە سەر باسی چۆنێتی شکاندنی شۆڕشی ئاگریداغ کە لەدواییدا بەدوورودرێژ باسی دەکەین.

بەلام کریس کوچرا لەلاپەڕە (١٥٩)ی کتێبەکەیدا باسێکی تایبەتی تەرخان کردووە بۆ چۆنێتی دەستپێکردنی شۆڕش لەساڵی (١٩٢٧)داو ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتی حکومەتی فرنسا کردووە ژمارە (٣٢-٣-٣١١)کە لەتەورێزەوە لەساڵی (١٩٢٧)دا نێردراوە لەو ڕاپۆرتەدا وتراوە:

((یەکەم هێرشی تورکەکان بۆسەر کوردەکان لەمانگی سبتمبری ١٩٢٧دا لەناوچەی (زیلان)دا توشی شکستێکی خراپ بوو, لەم شەڕەدا کوردەکانی ئێران یارمەتی کوردەکانی تورکیایاندا کە لەو شەڕەدا ژمارەی هێزەکەی تورك بریتی بوو لە (٨)هەزار سەربازو کوردەکان (٤)تۆپ و (٣٥)ڕەشاشیانگرت و چەند ئەفسەرو سەربازێکیشیان لێ بەدیل گیران یا کوژران.

حکومەتی تورك بۆی دەرکەوت عەشیرەتی (ماکو)یارمەتی شۆڕشگێڕەکانیان دابوو بۆیە داوای لەحکومەتی ئێران کرد سنوری خۆی

ببەستێت و ڕێگەی ئەو جۆرە یارمەتیدانە نەدرێت و ڕێگەی هاتوچۆی کوردەکان بگرێت لەسنوورەکان.

کریس کوچرا لەلاپەڕە (١٦١)ی کتێبەکەیدا چۆتە سەرباسی ساڵی ١٩٢٨/ ١٩٢٩)و وتوویەتی:

((ساتێك بەفری زستان توایەوە, لەناوەڕاستی ساڵی (١٩٢٩)دا تورکەکان نزیك لەشاری (ئیك دیر) و (بایزید) نزیکی (١٢ – ١٥)هەزار سەربازو (٣٠)فرۆکەیان لەژێر سەرکردایەتی صالح پاشادا ئامادەکردوو کاربەدەستانی تورك دەستیانکرد بەزیندانی کردنی کوردە ناسراوەکان لەئەرزرومەو (٩٥٠)کەسیان خستە زیندانەوە کە یەکێك لەوانە (صلاح الدینی کوڕی شێخ سعیدی پیران)بوو, دادگای تورك هەندێ لەگیراوەکانی هەڵواسیو هەندێکیشی زیندانی کردن بۆ ماوەی (١٥٩سالْ.

پاش ئەوە حکومەتی تورك لە(١١/تەموزی/١٩٣٠)دا هێزێکی گەورەی ناردو پەلاماری کوردەکانیدا لە ئاراراتو شەڕەکە چوار ڕۆژی خایاندو هێزەکانی کورد هەوڵیاندا ڕێگەی هاتوچۆی هێزەکانی تورك ببڕن و لەدەشتی (زیلان) کە ژووروی (ئیرس)دا شەڕەکە گەرم بوو, هێزەکانی تورك بەرامبەر بەمە توانیبویان لەناوچەکانی ژوروی (وان)دا چەکدارەکانی کورد لەیەکتری دابڕن و ناچاریانکردن پاشەکشە بکەن و هەندێکیان چوونە ناو خاکی ئێرانەوەو ئەوانیتر گەڕانەوە بۆ چیای ئاراراتو لەم شەڕەدا کوردەکان (٩٠٠)چەکداریان لێکوژراو (٢٤٠٠)یان لێبریندار بوو, نزیکی (٣٦٠)کەسیان ونبوون و بێ سەروو شوێن بوون.

بەپێی ڕاپۆرتە فرنسیەکە ژمارەی کوژراوەکانی تورك بە (٢٨٠٠)سەربازو (٤٠٠٠)بریندایشیان هەبووەو (١٧٠)سەربازیشیان لێ بەدیل گیرابوو

لەلایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە ئەگەرچی وەکو کوردەکان خۆیان باسیانکردووە ژمارەی زیانەکانی تورك لەمانەش پتر بوون.

بەپێی ئەو ڕاپۆرتانە کوردەکان لەم شەڕەدا (٢٤)تۆپو (٦٠)رەشاشو (٤٠)هەزار فیشەکیان دەستگیربووو (١٢)فڕۆکەی تورکیش خرایە خوارەوە هەرچەند ڕۆژنامەکانی تورك ئەم ژمارانەیان بەدرۆ خستبووەوە.

کریس کوچرا لەباسەکەیدا ئاماژەی بۆ دوکیومینتیکی حکومتی بریتانیا کردووە ژمارە (14580-F 50371) ڕۆژی (١٩٣٠/٦/١٦) لەو ڕاپۆرتەدا باسی ڕاپۆرتی ژنە ئینگلیزیکی کردووە کە هەروەکو ریبورتاجیك ئامادەی کردووە دەربارەی ئەو شەڕە کە ژنە ئینگلیزەکە ناوی (روزیتا فوربس)بوە هەروەکو کریس کوچرا لەپەراویزی لاپەڕە (١٦٧)دا باسیکردووە ئەو ژنە بۆ ماوەیەك لەناوچەی ئاراراتدا بووەو بێجگە لەباسی شەڕەکە ویستوویە لەڕێگەی ئەو ئەرمەنیانەوە بگاتە بدلیس بەڵام شەڕەکەی تورك‌و کورد ئەوەندە قورس بووە ناچاربووە خۆی بگەیەنێتە (ساسون)و لەوێوە گەڕاوەتەوە بۆ رواندون)

لەڕاپۆرتی ئەو ژنەدا وەکو وتویەتی وێنەیەکی فڕۆکەیەکی گرتووە کە خرابووە خوارەوە لەگەڵ باسی یەکێك لەو تۆپانەی کوردەکان گرتبویان ئەگەرچی کوردەکان نەیان توانیبوو تۆپە گیراوەکان بەکاربێنن‌و داوایان لە (ظفر الدولة)ی فەرماندەی هێزێکی ئێران کردبوو کە لەئازربایجان بوو یارمەتیان بدات بۆ چۆنێتی بەکارهێنانیان بەڵام وادیارە ئەویش حەزی نەکردبوو کورد ببێت بەخاوەنی تۆپی خۆی بۆیە داخوازییەکەی پشتگوێ خستبوو.

وەکو لەڕاپۆرتی روزیتادا باسیکردووە, لەگەرمەی ئەو شەرەدا وتویەتی کوردەکان لەگاڵتەو گەپی خۆیان نەکەوتبونو باسی ژنانی کوردی کردووە لەو شەرەدا منداڵەکانیان بەکۆڵیانەوە بووەو تفەنگەکانیشیان بەدەستەوە بووەو بەکاریان هێناون.

کریس کوچرا دوای ئەمە ئەچێتە سەر باسی (حاجو ئاغا)ی سەرۆکی هڤرکی کە لەڕۆژی (١٩٣٠/٨/٥)دا خۆیو چەند چەکدارێك گوندێکی بچوکیان لە مەڵبەندی (نصیبین) داگیرکردبوو, بەیانێکیان چاپکردبوو دەربارەی سەربەخۆی کوردو داوای لەکورد کردبوو یارمەتی شۆڕشگێڕانی ئارارات بدەن, بەڵام بزوتنەوەکەی حاجو ئاغا کەم خایەن بوو چونکە زۆری پێ نەچوو ئەو بزوتنەوەیە لەو ناوچەیەدا خامۆشکرا.

کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕاپەڕینێکی‌تر کردووە کە شانبەشانی ئەو بزوتنەوەیەی حاجی ئاغا بووە لەناوچەی (جولەمێرگ) لەڕۆژی (١٩٣٠/٨/٧)داو بزوتنەوەیەکی‌تر لە (١٩٣٠/٨/٦)دا لەناوچەی (سعرت)و لەکۆتایی ئەو مانگەدا لە (لیس)و بەتایبەتی لەدەوروبەری دیاربکر لەڕۆژی (١٩٣٠/٩/٢)دا بزوتنەوەیەکی تریش ڕویدابوو.

دەربارەی شۆڕشی ئارارات ولید حمدی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٢٣) ئاماژەی بۆ دوو دوکیومێنت کردووە کە باسی ئەو شۆڕشەیان کردووە یەکەمیان (fo.371-14580) کە ولید حمدی لەلاپەرە (٢٧٠)ی کتێبەکەیدا باسیکردووە وتویەتی دوای ئەوەی تورکەکان (سداد پاشا)ی سەرکردەی فەیلەقی یازدەهەمیان لابردو لەشوێنی ئەو (صالح پاشا)ی سەرکردەی فەیلەقی هەشتەمیان کرد بەلێپرسراوو سەرکردەی ئەو هێزانەی ڕووبەڕووی شۆڕشگێڕانی ئاگریداغ بوبونەوەو دوو فەیلەقی شارەزاو مەشقپێکراویان

لەژێر دەسەڵاتی (حسین عمر خالص)دا خستە ژێر سایەی صالح پاشاو بەمە ژمارەی چەکدارەکانی صالح پاشا گەیشتە (١٥)هەزار بێجگە لەهێزی احتیاط کە لەڕۆژئاوای ئەنادۆڵدا خرابووە ژێر دەسەڵاتیەوە.

صالح پاشا بڕیاریدا لەدوو قۆڵەوە پەلاماری چیای ئارارات بدات, ئەو فەیلەقەی لەباکووردا بوو پەلاماری کوردەکانیان دا بەڵام لەو هێرشەیانا بەئامانجی خۆیان نەگەیشتن و نەیانتوانی کوردەکان ئابلۆقە بدەن چونکە کوردەکان توانیبویان خۆیان بگەیەننە ناو خاکی ئێرانەوەو لەوێ کوردەکانی ئێران یارمەتیان دان و توانرا لەنزیك گۆلەکانی (سەرجۆ) پاشەکشە بەهێزەکەی تورك بکەن و لەو شەڕەدا (٥٠)سەربازی تورك بەدیل گیراو کورد چوار ڕەشاشی دەستگیر بوو, لەهەمان کاتدا ئیبراهیم بەگی سەرکردەی دەرەکی کورد مەبەستی (ئیبراهیم ئاغای هسکی تیللویە-برۆ) بەپێی بڕیاری خۆیبوون خۆی و ئەو چەکدارانەی لەگەڵیابوو بەخێزانەکانیشیانەوە کە ژمارەیان سێ هەزار دەبوو بەرگیریان کرد تا لەحزەیرانی ١٩٣٠دا شۆڕش لەناوچەکانی (موش, وان, بدلیس)دا بلاوبووەوەو ژمارەیەکی زۆری چەکدارانی عەشایرو نیشتەجێبوەکان چوونە پاڵ شۆڕشگێڕەکان و لەمانگی تەمموزدا بەسەرکردایەتی کوردەکانی (کورحسین) بەرەو (ئەرزیس) ڕۆیشتن کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی گۆلی (وان)و ژمارەیەك لەچەکدارەکانی عەشیرەتی (جلالی)یش چوونە پاڵ شۆڕشگێڕەکان.

ساتێك هێزەکانی کورد لە(زیلان دیری) لەنزیك چیای (سپیان داغ)دا بەرەو ڕووی تورکەکان بوونەوە لەژوور گۆلی (وان)دا شەڕێکی چوار ڕۆژی بەرپا بوو, تورکەکان لەم شەرەدا جگە لەفرۆکە, رەشاش و تۆپ و هێزی

سوارەشی بەکارهێناو چەند فڕۆکەیەك خرایە خوارەوەو فڕۆکەوانەکانیان بەدیل گیران (سەیر ئەوەیە نە لەم دوکیومێنتەداو نە لەسەرچاوەکانی تردا هیچیان باسی سەرەنجامی ئەو فڕۆکەوانانەیان نەکردووە بەزیندووی بوویێت یا بەدیلی تۆ بڵێی شۆڕشگێڕان بیریان لەوە نەکردبێتەوە سوود لەو دیلانە وەربگرن وەکو لەهەموو شۆڕشێکی تردا سوودیان لێ وەردەگیرێت؟)

دوکیومێنتەکە لەسەری دەڕواو دەڵێت:((هەرچەند تورکەکان لەم شەڕەدا زیانێکی زۆریان لێکەوت بەڵام لە ئەنجامدا توانیان هێزەکانی کورد بشکێنن‌و دوای ئەو شکاندنە دەستیانکرد بەکاولکردنی ناوچەکانی کورد)).

ولید حمدی دوای ئەو دوکیومینتەی ئەرشیفی حکومەتی بەریتانیا ئاماژەی بۆ سەرچاوەیەکی‌تر کردووە (ibla) کە ئەمیش باسی شەڕەکەی بەو جۆرە کردووە کە حکومەت صالح پاشای کردبوو بەسەرکردەی هەموو هێزەکان کە ئاڕاستەی ئارارات کرابون‌و لەمانگی (ئەیلولی/ ١٩٣٠)دا توانی دەربەندی گەروی (سردار بولاق) کە لەنێوانی هەردوو ئارراتدا بوو بیگرێت دوای ئەوەی زیانێکی زۆری لێ کەوتبوو.

(لەو سەرچاوەیەدا باسی ئەوە کراوە کە حکومەتی بەریتانیاو عێراق هەردوکیان دژی هەموو جۆرە بزوتنەوەیەکی جیاخواز وەستابون.

لەڕاستیدا نەك تەنها هەر لەو دوکیومێنتەدا, بەڵکو لەگەلێك دوکیومێنت‌و سەرچاوەی تردا باسی حکومەتی بەریتانیا کراوە کە هەمیشە دژی هەموو بزوتنەوەیەکی کورد بووەو لەو ڕاپۆرتەی (hendersom) بو (mr.helow) ناردبووی کە ئەم ڕاپۆرتە لەدوکیومێنتی ژمارە (fo.371-14580) کە بەرلەمە ولید حمدی بەکورتی ئاماژەی بۆ کردووە. بەئاشکرا دان بەوەدا نراوە چۆن

فرۆکـەکانی حکومـەتی بـەریتانیا لـەهێزو چـەکدارەکانی شـێخ ئەحمـەدی بارزانیانیان دابوو بۆ ئەوەی بزوتنەوەکەی کورد تەشەنە نەکات و هەمان دوکیومێنت باسی ئەوەی کردووە کە(توفیق روشدی- کە مەبەستی توفیق روشـدی ئاراسـە) دانـی بـەوەدا نـابوو حکومـەتی عێـراق خزمـەتێکی زۆر گـەورەی تورکیـای کردبـوو, بـەڵام روشـدی ئـاراس ووتبـوی: مەترسـی لەشوێنێکی تردا هەیە -کە مەبەستی ئێران بوە-

هـەتا ئێـرە بریتـی بـوو لەباسـی ئـەو دوکیومێنـت و سەرچـاوانەی هەریەکـەیان بەشـێوەیەك باسـی چـەمکێکی شۆڕشـەکەیان کـردووەو خوێندەواری بەڕێز لەبەراوردکردنی ئەو سەرچاوانەدا هەندێك ژمارەی لەیەك نەچووی دێتـە بەرچـاو دەربـارەی ژمـارەی کـوژراوو دیـل و ژمـارەی زیـانۆ دەسـکەوتی چـەك و جبەخانـەکان بۆیـە ناچـاربووین کورتـەی هـەموویان باسبکەین و کۆتـایی باسـی چۆنێتی دەستپێکردنی شۆڕش و ڕوداوەکان و سـەرەنجامەکانیان دەهێڵینـەوە بـۆ ئـەو باسـانەی ئیحسـان نـوری پاشـای سـەرکردەی هێزەکـانی شۆڕشـی ئاگریـداغ لەیاداشـتەکانیا باسـیکردووە, هەرچـەند وەکـو وتمـان ئـەویش یاداشـتەکانی درەنـگ تۆمـارکردووەو ئەوانەشی تۆمارکردووە کە لەبیریا مابوو, زۆرجاریش لەیاداشتەکانیا وەکو وتمـان هەسـت بەوە دەکرێت کە پاش و پێشێکی ئاشکرا هەیە لـەزنجیرەی باسەکانیا.

ئیحسان نوری بەرلەوەی بچێتە سەرباسی چۆنێتی ڕووبەڕوو بوونـەوەی هێزەکـانی کـورد لەگـەڵ سـوپای تورکـدا, لەلاپـەڕە (١١)ی یاداشـتەکانیا سەرچـاوە (٦١) کورتـە باسـێکی مێـژوویی ناوچـەکانی ئـاگری یاداشـت کـردووە لـەکاتی ڕێکەوتنەکـەی نێـوان ئیدریسـی بەدلیسـی و سـوڵتانی

عوسمانی کە بەپێی ئەو ڕێکەوتنە ئەمارەتەکانی کورد یەك لەدوای یەك چوونە ژێر باڵی عوسمانییەوەو بوون بەبەشێك لەدەوڵەتی عوسمانیو بەزنجیرە باسی شۆڕشەکەی میر محمد پاشای رواندز (پاشا کۆرە)و شۆڕشی بدرخان پاشاو شێخ عبیداللە نهریو شۆڕشی شۆڕشی (سید علی کوڕی شێخ جلال الدین-لەناوچەی هیزان- بدلیس بەهاوکاری مەلا سلیم)و شۆڕشی پیرانو چۆنێتی پێکهاتنی ئازادی بەسەرۆکایەتی خالد بەگ جبرانو چۆنێتی ئیعدام کردنی ئەوو یوسف ضیاء بەگو ڕاپەڕینی ئیبراهیم ئاغا (بروهسکی تیللی) لە عەشیرەتی جەلالی لەساڵی (١٩٢٦)دا لەئاگریو چۆنێتی هەڵبژاردنی خۆی لەلایەن خۆیبوونەوە بۆ سەرکردایەتی هێزەکانی شۆڕشی ئارارات.

لەلاپەڕە (٢٠)ی یاداشتەکەیدا کورتە باسێکی ئیبراهیم ئاغا (بروهسکی تیللی) کردووە کە لەشۆڕشی ئاگریداغدا لەبەر ئازایەتی لەلایەن خۆیبوونەوە لەقەبی پاشایەتی پێدراوە.

سەیر ئەوەیە ئەو ئیبراهیم ئاغایە هەروەکو ئیحسان نوری باسیکردووە, بەو هەموو ئازایەتییەوە کەلەشۆڕشی ئاگریداغدا نواندبووی کەچی بەرلەوە لەشۆڕشی پیراندا بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران لەم شۆڕشەدا بێ لایەن بووەو بەشداری نەکردووە تیایا, بەڵام ئایا کە شۆڕشی پیران کۆتایی پێ هێنرا کاربەدەستانی تورك هیچ حسابێکیان بۆ ئەو بێ لایەنیەی ئەو کردبوو؟؟ لەوەرامدا نەخێر... بەپێچەوانەوە تورکەکان لەویشیان هەڵپێچاو گێچەڵیان پێکرد. دەربارەی هەڵوێستی حکومەتی تورك بەرامبەر (بروهسکی تیللی) هەروەکو ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا باسی کردووە وتوویەتی:

لەدوای شۆڕشی پیران تورکەکان دەستیانکرد بەئاوارەکردن و ڕاگوێزانی کورد بەکۆمەڵ و هەروەکو ئیبراهیم ئاغا خۆی بۆ ئیحسان نوری گێڕاوەتەوە داروودەستەو قەومەکەی پێیان وتبوو بەلەوەی حکومەت دەستی بمانگاتیّ و دەرمان بکات با خۆمان دەرباز بکەین و ئەویش لەوەرامدا پێیان دەڵێت:

من دۆستی حکومەت بووم و شتێکی وام نەکردووە دژیان کە ببێتە هۆی ئەوەی لەشوێنەکەی خۆم دەرم بکەن...

بەڵام هەروەکو خۆی بۆ ئیحسان نوری گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی:

((زۆری پیّ نەچوو لەبەرەبەیانی ڕۆژێکی کۆتایی ساڵی (١٩٢٦)دا بیست سواری تورك بەسەرکردایەتی ئەفسەرێك هاتبوون بۆ گوندێك و لەویّ هەواڵی منیان پرسیبوو (هی ئیبراهیم ئاغا) کوڕەکە کە ئەم هەواڵە دەبیستێت خۆی گەیاندبووە باوکی کە لە(بایزید) بووم بۆی گێڕامەوە بۆی گێڕامەوە کە بەدواما دەگەڕێن, منیش پێم ووت پیّیان بڵێن باوکم چووە بۆ (قیزل دزی). بەکوڕەکەم وت بەڕێگای (قوتیس)دا دەڕۆم تفەنگەکەم بۆ بێنە بۆ ئەویّ و لەڕێگەما بۆ قوتیس کە گەیشتمە قەراغی ڕووبارەکە هەواڵی دەنگ وباسم لەشوانێك پرسی لەوەرامدا پێی وتم: تورکەکان بەدوای تۆدا دەگەڕێن))

هەروەکو ئیحسان نوری باسەکەی ئیبراهیم ئاغای یاداشتت کردووە کە دەڵیّ:

ئیبراهیم ئاغا دوای ئەمە بەدوورودرێژ باسی خۆی بۆ ئیحسان نوری کردووە کەچۆن خۆی و دانیشتوانی ناوچەکە ڕویانکردە چیاکان و چۆن سوپای تورك بەرامبەر بەئاگری ئۆردوگایەکیان دامەزراندو ئەویش خۆی و هەردوو براکەی و دوو خوشکەزاو سیّ کوڕی و چەند ئامۆزایەکی و هەندیّ لەچەکدارانی عەشیرەتی (هسەسوری)و تاقمێکی تری عەشیرەتی (موسی

پیرگـی)و پیاوەکـانی (محـوبکر)و هەنـدیّ چـەکداری عەشـیرەتی (کسـکوی) هـەموو دەسـتیان دایــە چـەك و بڕیاریانــدا ڕووبـەڕووی دوژمــن ببنــەوەو لەپێکادانێکدا ئەحمـەد ئاغـای بـرای ئیبراهیم ئاغاو برایەکی (محـو ئاغـا) شەهیدکران و بروەسکی خۆشی بریندارکراو تورکەکان بەرامبەر ئازایەتی چەکدارەکان خۆیان پێنەگیراو هەندیّ چەك و جبەخانەیان لیّ بەجێماو چەند کەسێکیشیان لیّ بەدیل گرتن، بەلاّم ڕەوشتی کورد ڕێگەی کوشتنی دیل نادات بۆیە هەموو دیلەکانیان بەردا.

ئیحسـان نـوری لەیاداشـتەکەیدا دەڵـیّ: بـەو جـۆرە چـەکدارەکانی بـرۆ سنگی چیای ئاگریان گرت و لەم کاتەدا (تمرشمکی) کە سەرۆك عەشیرەتی (شمکـان) بـوو لەناوچـەی (تـوزهینی)و یـەکێك بـوو لــەکوردە زرنگــەکان ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ فیداکاری و خۆبەختکردن لەپێناوی نشتماندا کە (شارخوی) براشی لەگەڵدابوو.

ئیحسان نوری لەلاپەرە (٢٥)ی یاداشتەکەیدا لەسەری دەڕواو دەڵێت:

لەدوای ئـەو ڕاپەڕینـە تورکـەکان ترسـیان لـیّ نیشـت و بڕیاریانـدا بەهـەر نرخێك بووبێت ئـەو شۆڕشـە دامرکێننـەوەو لـە(پـایزی/١٩٢٧)دا هێزێکیـان ئاڕاسـتەی ئـاگری کـرد بـۆ لێـدانی کـوردو گرتنـی ناوچـەکە وهەنـدیّ دانیشـتوانی ئاگری کـە لایـەنگری حکومـەت بـوون، حکومـەت تـوانی بـەناو ناوچەکانی ئەوانا بێتە پێشەوەو چەند بەرزاییەکیان گرت و لـەنێوان ئاگری گــەورەو ئــاگری بچــووکدا خێوەتیــان هەڵــداو لــەوێوە دەســتیانکرد بەپــەلاماردان و شــەڕکردنو پێشــمەرگەکانی ئــاگری ناچــاربوون مــاڵ و منداڵــەکانیان ڕەوانــە کــرد بـۆ ناوچـەی (تامبـات) کــە لــەژێر دەســەلاّتی عەشیرەتی (سـاکان)دا بـوون و هەنـدیّ لەچـەکدارەکانی ئـەم عەشـیرەتەش

بەهاوارو فریای براکانیانەوە هاتن‌و تورکەکانیان ناچارکرد پاشەکشە بکەن‌و لەم پێکادان‌و شەڕەدا کورد دەسکەوتێکی زۆری چەك‌و جبەخانەی هەبوو, ئەو دیلانەش کە گیرابوون هیچیان لێ نەکراو بەردران.

ئیحسان نوری لێرەدا لەیاداشتەکانیا ئەم چەند دێڕی سرودەی یاداشت کردووە کە لەیاداشتەکەیدا کراوە بەعەرەبی‌و ئەمە وەرگێڕانەکەیەتی بۆ شێوەی کرمانجی خواروو:

دۆڵەکانت پڕبوون لەخوێناو
لاشەکان بەوناوەدا پرش‌و بڵاو بوونەتەوە
ڕاستە ئاگری تۆ ئاگریت
بەڵام ئیمڕۆ ڕۆڵەکانیشت بوون بە ئاگر

ئیحسان نوری ئەڵێ: لەگەرمەی ئەم شەڕەدا ساتێك دوژمن هێزەکەی کێشایەوە ئەوسا پێی زانی کە ئیحسان نوری بەخۆی‌و (٢٠)سوارەی عەشیرەتی (حیدری)یەوە لەو شەڕەدا بەشداری کردبوو کەلەناو ئەو سوارانەدا (سیفدین بەگی کوڕی فتح الله بەگی سەرۆکی پێشوو) کە پورزای ئیحسان نوری بوو, لەگەڵ هەندێ لەعەشایری حیدران‌و هسنان لەسنوری پەڕیونەوەو ساتێك زانیبویان هەرکەکان هێزیان ناردبوو بۆ ئاگری ئەوانیش دەم‌و دەست گەیشتبوونە کۆڕی شەڕەکە.



نەخشەی ئەو ناوچانەی شۆڕشەکەی ئاراراتی تیایدا ڕوویدابوو

لەلاپەڕە (١٣١)ی یاداشتەکانی (ئیحسان نوری)

ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا باسی دوو شەڕی گرنگی کردووە کە لەنێوان شۆڕشگێڕان‌و هێزەکانی حکومەتدا ڕوویدابوو, شەڕی یەکەمیان بریتی‌یە لە شەڕی (کانی کورك) کە لەلاپەڕەکانی (٤٣-٦١)ی بۆ تەرخانکردووەو شەڕی دووەم بریتی‌یە لەشەڕی (زیلان) کە بریتی‌یە لەو شەڕەی کە کوردی تیا شکاو لەئەنجامیا شۆڕشگێڕانی کورد ئەوی لەو شەڕە ڕزگاری بوو ئاوارەو دەربەدەرکرا کە ئیحسان نوری بەدورو درێژ باسی ئەم شەڕەی لەلاپەڕە (٨٦) بەدواوە بۆ تەرخانکردووەو هەوڵ ئەدەین کورتەی ئەو دوو شەڕە بەپێی یاداشتەکانی ئیحسان نوری پێشکەش بکەین.

**شەڕی یەکەم: شەڕی (کانی کورك)**

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٤٣)ی یاداشتەکەیدا سەرچاوە (٦١)باسی چۆنێتی دەستپێکردنی شەڕی کانی کورکی بەم شێوەیە تۆمارکردووە کەکورتەیەکی پێشکەش دەکەین:

(ڕۆژێکی پایز, سەرلەبەیانی لەگوندی (کردئاڤا) کەنزیك سنووری دەسەڵاتی هێزەکانی کوردو حکومەت بوو کاتێکمان زانی تەقەی تفەنگ دەستی پێکردو بەدوای ئەوەدا ئیتر تۆپباران دەستی پێکرد دوای ئەوەی تۆپەکانی دوژمن لەگوندەکە نزیك بوبوەوە, تورکەکان ناوی ئەو گوندەیان لەناوە کوردیەکەیەوە گۆڕیبوو بە (تورکمن)و لەئەنجامی ئەم تەقانەدا هەندێ لەسوارەکانی کورد ڕوویانکردە لووتکەی ئاگری بۆ ئەوەی ڕێگەی ئەوە نەدەن تورکەکان بچنە پێشەوەو ڕێگەی هاتوچۆی سنووری ئێران بگرن.

ژن‌و منداڵانی گوندەکانی (موسی) و (بیرکی) گوندەکەی خۆیان بەجێ هێشتبوو، ڕوویانکردبووە سنوری ئێران‌و فڕۆکەی تورك ئیتر دەستیکرد بەبۆردومانی ئەو ژن‌و منداڵانە.

سەرکردەی هێزەکانی کورد مەبەستی (ئیحسان نوری خۆیەتی) لەگەڵ (بروهسکی)و (١٢)پیاوی ناو گوندەکە مانەوە بۆ بەرگری کردن لەگوندەکەو چاومان لێ بوو هێزەکانی تورك بەرزاییەکانی (کانی کورك) یان داگیرکرد کە ئەو هێزە بریتی بوو لەچەند سوارو پیادەو تۆپێکیشیان پێ بوو دانیشتوانی (کانی کورك) کە گوندەکەیان بەپێی ڕازیبونی حکومەت ئاوەدان کرابووەوە تەنها بریتی بوون لە(٢٥) ماڵ‌و دانیشتوەکانی هیچیان دژی حکومەت نەکردبوو کەچی تورکەکان پەلاماریانداو خاووخێزانەکانیان ناچارکرد بچنە (ئاگری)، برازایەکی (بروهسکی)کە تەمەنی نۆ ساڵ بوو بەتفەنگەکەی لەفڕۆکەیەکی دابوو خستبویە خوارەوە. هەندێ لەوانەی لەناو سنووری دەسەڵاتی تورکەکانا بوون خۆیان گەیانە لای ئێمە کە بریتی بوون لە (ئیلخان)ی کوڕە بچووکی بروهسکی‌و (ملا شون الله) کە مەلایەکی کوردی دڵسۆز بوو لەخوتبەی مزگەوتەکەیا خوتبەی بەناوی میللەتەکەوە دەخوێندەوە لەمزگەوتی (ئاگری)و پێنج پێشمەرگەیان لەگەڵدا بوو کە شەوێکی درەنگ گەیشتبوونە کانی کورك‌و ویستویانە بچنە ماڵی (حمید ئیسماعیل)و کاتێك بەخۆیان دەزانن سوارەی تورك ڕوودەکەنە گوندەکە لەبەرئەوە نەیان توانیبوو بچنە کانی کورك بەڵکو ڕویانکردە لای ئێمە.

هێزێکی تورك دوای خەڵکی گوندی کانی کورك کەوتن‌و ڕاویان نان‌و پەلاماری مەڕو ماڵاتەکانیان دان کە بەڕاستی ئەم کردارەی تورك ئەوەندە کاریگەرو دڵتەزێن بوو ئەو چەکدارانەی بەلاپاڵی چیای ئاگریەوە بون کە

چاویان بەو ڕەفتارە کەوت خۆیان پێ نەگیراو شێرانەو دلێرانە دوژمنیان ناچارکرد پاشەکشە بکات.

تورکەکان دەستیانکرد بەگوللەبارانی ڕووبارەکەی سەر سنوور بۆ ئەوەی ڕێگەی پەڕینەوە لەکوردەکان بگرن و نەگەنە ناو خاکی ئێرانەوەو، من لەو کاتەدا تاقە کەس بووم کەسواری ولاغ بوم، خۆم گەیاندە نزیکی پردەکەو لێی پەڕیمەوە، لەو کاتەدا (بادو دلخری) و (عوسمان کیلم)و سێ سواری تر ئەوانیش لەڕۆژئاوای پردی کانی کورك ولاغەکانیان بەستەوە.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە(٤٧)ی یاداشتەکەدا باسی ئەوانەی کردووە کە لەگوندەکەدا بوون، تورکەکان دەستیان بەسەر هەندێ ژندا گرتبوو یەکێك لەوانە ژنێکی سك پڕبوو، ژنێکی تریشیان کوشتبوو لەبەرئەوەی نەچووبوو لەگەڵیانا کە ئەو ژنە خێزانی ئامۆزایەکی (حمید ئیسماعیل)بوو.

(بروهسکی)و هاوڕێکانی کەخۆیان دابوو بەزەویداو ڕووبەڕووی پردەکە شەڕیان دەکرد، ساتێك چاویان بەمن کەوت گەیشتبوومە کانی کورك ئەوانیش پەڕینەوەو هەموومان ڕوومانکردە پشت دوژمن و دەستمانکرد بەتەقەکردن لێیان و سەرکردەی هێزەکەی تورك چاومان لێی بوو بەپەلە پروسکی سواری ئۆتۆمبیلەکەی بوو ڕایکردو (بادوزیلانی دلخسری) بەخۆی و تاقمەکەی پەلاماری پشتەوەی هێزەکەی تورکی داو هەندێکی لێ بەدیل گرتن.

ئێمەش لەگوندی (قوتس)ەوە کە بەرامبەر بەچیاکەی پشت بایزیدەوە بوو, لەوێوە دەستمانکرد بەگوللەبارانی رۆمەکان (تورکەکان) کە بنکەی تۆپەکانیان تیا دامەزراندبوو.

ئیحسان نوری ئەڵێ: بەڕاستی ئەم شەڕە یەکێك بوو لە شەڕە سەیرەکان کە ئەو هەموو سەربازە زۆرەی تورك لەو ناوچانەدا دوو هەزار دەبوون بەتۆپی گەورەو بچووکەوە بەرامبەر بە ژمارەیەکی ئیجگار کەمی کورد کە هەمووی (١٥) چەکداری پیادەو (٦)سوارە بوون چۆن وایانکرد تورکەکان ڕاوبنێن و ژمارەیەکیشیان لێ بەدیل بگرن.

لەگوندی (هللاج) ئیبراهیم ئارۆ لەگەڵ ئەو فڕۆکەوانەی فڕۆکەکەی خرابووە خوارەوە چوو بۆ •بایزید)و لەگەڕانەوەیدا لەبەرزاییەکانی (قوتس)دا بەلای ئێمەدا تێپەڕیو بۆی گێڕاینەوە وتی لەگەڵ فڕۆکەوانەکەدا چوومە بایزید لە(قوتس)ەوە ئەفسەرێك بەدووربین سەیری سەربازەکانی خۆیانی دەکردو دەیکێشا بەئەژنۆی خۆیداو دەی ووت: ئەم نەگبەتییە چییە؟! ئائەم هەموو سوارو پیادە پڕ چەکانەی ئێمە بەخۆیان و تۆپەکانیانەوە نەیانتوانی بەرامبەر چەند کوردێکی ڕووت و کەم چەك خۆیان بگرن!!

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەربارەی ئەمە وتوویەتی: نازانین. ئاخۆ سەرکردەی ئەو هێزەی تورك لەڕاپۆرتەکەیدا ئەبێ چۆن باسی ئەم شەڕەی کردبێت و ژمارەی شەڕکەرەکانی کوردی بەچەند دانابێت؟؟, لەڕاستیدا هەواڵی ئەو شەڕە وەکو ئەفسانەیەکی لێهات و دەماودەم دەگێڕایەوەو بڵاو دەبوەوە.



ئیحسان نوری لەگەڵ هەندێ لەچەکدارەکانی

لاپەڕە (١٣٦) یاداشتەکەی ئیحسان نوری

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٤٩)ی یاداشتەکەیدا باسی ئەو فڕۆکە خراوەی کردووە کە دوازدە چەکداری کورد بەسەرکردایەتی (ئەیوب ئاغا)ی برای بروهسکی خۆیان گەیاندە ئەو شوێنەی فڕۆکەکەی لێ خرابوو دەستیانکرد بەتەقەکردن و لەولاشەوە سەربازەکانی تورك لەگردەکانی نزیك گوندی (دودکان) لەسپەرەکانیانا خۆیان حەشاردابوو, چەکدارەکانی ئێمەش دەبوایە لەچیای (قوتس)ەوە کیلۆمەترێك تەختاییەکان بڕن کەلەژێر مەودای گوللەی دوژمندا بوو, بەلأم سید رسول بەرزنجی و فرزندە کە هەردوکیان نمونەی ئازایەتی و قارەمانێتی بوون تەقەیان لەتورکەکان کردو دوای ئەوەی تورکە خۆحەشارداوەکان بۆیان دەرکەوت سڵ لەگوللەکانی ئەوان ناکەنەوەو ناگەڕێنە دواوەو بەرزاییەکانی بەردەمی سەنگەرەکانی ئەوانیان گرتبوو ئیتر ئەوان ناچاربوون کشانە دواوەو ئەفسەرەکەی سەرکردەیان لەگەڵ سێ سەربازی تردا بەسواریی خۆیان دەربازکردو پێشمەرگەکانمان هاواریانکرد ئەوا ڕۆمەکان ڕایانکردو ولأخەکانیان و سێ لاشەو چەند برینداریکیان بەجێ هێشتبوو بەخۆیان و چەکەکانیانەوەو پاش ئەوە هێزەکەی تورك یەك لەدوای یەك ڕایانکردوو خۆیان شاردەوە.

ئێمەش لەگەڵ بروهسکیدا کە گەیشتین نزیك بوین لەفڕۆکە خراوەکەو ئەو تۆپەی تیایا بوو دەرمان هێناو فڕۆکەکە سوتێنراو کلّپەو تەقەی فڕۆکەکە دەنگی ئەدایەوەو ئەوانەشی کەبەدیل گیرابوون بەجلی ژێرەوە نێردران بۆ بایزید بۆ ئەوەی خەڵك لەڕێگا بەو شێوەیە بیانبینێت.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێت: سەرکردەی هێزی تورك لەسەر سنورەکە کە میر ئالآی (فەرهادبای)بوو خەبەری بۆ ناردم و پێی وتبوم:

بۆچی ئێمە شەڕکەرەکانی خۆمان بدەین بەکوشت, لەجیاتی ئەوە وەرە با منو تۆ با زۆرانێك بگرین ئەوسا بەکوشتنی یەکێکمان شەڕەکە دەبڕێتەوە, منیش وەرامم دایەوەو پێم ووت: ئەگەر بەکوشتنی یەکێکمان شەڕ کۆتایی پێ بێت ئەوا من بەوپەڕی شانازییەوە ئامادەم هەر ئیستە ئەو زۆرانەت لەگەڵدا بگرم, بەلاّم وادیارە تۆ هێشتا لەهۆی ڕوودانی ئەم شەڕە نەگەیشتویتو نازانی بۆچی ئێمە شەڕ لەگەڵ توركدا دەكەین!!

ئێمە داوای سەربەستیو سەربەخۆیی میللەتەکەمان دەکەین ئەگەر حکومەت دان بەوەدا بنێت ئیتر نەپێویستی بەشەڕ هەیەو نە بەزۆرانبازی منو تۆ, ئەگەر ئێوە ئەو زۆرانبازیەش بەشتێکی پێویست دەزانن من ئەو زۆرانبازییە لەگەڵ تۆدا ناکەم بەڵکو لەگەڵ سەرکردەی تورکیادا دەیکەم چونکە منیش نوێنەری کوردمو دوور نیە بەرلەوەی شەڕ ببڕێتەوە ڕۆژێ دێ لەکۆڕی شەڕێکدا ڕوو بەڕووی یەکتر ببینەوەو ئەوەشت لێ دیاری بێ کەمن ڕۆژێك لەڕۆژان هەر دەمرم بەلاّم لەناو کوردەکانا هەزارانی لەمن باشتر هەیە کەبتوانێت تۆڵەی میللەتی کورد لەتورك بێنیتەوەو ئەم شەڕە هەر کۆتایی نایەت هەتا ئەنجوومەنی بالاّی میللی تورك دان بەمافی کوردا نەنێت)).

ئیحسان نوری وەکو خۆی باسیکردووە ئەو دیلانەی گیرابوونو نێررابوونەوە ڕای سپاردن بەمیر ئالاّی فەرهاد بڵێن وائیمرۆ دێم بۆ ئەوەی لەکۆڕی شەڕدا ڕوو بەڕووی یەکتر ببینەوەو هەروەکو تۆ چۆن بەچاوی خۆی منی بینی پێش هێزەکەی خۆم دەکەوم ئەویش وا خۆیم بۆ دەرخاو بەپەلە ڕانەکات.

ئیحسان نوری لێرەدا چوار دێڕی تری سرودێکی بلاّوکردۆتەوە لەیاداشتەکەیدا کە وتراوە:

ڕۆژی ئازادیت لێ هەڵات..
تیشکی ڕوناکیت گەیشتۆتە بەصرە
ئاشتیم چاند لەناو گەلدا
کڵپە بسێنە ئاگری... کڵپە بستێنە ئاگری
ئیحسان نوری وتویەتی:

لەسەر سنووری ئێرانەوە, لەکانیاوەکانی سەر گردەکانی (ئایبەی) بەئاشکرا شەڕی (کانی کورك) دەبینراو لەوێوە نوێنەری (طاشناقی) ئەرمەنی ئاگاداری ئەو ئازایەتیو قارەمانێتییەی کورد بوو چۆن خۆیان بەختکردبوو, دەنگی لاوانی کورد دەلەرایەوە کە دەیان ووت:

کڵپە بسێنە ئاگری... کڵپە بسێنە ئاگری
تورکەکان لەترسی تۆ باوکەڕۆیانەو قوڕ دەپێون
بەچاوی خۆت ڕۆمەکانت بینی چۆن ڕایانکرد
کڵپە بسێنە ئاگری.... کڵپە بسێنە ئاگری

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا لەسەری ڕۆیشتووەو وتوویەتی:

(سەرکردەی هێزەکانی شۆڕش, بەبەیانێك داوای لەڕایی گشتی جیهانی کرد لەکێشەی کورد بکۆڵنەوەو پیێ وتوون.

(لەو شەڕانەدا کە تووشی کورد بووە بەناچاری دژی تورك, ئەو دیلانەی کورد دەیانگرێت دەمو دەس هەموویان بەردەدرێن, بەلاّم تورکەکان بەپێچەوانەوە بەوپەڕی دڕەندەیەتیەوە بەزەییان بەمنداڵیشدا نایەتەوەو دەیان کوژن کەچی سەرڕای ئەمە حکومەتی تورك بەدەوڵەتێکی

پێشکەوتووخوازی خاوەن شارستانێتی دەژمێررێت!! ئایا کامیان دڕندەو کێوین؟!

دوای ئەوە ئیحسان نوری لەلاپەڕە(٥٣)ی یاداشتەکەدا باسی هەندێ کاروباری بەڕێوەبەرایەتی سەرکردایەتی شۆڕشی کردووەو بەو زستانە سەختە کە شۆڕش(١٢) جیهازی تەلەفونی گرتبوو بەڵام پێویستی بەتەل هەبوو کە ناوچەکان بەهۆی ئەو تەلەفونانە بەیەکەوە ببەستیت بۆ ئەو مەبەستە سەرکردەی هێزەکانی شۆڕش کە(ئیحسان نوری پاشا)خۆی بوو لەگەڵ چەند سوارێکی دلێردا پەلاماری بنکەی سوپایی تورکیاندا لەبایەزیدو ئەوی پێویستیان بوو لەتەلی تلگراف دەستگیریان بوو, لەگەڵ خۆیانا بردیانو ڕۆژی دوایی ئەو تەلانە هەموو لەگەڵ تەلەفونەکانا لەشوێنی خۆیانا دانرانو توانرا هەندێ شوێنی گرنگی شۆڕش والێ بکرێت بەو هێڵی تەلەفونانە پێوەندییی بەیەکەوە بکەنو دەربارەی چەکدارەکانو ئەفسەرەکانی شۆڕشیش بۆ ئەوەی شێوەیەکی ڕێك وەربگرێت هەر چەکدارو ئەفسەرێك پلەو پایەی تایبەتی خۆی هەبووەو بۆ چەکدارەکان نیشانەی ئاگری گەورەو بچووك لەسەر بەردێکی بچووك هەڵکەنرابوو, چەسپێنرابوو بەسەروکلاوەکانیانەوە ئەفسەرەکانیش نیشانەی (خۆیبون) یان لەسەر شانیان چەسپاندبوو کە بریتی بوو لەوێنەی خەنجەرێك لەناو وێنەی گوڵە گەنمێکداو لەسەر دەسکی خەنجەرەکە وێنەی ڕۆژێکی لێ هەڵکەنرابوو.

وەکو ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٥٤)دا باسیکردووە, تورکەکان لەو زستانەدا هەوڵێکی زۆریان دابوو بۆ کوشتنی خۆیو ئەو کارەیان سپاردبوو بەشێخ عبدالقادر کە هەتا ئەوسا هەر لایەنگری حکومەت بوو, ئەویش ئەو کارەی سپاردبوو بە زاوایەکیو بە(داقو)ی کوڕە بچووکی برومسکی, بەڵام

تورکەکان بەهەڵەدا چوبوون لەمەداو لەڕاستی مەسەلەکە نەگەیشتبوون کەکورد تینوی ئازادیو سەربەخۆی بوو نەیان زانیبوو سەرکردەی شۆڕش ئاگاداری نەخشەی ئەوان بوو، ئەوانەش کە بەڵێنی بەجێهێنانی ڕاسپاردەکەی ئەوانیان دابوو هیچ شتێکیان بیّ ڕەزامەندی سەرکردایەتی شۆڕش نەکردبوو.

ئیحسان نوری دوای ئەمە دەچێتە سەرباسی تواناو دەسەلاَتی شۆڕشو ڕونکردنەوەی بارودۆخو هەڵوێستو وتوویەتی:

(زۆر باش لەوە گەیشتبووم کە هیچ هیواو ئومێدێك نەبوو کەلەهیچ لایەکەوە دەستی یارمەتیمان بۆ درێژبکرێتو توانای فراوانکردنی کۆڕی شەڕیش شتێکی ئاسان نەبوو، ئەو چەکەی شۆڕشیش هەیبوو بریتی بوو لەتفەنگ بەرامبەر تۆپو فرۆکەو دەبابەی سوپای مەشق پێکراو، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا بەچنگێکی پۆلاَین دەستمان بەسەر چیای ئاگریدا گرتبوو، توانیبومان بەرەنگاری هێزی تورك ببینەوەو دەنگی شۆڕشو باسی مافی کوردمان گەیاندبوو بەجیهانو ئەو نەخشەیەی بۆ شۆڕش ئامادەکرابوو تکتیکەکەی لەلایەن (خۆیبون)ەوە پەسەندکرابوو.

ئیحسان نوری دەڵێ: تورکەکان پەندو دەرسیان لەبەسەرهاتو ڕووداوەکانی مێژوو وەرنەگرتبوو هەروەکو چۆن بۆ پینەکردنی ئەو شکاندنو دۆڕاندنە زۆرەی ساڵی(١٩١٢) لەبالقاندا توشیان بوبوو داخی ئەوەیان بەعەرەبەکان ڕشتبوو بەهۆی (جمال الدین سفاح)ەوەو بەهەمان شێوە دەیان ویست لەگەڵ کوردیشدا هەمان دڕندەیەتیو خوێنڕێژی بەکاربهێنن.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێ:

بۆ ئەوەی خۆیبوون دەست بکات بەچالاکی، بەپێویستم زانی چەند تێکۆشەرێکی لەخۆبردوو بنێرم بۆ ناوجەرگەی کوردستان بۆ ئەوەی لەلایەکەوە تورکەکان بەوەوە خەریك بکەم لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی پەیدا ببێت لەنێوان بنکەی خۆیبوونو ناوچەکانی تری کوردستاندا، هەرچەند ژمارەی ئەو نێرراوانە کەم بوو بەڵام زۆر بەقوڵایی دەچوونە ناو خاکی کوردستانەوەو بنکەی تریش دامەزراو بەمە بڵێسەی شۆڕشی ئاگری لەشوێنەکانی تری کوردستانا بەرزبوەوە.

لەدوای شەڕی (کانی کورك) وورەی دانیشتوان بەرز بوەوەو هەبوو لەناویانا دەیوت فیرقەیەکی تورك ناوێرێ پەلاماریان بدات.

ئیحسان نوری ئاماژەی بۆ یاداشتێکی(زوهدی گویڤن) کردوە کە ئەفسەرێکی تورك بووە لەباسی یەکێك لەو شەڕانەدا لەیاداشتەکەیدا وتوویەتی:

((لەو شەڕانەی لەنێوان کوردەکانو تورکدا لە(ئوسمان کلم-ئالتون دشمی) کەنزیکی زەویوزارەکانی عەشیرەتی (شمکان)بوو لەناوچەی (توزلجە) هێزی سوپای ئێمە شکاو پاشەکشەی کردبوو ڕۆژی دوایی کەبەناو کۆڕی شەڕەکەدا گەڕام چاوم بەچوار لاشەی سەربازکەوتو ناشتمانن، بەرامبەر بەمە لەناوچە شاخاویو دۆڵەکانا (٦)کوردم بەدیل گرت کە هەر شەشیان شوانو گاوان بوونو هیچ پەیوەندییەکیان بەشەڕەوە نەبوو.

ساتێك حکومەت بەسەرکردایەتی (جنرال صبحی) هێزێکی ناردە سەر عەشیرەتی (شمکان) کە سەرۆکەکەی (تەیمور ئاغا) بوو، شەو لەگوندی (کابلوجە)دا ماینەوەو کاتێك لەتەقەی تفەنگ خەبەرمان بوەوە پاسەوانێك

وتی: ئەوەتە والەوبەرەوە ڕۆیشت و تێپەڕیکرد. ساتێك چووینە سەر ئەو زەلامەی پاسەوانەکە باسیکرد تماشامان کرد (ئامۆ) بوو, کەهێنایان بریندارببوو دوو گوللەی بەرکەوتبوو یەکێکیان ئێسقانی ڕانی شکاندبوو, کەلێمان پرسی بۆچی هاتوویتە ئەم گوندە لەوەرامدا وتی بۆ ئەوە هاتووم تۆڵەی (ئیبراهیم فتۆ) بکەمەوە, بۆ ئەوە هاتووم ئێوەی ئەفسەر هەمووتان بکوژم, بەڵام بەداخەوە بەرلەوەی بگەمە چادرگەی ئێوە بەر گوللە کەوتم))

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێت ئەو (ئامۆ)یە لەعەشیرەتی شمکان بوو لەتاقمەکەی (کریم قاسو), بەو جۆرە, بەو برینداریيەش تورکەکان کوشتیان و شەهید بوو.

هەمان (زوهدی گویڤن) باسی ڕوداوێکی تری کردووە کە وتوویەتی:

((ڕۆژێکی تر چەند کەسێکمان لەعەشیرەتی (شمکان) بەدیل گرت و بردیانن بۆ گوندی (قرەکوسە)و لەنزیك (بالکلگول) دایاننە بەر گوللەو کوشتیانن و بۆ پینەکردنی ئەو تاوانە هەر پانزە دیلە کوژراوەکانیان بەمردوویی و کوژراوی بردیاننە سەر شاخەکان و لەڕۆژنامەکانیان بلاویان کردەوە ئەوانە لەکاتی شەڕدا کوژرابوون.

لەدوای ئەو باسە دوورودرێژەی شەڕی (کانی کورك) ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا لەلاپەڕە (٨٢) بەدواوە یاداشتەکەی بۆ چۆنێتی دەستپێکردنی شەڕی (زیلان) تەرخانکردووە کە لەم شەڕەدا هەروەکو ڕوون دەبێتەوە شۆڕشگێڕان ئەوپەڕی قارەمانێتی و خۆبەختکردنیان پیشاندابوو بەڵام لەئەنجامدا شۆڕشگێڕان نەیانتوانیبوو هەتاسەر بەرگری هێرشی یەك

لەدوای یەکی هێزەکانی تورك بگرن و لەدوای شکانی شەڕەکە باسی هۆی شکانی شەڕەکەو هۆی خۆمانەو هۆی بێگانە ڕوون دەبێتەوە.

باسی شۆڕشی زیلان:

ئیحسان نوری لەلاپەڕە(٨٢)ی یاداشتەکانیا باسی ئەوەدەکا چۆن تورکەکان ویستیان بەبەردێك دوو چۆلەکە بکوژن و لەلایەکەوە لەحکومەتی ئێران نزیك بوونەوە بۆ ئەوەی کارێکی وا بکەن حکومەتی ئێران کێشە بۆ شۆڕش دروست بکات و برادەرانی ئێمە ئاگاداری ئەو گفتوگۆیانە بوون کە لەئەنقەرەدا لەنێوان حکومەتی تورك و باڵیۆزی ئێراندا دژی کورد دەکراو لەتارانیش هەمان کۆبوونەوە لەنێوانی باڵیۆزی تورك و کاربەدەستانی حکومەتی ئێراندا دەکراو لەو ڕوەوە ڕۆژنامەکەمان (خۆیبون) باسێکی دەربارەی ئەوە بڵاوکردەوە کەتیایا وترابوو:

((تورکەکان دەیانەوێ بەبەردێك دوو چۆلەکە بکوژن, لەلایەکەوە هەوڵئەدەن کوردو ئێران بکەن بەدوژمنی یەکتر بۆ ئەوەی ئێرانیەکان دژی شۆڕش بوەستن و لەلایەکی تریشەوە دەیان ویست بەسەرگرتنی ئەو تەقەلایەیان کوردیش بکەن بەدوژمنی گەلی فارسی ئامۆزای کورد بۆ ئەوەی ڕێگە خۆش بکەن بۆ دەسگرتن بەسەر (ئازربایجان)دا کە دەمێکە خەوی پێوە دەبینن)).

ئێمەش دەستمانکرد بەخۆئامادەکردن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزی تورك و هەموو بەیانییەك فڕۆکەکانی تورك بۆردومانی ناوچەکانی ئاگرییان دەکرد کە ئاگریەکان لەسەر چیاکان ڕەشماڵیان هەڵدابوو.

کاتێك منو مەبەست (ئیحسان نوری)یە شێخ عبدولقادر بەبیست سوارەوە چووین بۆ سەردانی لقی خۆیبوون لەباکوری ئاگریو بەدەشتی (ئاخدری)دا دەگەڕاین کە بۆ یەکەمجار ئاڵای کوردستان لەو پێدەشتەدا هەڵکرابوو, لەڕێگامانا چەند تورکێکمان بینی لەوانەی کە حکومەتی تورك هێنابوونیو لەو دەشتەدا جیٚنشینی کردبوون, بەڵام ئەمانە ناچارکرابوون کە سەردانەوێنن بۆ ئاڵای کوردستان کە لەو دەشتەدا دەلەریەوە, هەمووی سیٚ ڕۆژی پیٚ نەچوو بەسەر ئەو گەشتەمانا فڕۆکەی تورك دەستیکرد بەبۆردومان کردنمانو خێوەتەکان بەر بۆردومان کەوتنو (پاشاخاتون)ی خێزانم لەخێوەتەکەدا بریندارکراو هەندیٚ لەمەڕو ماڵاتەکەمان کوژرانو بۆمان دەرکەوت تورکەکان بەتاریکایی شەو طابوورێك سەربازیان هێنابوو لەگەڵ دوو تۆپداو لەسەر ڕێگەی (قاباق تەپە) دایانمەزراندبوو کە ئەکەوێتە سەر ڕێگای ڕۆژئاوای ئاگری کە ئەمە سەرەتای خۆئامادەکردنی حکومەتی تورك بوو بۆسەرمان لەساڵی (١٩٣٠)دا.

شوێنی (قاباق تەپە) وەکو قەڵایەکی سەخت وابوو, تەنها ڕێگەیەکی سەخت هەبوو کە بیگاتیٚو لەو ڕووەوە (زەدی گویڤین) کە ئەفسەرێکی تورکە نوسیویەتی:

((چەتەکان بەهەموو هێزو بەچەکەکانیانەوە ئەو بەرزاییانەیان دەپاراست, بەڵام لەڕاستیدا شتەکە بەو جۆرە نەبوو کە ئەو باسی کردبوو چونکە ئێمە لەو ناوچەیەدا هێزێکی ئەوتۆمان نەبوو بتوانێت هەموو شاخەکەو دەورووبەری بپارێزێت.

فڕۆکەکانی تورك هەرچەند هەموو ڕۆژێك بەسەر ئاگریدا دەفڕینو ژنومنداڵی دانیشتوانیان بۆردومان دەکرد, بەڵام بەبەرزاییەوە دەفڕینو

لەتەقەی ئێمە دەترسان و سڵیان دەکردەوە, بێجگە لەوە شۆڕشگێڕانیش فێری خۆشاردنەوە بوبوون کە ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کەمتر زیانیان لێ بکەوێت.

ئالەم هەڵویستەو بارودۆخەدایەکێتی سۆڤیەت هێزێکی گەورەی هێنابووە سەر سنووری ئێران و ئاگری و ئێرانیەکانیش هێزی خۆیان هێنابووە ناوچەی (ماکو).

ڕۆژنامەی جمهوریەتی تورکی لەژمارەی ڕۆژی (٣٠/تەمووزی/١٩٣٠)دا مقالێکی لەژێر ناوی (ئەم گلەییانەی دواییمان لەئێرانە), لەو مقالەدا نوسراوە:

(هەواڵنێری ڕۆژنامەی (تایمس) لەئەستەمبول هەواڵێکی ناردووە بۆ ڕۆژنامەکەی تیایا باسی ئەوەی کردووە کە بەهەزاران چەتەی کورد کەخۆیان لەلووتکەی چیای ئاراراتدا قایمکردووەو شوێنەکانی خۆیان بەستووەو لەولاشەوە کوردەکانی ئێران یارمەتیان دەدەن و ئەرکانی حزبی تورکیاش بەرامبەر بەمە(٦٦)هەزار سەربازو جەندرمەی ئامادەکردووەو بەپاڵپشتی (١٠٠)فڕۆکە هەمووی ناردوون بۆ ناوچەکانی (وان)و (بایزید) بۆ شەڕێکی سەختی دوورودرێژ)).

وەلەژمارەی هەمان ڕۆژنامەدا لەژێرناوی (ڕوداوەکانی چل ساڵ لەمەوبەر) هەواڵێکی تری بڵاوکردۆتەوەو تیایا وتوویەتی:

((ئەو هەزاران کوردەی ئەرکانی حرب تورکیا باسیکردوون, لەڕاستیدا دەرکەوت ژمارەکەیان لە(٥٠٠)چەکداری کورد بەولاوە تێپەڕی نەکردبوو (بێگومان ژمارەی فڕۆکەکانیش هەر بەو شێوەیە ڕاست

نەبووە)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانی سوپا نەیانتوانیوە بیانشکێنن و شوێنەکانیان داگیربکەن)).

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا وتوویەتی:

((لەڕاستیدا حکومەت کە ئەو هەموو هێزو چەکەی ناردبوو، ئێمە چەکی بەرگریکردنمان زۆر کەم بوو، ئەوەی هەمان بوو ئەوانە بوون لەسەربازە بەدیلگیراوەکان دەستمان کەوتبوو من خۆم تەنها دەمانچەیەکم هەبوو کە کریستیانەکان بەدیاری بۆیان ناردبووم و لەشەڕی (کانی کورد)یشدا بەکارم هێنابوو)).

ئیحسان نوری ئەڵێ: گەیشتمە ئەو بڕوایەی ئێرانیەکان نیازیان خراپەو بەدەستیانەوەیە شتێك دژی ئێمە بکەن، بۆیە بیر لەوە کرایەوە لەجیاتی ئاگری بنکەیەکی‌تر بدۆزرێتەوە کە بۆ ئەمە (دۆڵی زیلان) و چیای (سیبان) بەباش زانران بۆ ئەوەی پەرەش بەشوێنی بزوتنەوەی تریش بدرێت بۆ ئەوەی تۆزێك باری ئاگری سووك بکرێت و بتوانین بەباشی لەناوجەرگەی هێزەکانی تورك بدەین.

لەدوای چەند ڕۆژێکی‌تر، سەرۆکەکانی دۆڵی زیلان و عەشیرەتی (حیدران) لەگوندی (دردن) بڕیاریاندا دەست بەڕاپەڕین بکەین و منیش بۆم دەرکەوت ئازاکانی حیدران بەتەواوەتی خۆیان ئامادەکردبوو، تورکیش دەستیکردبوو بەسەرەتای پەلاماردانەکەی.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٨٦)یدا بەم شێوەیە باسی (دۆلی زیلان)ی کردوە کە شەڕەکەی تیادا ڕوویداوە:

((دۆڵی زیلان لەدوای ئاگری دووهەم ناوچە بوو کە کاتی خۆی لەشەڕی جیهانیدا ڕوسەکان نەیانتوانیبوو دەستی بەسەردا بگرن و دیاربوو

شۆڕشـگێڕەکان سـووربوون لەسـەر پـەلاماردانی تورکـەکان, بۆیـە منـیش داخوازیەکانیانم پەسەند کردوو دەربارەی ئەوە بڕیارێکم دەرکرد کە تیایا وتبـووم: لـەپاش پاکردنـەوەی دۆڵـی زیـلان لـەهێزی تـورك نـۆرەش دێتـە سـەرپاکردنەوەی شـارەکانی (بـارگری) و (ئـەرجیش) و ئـەرنیش)و ئەگـەر دانیشـتوانی ناوچـەکە بڕیاریانـدا شـاری (ئادلجوان)یش ئازاد بکرێـت ئـەوا هێزەکانمـان لەناوچـەکانی (جـلالیو حیـدرانو ئـادامیو زیـلان)ەوە ئـەو بڕیـارەش بـەجێ دەهێـنن بـەلاّم پێویسـتە بـەر لەهـەموو شـتێك هێزەکـانی (حیدران) چیای (سیپان) بگرن.

لەئاراراتیشـدا بەپێویسـت زانـرا هێزەکـانی تـورك لەدەوروبـەری چـیاکە پاکبکرێنـەوەو شـاری (باشـکندر) تاگەیشـتە بـاکورو باشـووری چـیاکە داگیربکرێـتو خۆئامادەبکرێـت بـۆ هێـرش بـردن بۆسـەر شـارەکانی (أخـدر)و (بایزیـد)و ئـەرکی ئـازادکردنی شـاری (قولـب)م سـپارد بـە (تمرشملـی) کـە بەخۆیو عەشیرەتی شمکان داگیری بکەنو پەلاماری (قاخزمـان)یش بـداتو دەسـت بەسـەر ڕێگـەی (قـارص-ئـاگری) دابگرێـتو کـاتی هێـرش بـردنم دەستنیشـانکردو وێنەیـەکی ئـەو بڕیـارەم نـارد بـۆ سـەرکردەکانی هـەموو ناوچـەکانمانو دیـاربوو نوسـخەیەکی ئـەو بڕیـارە گەیشـتبووە دەسـت ئەفسـەری تـورك (زوهـدی گـویڤن) کـە لەدوایـدا ئـەو ئەفسـەرە تورکـە لەیاداشتەکانیدا نوسیویێتی:

(حکومـەت خـۆی ئامـادەکردبوو هێـرش بباتـە سـەر ئـاگریو بـۆ ئەمـە هێزەکانمان ڕویانکردە بایەزیدو فەرمان دەرچوو بۆ لـەناوبردنی هێزەکـانی ئـاگریو بزوتنەوەیـەکی فراوان دەسـتی پێکردبـوو هێزەکـانی تـورك (قابـاق تەپە)ی داگیرکرد کە دەکەوێتـە ڕۆژئاوای ئاگریو سـەرکردەی چەتەکان کە

ئیحسان نوری‌یه بەیانێکی دوورودرێژی دەرکردبوو بۆ سەرۆکی عەشیرەتەکان لەوانەی لەدەوروبەری ئاگریدا لایەنگری ئەو بوون)).

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێت: ئەو ئەفسەرە تورکە ئەو بەیانەی منی لەگیرفانی یەکێك لەکوژراوەکانی ئێمەدا دەستگیر بوبوو.

وەکو ئیحسان نوری خۆی باسیکردووە،نوسخەیەکی ئەو بەیانەی دەریکردبوو ناردبووی بۆ سەرۆکی عەشیرەتی (ئادامان) کە ئیبراهیم ئاغا بوو، بەیانەکە لەسەرەوە لەلای ڕاستیەوە نوسرابوو (خۆیبوون)و لەژێریا نوسرابوو (مجلس وطن کورد- ئەنجومەنی نیشتمان کورد)و ژمارەی بڕیارەکەشی نوسرابوو، لەلای چەپی سەرەوەشدا نووسرابوو- ئاگری- مرکزی قیادەو لەژێر ئەمەدا ڕۆژی دەرچوونی بەیانەکەی تیادا نوسرابوو کە بریتی بوو لە (٨/حزیران/١٩٣٠) بڕیاری هێرش بردن:

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٨٨)ی یاداشتە چاپکراوەکەیدا دەربارەی بڕیاری دەستپێکردنی هێرش نوسیوێتی:

ئەو بڕیارە بریتی بووە لەحەوت مادەو هەروەکو (زوهدی گویڤن) لەیاداشتەکانیا کردویەتی بەتورکی (کەدیارە لەیاداشتەکانیا لەزوهدی گویڤنەوە وەری گرتۆتەوە).

بەپێی ئەوەی زوهدی گویڤن بڕیارەکە بەم شێوەیە بووە:

١- دوژمن (مەبەست تورکە) لە(١١/حزیران/١٩٣٠)دا هێرشی هێناو بەرزاییەکانی (قاباق تەپە)ی داگیرکردوو لەباکوری ڕۆژئاوای ئاگری شەش فڕۆکەی دوژمن بەشداری هێرشی کردوو ئاگری‌یان بۆردومان کرد لەماوەی ڕۆژانی (١١/حزیران/١٩٣٠) تا (١٨/حزیران/١٩٣٠) سێ فڕۆکە بەرگولەی

ئێمە کەوتن و یەکێکیان لەبنکەی بایزید کەوتە خوارەوەو فرۆکەوانەکەی کوژرا.

٢- پێویستە هێزەکانمان پەلاماری دوژمن بدەن لەدەوروبەری ئاگریداو هێزی ناوەڕاست ڕاسپێررا هێزەکانی خۆی بباتە چیای (تندورك) بۆ ئەوەی ڕێگە لەهاتوچۆی هێزەکانی دوژمن بگرێت (مەبەست هێزەکانی تورکە).

فەیلەقێکی تورك لەباشووری خۆرئاوای ئەنادۆلدا ڕوویکردە ئاگری بۆ پەلاماردانی هێزەکەمان بەڵام نەیتوانی بێتە پێشەوە بەهۆی ئەو خۆئامادەکردنەمان کە لە(درسیم) و (خربوط)و ناوچەکانی باشووردا کە لەسەر سنووری سوریا ئامادەکرابوون.

٣- لەمرکزی بنکەی خۆیبون: پشت بەخوا، بڕیاردرا هێرش ببرێتە سەر هێزەکانی تورك:

أ- پێویستە لەسەر (تەمر ئاغا-تەیمور ئاغا) ی سەرۆکی دەرەکی هێزەکانمان بەخۆیو هێزەکەیەوە بەهاوکاری عەشیرەتەکەی خۆی (شمکان) کە لە(قولب) بوون، هێرش ببەنە سەر مەرکەزی قەزای (قولب) لەرۆژی (٣/تەموز/١٩٣٠)داو دوای داگیرکردنی شارەکە پێویستە پێشمەرگەکان هەوڵ بدەن دەست بگرن بەسەرناوچەکانی تردا هەتا دەگەنە گوندی (برنافوت).

ب- شەوی (٤/تموز)، سەرکردەی هێزەکانی ناوچەی (قورخان) کە عقید (ولی بەگە)، هێزەکانی خۆی بەچەکدارەکانی عەشیرەتی (گزگان)و (زیلان) بەقوەت بکاتو هێرشی ناکاو بکاتە سەر شاری (أخدر)و داگیری بکاتو لەهەمان ڕۆژدا هێزی ئاگری پەلاماری دوژمن بدات لەدەوروبەری ئاگریدا (مەبەست پەلامار بۆسەر هێزەکانی تورك).

٤- ئەو سەرۆك عەشیرەتانەی لەگوندی (درن)دان پێویستە لەسەریان هێزەکانیان لەرۆژی جومعەی رێکەوتی (٤/تەممون)دا دەستبگرن بەسەر بنکەکانی تورکدا لەناوچەکانی خۆیاناو بەم جۆرە کاروباری ناوچەکە ببرێت بەرێوە:

أ- هێزی (ئەرجیش) یارمەتی لەدۆلی زیلان وەرئەگرێتو هێرش دەباتە سەر بنکەکانی حکومەت هەتا دەگەنە شاری (ئادلجواز)و دوای دەسگرتن بەسەر ئەو شارەدا دەسدەگرن بەسەر بەرزاییەکانی چیای (سیپان)داو بەسەر ئەو بەرزاییانەی ئەکەونە خواروی ئادلجوازو پاش ئەوەی هێزی سوارە دەنێرێت بەرەو: ئاخلات, تاتوان, شاخی نمرود.

ب- لەسەر سەرکردەی هێزی دیلان پێویستە دوای ئەوەی ناوچەکەی خۆی لەهێزی تورك پاك دەکاتەوە, دەستبگرێت بەسەرناوچەکانی بەشی رۆژئاوای چیای (ئالاداغ)و لەوێوە چەند تاقمێك لەسوارەی شارەزاو لێهاتوو رووبکەنە (ملازگرت) بۆ یارمەتیدانی عەشیرەتی (هەسنان)و پێویستە دەست بگیرێت بەسەر ئەو رێگەو بانانەی ئەگەنە شارەکانی (کوسەر) کە ئیمرۆ تورکەکان بەم شارە دەڵێن (ئاگری), ملازگرت (لەهەندێ شوێندا بەملازکرد دەنوسرێت), باتنوس, ئەرجیش.

ج- پێویستە لەسەر عەشیرەتەکانی حیدری کە لەناوچەی (باتنوس)دان لەگەڵ ئەوانەی لەعەشیرەتی (ملازگرت)دا لەگەڵ ئێمەدان دەستبگرن بەسەر شاری (باتنوس)و ئەو بەرزاییانەی ئەکەونە باشوورو رۆژئاوای چیای (سیپان), پاش ئەوە هێزی سوارە بنێرێت بۆ چیای (نمرود)و (موش) و (کوبی) بۆ ئەوەی ئاگاداری جووڵەو بزوتنەوەکانی دوژمن بین.

د- هێــزی ناوچــەی (بــارگری)-پێویســتە لەســەری دەســبگرێت بەســەر ناوچــەی (بارگری)و (ئەرنس)داو ڕێگـە لەهاتوچۆی ئـەو هێزانـە بگرێـت کەلـە(وان, ئـەرجش, سرای)ەوە دێن.

ه- هێزی ناوچەی ناوەڕاسـت: ئـەم هێـزە یارمـەتی هێزەکـانی عەشـایری (جـلالی)و (مـللان) ئەدا بـەهاوکاریی ئـەو عـەشـایرانەی لەناوچـەی (ئـەلکا)دانو پـاش ئـەمـە ئـەو هێزانە لەژێر سـەرکردایەتی خۆمـدان (مـەبەسـت ئیحسـان نـوری خۆیـەتی) ناوچـەکانی نێوان: بایزید-ئاگری داگیردەکەنو (٣٠٠)چـەکدار دەنێررێـت بـۆ چـیای (تنـدروك) بـۆ بەهێزکردنی شەڕکەرەکانی (بارگری).

پێویستە لەسەر ئەم هێزانە بەگشتی هەرەشە لەداگیرکردنی (وان) و (سەرای) بکەنو هەولبـدرێت زانیـاری کۆبکرێتـەوە دەربـارەی ناوچـەکانی (وان)و (تـارب) و (سـرای)و (باشقەلا),و (هەکاری).

و- ناوچـەی (ئـەرجیش):-پێویسـتە لەسـەری بـەپێی توانـای خـۆی یارمـەتی هێـزی ناوەندی بدات.

ز- پێویسـتە لەسـەر قائیمقـام ئیـبراهیم ئاغـای سـەرۆکی عەشـیرەتی (ئادامـان), بـەزوترین کـات کاروبـاری خـۆی لەگـەڵ علـی بـگ میرزاغـا, رسـول زلیو سـەرۆك عەشـیرەتەکانی (قوتـان)و (هسـە سـووری) ڕێـك بخـەنو بەهـەمووتان پـەلاماری شـاری (دیادین)بدەن لـەرۆژی جومعـەی ڕێکـەوتی (٤/تموز/١٩٣٠)و پـاش ئـەوە بەتـەواوی دەسـبگرن بەسـەر ڕێگـای (قرەکوسـە-بایزیـد)داو پێویسـتە ئاگاتـان لەهەڵسوکـەوتو جموجوڵی دوژمـن بێت لە(قرەکوسە) بـەهاوکاریکردن لەگـەڵ حمیـد بەگـداو شـتێکی وا بکرێت ئەو ڕێگەیەی ئەچێت بۆ (طاهر) بریتی بێت لەڕێگەی ئاگرباران.

ح- دوای داگیرکردنی ئەو ناوچانەی باسیانکراوە, هێزەکانی (ئەرجیش)و (بـاتنوس) و (زیـلان) زۆربـەی هێزەکانمـان گـرد بکەینـەوە کـە دەکەونـە پشـتی هێڵـی (دوتـاخ –

ملازگرت)و هەروەها هێزی (بارگری) ئەو هێزانە کۆدەکاتەوەو ئامادەیان دەکات کە لە(ئەرنس-نوشارت)ن.

٥- مرکزی سەرکردایەتی لەئاگری دەبێتو هەرچی زانیاریەکتان هەیە هەموی بنێرن بۆ ئەم مرکزە. ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٩٠)ی یاداشتەکانیا پاش بلأوکردنەوەی ئەو بڕیارانە وتوویەتی زوهدی گویڤن لەیاداشتەکانیا وتوویەتی:

(ئیحسان نوری تاوانباری ڕاکردوو خۆی کردووە بەسەرکردەی گشتیو نەخشەیەکی ئامادەکردووە بۆ دانانی حکومەتێك وەکو چۆن لەو بەیانەدا دەردەکەوێ کە بەئیمزای خۆی دەریکردووە لەسەریەوە نوسراوە: سەرکردایەتی سوپا بەرزەکانی هێزی خۆیبون, وەهەموو هەڵسوکەوتەکانی ئیحسان نوری واپیشانی ئەدەن دەیەوێ حکومەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنێت. ئیحسان نوری لەگەڵ ئەو بڕیارەدا تعلیماتێکی گشتی دەرکردووە لەژێر ناوی :-

(ئەو تعلیماتە گشتییانەی پێویستە لەکاتی شەڕدا بەکاربهێنرێتو بخرێتە بەرچاو) کە لەو تعلیماتانەدا ئیحسان نوری وتوویەتی:

١- پێویستە هەر هێزێك لەناو خۆیا سەرکردەیەك هەڵبژێرێتو ئاگاداری ناوەکەیم بکات.

٢- پێویستە لەسەر هەر ناوچەیەك دەزگایەکی تایبەتی هەڵبژێرێت بۆ کاروباری ناوخۆیو بەپێی ژمارەی شۆڕشگێڕەکانی ئازوقەیان لەناوچەکانی خۆیانا بۆ دابین بکەن.

٣- هەموو جۆرە دەسکەوتەکانی شۆڕش بەچەكو جبەخانەو تۆپو هەرچی دەسگیربێت لەحکومەتو لەسوپاکەی هەمووی بەموڵکی کورد

دابنرێـت و پێویسـته لەعـەماری تایبەتیـدا هـەڵبگیرێت و لێپرسـراوێکی بـۆ تەرخان بکرێت و نابێ بەهیچ جۆرێك دەستکاری بکرێت چونکه موڵك و ماڵی میللەته.

٤- هەر ئەفسەرو سەربازێك یا فەرمانبەرێکی تورك ویستی یارمەتیمان بـدات یـا ببێـت بەلایـەنگرمان, پێویسـته سوود لەیارمەتیـدان و هاوکـاریی وەربگیرێـت بـەڵام پێویسـته ئـەوە زۆر بـەوردی و ئاگادارییـەوە بکرێـت و پێویسته بایەخێکی زۆر بدرێت بەدەزگاکانی لاسلکی و چاکردنەوەی هێڵی تەلەفۆنـه لەکارکـەوتووەکان و سـوود لەفەرمانبـەره شـارەزاکان وەربگیرێـت لەوانەی جێگەی متمانەن و پێویسته تەنها ئەو هێڵانه ببڕن که ئێمەو دوژمن بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

(ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێ: لەڕاستیدا زوهـدی گوێڤن هەندێ لەناوەڕۆکی بڕیارەکەی منی دەستکاری کردبوو, باسی ئەوەی نەکردبوو که ئێمـه لەبڕیارەکـەمانا باسـی چـۆنێتی ڕەفتارمـانکردبوو لەگـەڵ دیلـه تورکەکانا).

بۆئـەوەی سەرپەرشـتی هێزەکـه بکرێـت هـەردوو کوڕەکـەی کـور حسـن پاشـا (ممـو) و (نـادر) بـون لەگـەڵ سـید رسـول برزنجـی کـه خـەڵکی (ئەرجیش) لەگەڵ تاقمێ سوارەدا ناردمن بۆ (دۆڵی زیلان).

لـەپاش سـاڵێکی پـڕ لـەگێرەو کێشـەو کارەسـات, بـیرم لـەوە کـردەوە پێویسته بارودۆخی شۆڕش هەڵسەنگێنم و هەندێ دەسکاری و ئاڵوگۆڕ بکەم لەنەخشەی شۆڕشەکەدا که سوودی بزوتنەوەکەمانی تیادابێت.

شـەوێك تاقمەکـەی (داوو)ی کـوڕی • بـرۆ) بـەتاریکایی شـەو هێڵـی تەلـەفۆنی نێـوان (قابـاق تەپـه) و مرکـزی بـڕی بـۆ ئـەوەی (عمـر بسـی)

لەپشتەوە پەلاماری • قاباق تەپە) بداتو هێزێکی سوپای حکومەت کەلە(١٥)کەس پێکهاتبوو ویستیان تەلەفۆنە بچڕاوەکە چاك بکەنەوەو ساتێك لەلاپاڵی چیاکە بۆ ئەو مەبەستە بەرەو خوار بونەوە هەموویان کوژران لەلایەن تاقمەکەی (داوو) کە شەڕەکەی نێوان هەردوولا سەعاتێکی خایانو چەکەکانیان دەسگیری شۆڕشگێڕەکان بوو، سەربازە تورکەکان بەبەرزاییەکانەوە چاویان لێ بوو چۆن هاوڕێکانیان دەکوژران بەلأم زاتی ئەوەیان نەدەکرد بێنە خوارەوەو یارمەتی هاوڕێکانیان بدەن.

لەو کاتەدا دوو تاقمی بچووکی شۆڕشگێڕان دەستیانکرد بەتەقەکردن لەبنکەی سوپای تورکەکان بۆ شوێنی ووتنی تاقمەکەی (عمر بسی) کەبەشەو بەنهێنی خۆیان گەیاندبوە دەوروبەری ئەو بنکەی سوپایەو چەند کەسێکیان لەهێزەکەی تورك کوشتوو چەکەکانیان دەستگیرکرا، بەلأم لەبەرئەوەی شوێنەکە ئێجگار سەخت بوو بۆیە پێشمەرگەکان لەوە زیاتر نەیانتوانی بچنە پێشەوە.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا ئەڵێ:

گەرمای هاوین لەسەر چیای ئاگری تاوی سەندبوو، گوزەران تیایا ئاسان نەبوو لەبەرئەوە ناچاربووین ڕووماکردە لووتکەی چیاکان لەلایەکەوە بۆ دوورکەوتنەوە لەگەرماو لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی شوێنی لەوەڕ بدۆزرێتەوە بۆ مەڕو ماڵاتەکان کە مایەی ژیانی شۆڕشگێڕەکان بوو، تورکەکان بەو چوونەی ئێمەیان زانیو ئەمەیان بەهەل زانیبوو هەر بەشەو هێزەکانیان ناردبوو بۆ دەوروبەری گوندی (شخلو)و بەرزاییەکانی ئەو گوندەیان داگیرکردوو چادریان تیا هەڵدا، هێزێکی ئاگری لەچیاوە هاتنە خوارەوە بۆ ئەوەی دوژمن دەرکەنو هێشتا ئێمە نەگەیشتبوینە ئەو

شـوێنەی کـە تفـەنگ هاوێـژێك لێیانـەوە دووربێـت تورکـەکان دەمو دەسـت چادرەکانیان پێچـایەوەو گەڕانـەوە بـەرەو (بایزیـد)کـە ئەمـە زۆر جێگـەی سەرسوڕمان بوو.

دانیشـتوانی دۆڵـی (زیـلان) زۆر دڵیـان بـەوە خـۆش بـوو کـە سـوارەکانی ئـاگری فـەرمانیان بـۆ دەرکرابـوو پـەلاماری هێزەکـانی حکومـەت بـدەن‌و لەخۆشـی ئـەو بڕیـارە خۆیـان پـێ نـەگیراو بەرلـەکاتی دەستنیشـانکراو دەستیانکرد بەهێرش بردن بۆسەر بنکەی حکومەت لە(حسن ئابدال).

حسن ئابدال بنکەیەکی حکومەت بوو کە (٢٠٠)سەربازی تیابوو, لەپاش شـەڕێکی گـەرم شۆڕشـگێڕەکانمان بنکەکـەیان داگیرکـردوو ئـەو سـەبازانەی ڕایـان نـەکردبوو بـەدیل گـیران‌و چـەکەکانیان دەسـگیرکراو پـەلاماری شـاری (نوشار)یشیاندا کە مرکەزی ناحیەی (زیلان) بوو, طابوورێکی تـورکی پیادە کەلـەناو شـارەکەدا بـوون هەنـدێ تۆپیـان هـەبوو, سـەرکردەی طـابوورەکـە لەقەڵای شارەکەدا خۆی حەشـاردابوو وەخـۆی قـایمکردبوو, گـەلێك چـەکیان پێ بوو بۆ پارێزگاری خۆیان, لەوە نەگەیشتبوون بەرامبەرەکـەیان (مەبەسـت چەکدارەکانی کوردە) شەڕکەرێکی کەللە ڕەقی چاونەترسن‌و ئامادەن گیـانی خۆیان لەپێناوی میللەتەکەیانا بەخت بکەن.

لەگەڵ ئەو هەموو چەك‌و جبەخانە زۆرەو سەختی شوێنی قەڵاکەیان, ئەو هێزەی تورك نەیتوانی بۆ ماوەی بیست‌و چوار سـەعات زۆرتـر خـۆی بگرێـت بەرامبـەر بەهێرشـەکەی عەشـرەتی (ئادامـان)و زیـانێکی زۆری لێکـەوت‌و سەرکردەی تورك لەو قەڵایەدا کوژراو ئـەوانی‌تر کە لـەمردن ڕزگاریـان بوبـوو بەئەفسەرو سەربازەوە هەموو بەدیل گیران‌و بـۆ ڕۆژی دوایـی شۆڕشـگێڕەکان بەشـێك لەشـاری (ئـەرجیش) و شـاری (بـاگری)یـان بەتـەواوی داگیرکـرد

هێزەکـانی حکومـەت هێشـتا لەبەشـەکەی تـری (ئـەرجیش)دا بـەرگریان لەخۆیان دەکرد کە هێزێکی شۆڕش تاقمێکیان نـارد بۆ ئەوەی سەرەڕێگەی (ئـەرنس-وان) بگـرن بـەڵام زۆر بـێ حسـابانە ئـەو کارەیـان ئەنجامـدا بۆیـە لەتەقەلاکـەیانا سـەرنەکەوتن و زیـانێکی زۆریشـیان لێکـەوت کـە ئـەم سـەرنەکەوتنە وورەی تورکـەکانی بـەرزکردەوە لـە(ئـەرجیش)و تورکـەکان لـە(وان)ەوە تاقمێـك تۆپیـان نـارد لەگـەڵ هێزێکـی تـازەدا بـۆ یارمەتیـدانی هێزەکەیان لە(ئەرجیش)و پاش شەڕێکی گەرمی نیوسەعاتی هێزەکەی تورك تماشای کرد ئیتر ناچارە دەبێ خۆی بدا بەدەستەوە، بەڵام چەکدارەکانی (خیـدری) هەڵەیـەکی زۆر گـەورەیان کـردوو لـەجیاتی ئـەوەی بەشـێك لەهێزەکـەیان بەسـەر بەرزاییەکانـەوە بهێڵنـەوەو ئـەوانیتر بنێـرن چـەکەکان لەدەسـگیربووەکان وەربگـرن، بەپێچـەوانەوە هـەموویان بـەجارێك لەبەرزاییەکانـەوە چـووبوونە خـوارەوە بـۆ کۆکردنـەوەی چـەکە دەسکەوتووەکان، ئەنجامی ئەمە بەوەگەیشت کە سەرکردەی تورکەکان بۆی دەرکـەوتبوو ژمـارەی شۆڕشـگێڕەکان زۆرکـەم بـوو، دەسـتبەجێ فـەرمانی دەرکردبوو شـەڕ دەسـت پـێ بکاتـەوەو سـەرکردەی شۆڕشگێڕەکان کوژراو ئەوانیتر هەتا دوا گوللە شەڕیان کردبوو، بەم شێوەیە تورکەکان توانیبویـان هێزی تازەی یارمەتیدەر بگەیەننە (ئەرجیش).

ئەوانەی لەپەلاماردانی (ئەرجیش)دا بەشداریان کردبوو بریتـی بوون لـە چەکدارەکانی عەشیرەتی (بکران) کە چەك و جبەخانەی تەواویان پـێ نـەبوو، ئەوانـەیان کـە پـەلاماری بنکـە ئاسمانیەکـەیان دابـوو هەرچـەند بەتـەورو تـەوراس و کوتـەك هێرشیان بردبـوو بـەڵام توانیبویـان بەسـەر پاسـدارەکانی بنکـە ئاسمانیەکـەدا سـەرکەون و بەلـەخۆبوردنێکی زۆر توانیبویـان ئـەو

پاسـدارانه چـەك بكـەن‌و دەسـت بگـرن بەسـەر دوو فرۆكـەدا كـە خۆيـان ئامادەكردبوو بۆ فرين.

ئيحسـان نـوری لەلاپـەرە (٩٥) يادداشـتەكەيدا باسـی (ممـد بـەگ)ی كـوڕی كـۆر حسـين پاشـا بـەخۆی‌و چـەند شـەركەرێكەوە پـەلاماری شـاری (باتنوس)ياندا‌و چوونە ناو شارەكەوە، بەڵام بنكە سوپاييەكەی ناوشار زۆر قـايم كرابـوو بۆيـە نـەتوانرا زيـان بـەو بنكەيـە بگەيـەنن‌و بەرلـەوەی بچـنە ناوشـارەوە لەرێگـەی (قەرەكۆسـە-ئـەرجيش)دا هەنـدێ ئەفسـەريان گرتبـوو لەوانـەی لەشـاری (بـاتنوس)ەوە هـاتبوون كـە ئەمانـە هەنـدێ لەسـوارەكانی عەشـيرەتی (سـيكوبی) شـيان لەگەڵـدا بـوو، چـەك لەئەفسـەرو سـوارەكان سێنراو دران بە سيد رسول‌و سيف الدين بەگی كوڕی سەرۆكی پێشووی عەشـيرەتی (هسـنان) كـە فـتح الله بـەگ بـوو، لەوێشـەوە ڕويـانكردە دەشتاييەكەی (ملازكرد)و لەوێ دەستيان كرد بەشەڕێكی قورس.

ئيحسـان نـوری لەلاپـەرە (٩٥)دا ئـەڵێ: لەبەرئـەوەی شۆڕشـەكەی (زيـلان) پـێش وەخـت كرابـوو بۆيـە هەواڵـەكانيان بەباشـی نـەدەزانراو حكومـەت لەهـەموو لايەكـەوە هێـزی ناردبوو بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی شۆڕشـگێڕەكان‌و هێزی حكومەت بەهاوكاری بەكرێگيراوەكانی عەشيرەتی (كسكوی) گەيشتە زيلان‌و توانيبويان شاری (حسن ئابدال) داگير بكەنەوە.

وەرگێـڕی يادداشـتەكەی ئيحسـان نـوری، صـلاح بـرواری، لەپـەراوێزی لاپەرە (٩٥)دا ئاماژەی بۆ ناميلكەكەی (ئاپۆ عوسمان صبری) كردووە كە بەناوی (چوار قارەمـان)ەوە بڵاوی كردۆتـەوە لـەو ناميلكەيـەدا وتوويـەتی توركـەكان لـەم شـەڕەدا (٨٠)گونـدی كورديـان سـووتان‌و هـەموو دانيشـتوانی ناوچـەی (زيـلان)يـان قەلاچـۆكرد بـۆ تۆڵەسـەندنەوەی ئـەو

زیانانەی لەو شەڕەدا توشیان بوبوو, فرزندە بەگی پاڵەوان لەو شەڕەدا هێزەکەی تورکی پەرێشان کردبوو, لەتاقە شەڕێکدا (٢٥٠)سەربازو ئەفسەر کوژرابوو لەکاتێکدا هەموو هێزەکەی فرزندە بەگ بریتی بووە لە(٥٠)چەکدار کە تەنها (٣)کەسیان لێ بریندار بوبوو.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٩٧)دا باسی ئەوەی کردووە چۆن عەشیرەتی حیدران لەلایەن تورکەکانەوە ئابلۆقە درابوو بۆیە دەبوایە شتێك بکرایە ئەو ئابلۆقەدانە لابرێت و ئەم کارە سپێررا بە(داوو)ی ئازاو بە(بروهسکی)ی دلێرو کۆڵنەدەر کە تاقمێك سوار ببەن بۆ ئەوەی دوژمن لەگوندەکانی (سوبهان)و (نورشین) پەرەوازە بکەن و بڕیاردرا لەپێشدا هێرش ببرێتە سەر بنکەی تورکەکان لە(نۆرشین) لەبەرەبەیانداو بۆسەیەك دابنرێت لەڕێگەی (سوبهان)دا بۆ ئەوەی پەلاماری ئەوانە بدرێت کە تورکەکان لەسوبهانەوە دەینێرن بۆ یارمەتیدانی (نورشین).

ئەو نەخشەیە بەباشی بەجێ هێنراو توانرا هێزەکانی هەردوو بنکەکە بکوژرێن یا بەدیل بگیرێن کە ژمارەیان (١٢٠)سەرباز بوو, دیلەکان دابەشکران بەسەر خێزانەکانی ئاگریدا بۆ ئەوەی چاودێریان بکەن. ئەو ڕۆژەی کەدەسنیشانکرابوو بۆ هێرش بردن بۆسەر (بورنی سوور)و (بورنی ڕەش), ئاگریەکان دڵیان بەوە خۆش بوو دەتوانن دەسبگرن بەسەر ئەو تۆپە گەورانەی لەبنکەی سوپایی (بورنی)ی سووردا دامەزرێنرابوون کە هەمیشە تۆپ بارانی ئاگرییەکانیان دەکرد لەهات وچۆکردنیاناو لوولەی ئەو تۆپانە دوای داگیرکردنیان ئاڕاستەی دوژمن بکرێت.

لەبەرەبەیانـدا پـەلاماری هـەردوو بنکەکـە دراو سـەرکردەی بنکەکـەی (بورنی سـوور) بەتەلـەفۆن بەرپێبەرەکەی خۆی ووت: ئەوا شـەڕ لـە (بـۆرنی رەش) دەستی پێکرد, بەڵام هێشتا لای ئێمـە هـیچ ڕووی نەداوە, وادیـاربوو ئـەو ئەفسـەرە تورکـە ئاگـاداری ئـەوە نـەبوو خۆشـی ئابڵووقـە درابـوو ئابڵووقـەدەرەکان گوێیـان لەهـەموو قسـەکانی بوبـوو کـە بەتەلـەفۆن لەگـەڵ سەرۆکەکەیدا کردبووی.

لەبەرەبەیانـدا پـەلاماری (بـورنی سـوور)یش درا کـە سـەربازەکانی لەسـەر گردێك سەنگەریان هەڵکەنـدبوو خۆیان تێدا حەشـاردابوو, لەیەکـەم هێرشـدا شۆڕشـگێڕەکان بەشـێك لەگردەکـەیان داگیرکـرد کەتۆپـەکانی لێ بەسـرابوو, تۆپچـیەکان ڕایـانکردوو ئەوانـەی لەسـەنگەرەکانا مـابوون کـە شۆڕشـگێڕان نزیکــی (١٥-٢٠)مــەتر لێیانــەوە دووربــوون خۆیــانگرت و درێژەپێـدان بەشەڕەکە لەسوودی کورد نەبوو, چونکە ئەگەر درێـژەی بکێشایە لەوانەبوو تورکــەکان یارمەتیــەکی زۆریــان بــۆ بێــت لەبەرئــەوە شۆڕشــگێڕان بەسـەرکردایەتی (فتـوشمکی) ئـەو خانووەیـان گـرت کـە کـەوتبووە ڕێگـەی نێوان (بورنی سوور) و بنکەی (بایزید) کە بەوە ڕێگا لـەوە گیرا کە یارمـەتی بگاتە دوژمن.

هێزی سوارەی تورك لەپشـت (تـاش بـوردن)دا خـۆی مۆڵـدابوو بـەڵام نـەی ئـەوێرا بـەرەو پێشـەوە بڕوات چـونکە مـەترەلیوزەکانی (فتـو) ڕێگـەی ئـەوەی نەئـەدا کەسیان سـەر دەربێنن و لەگێـژاوی ئـەو تـەق و هـووڕەدا دوو سـواری کـورد لەناوچـەی (هاوروشـخلو) دەرکـەوتن کـە ڕویـانکردبووە ئـەو گـردەی شەڕەکەی تیادا دەکراو تەواو لـەوە نزیـك بوبوونـەوە کـە مـەترەلیوزی دوژمـن بیانگـاتێ, دوژمـن نەیـدەزانی یـەکێك لـەو سوارانە سـەرکردەی شـۆڕش بـوو

(ئیحسان نوری مەبەستی خۆیەتی)و ئەوی تریان (بروهسکی)بوو ئەگەر تورکەکان بەوەیان بزانیایە بەهەر نرخێك بوایە لەناویان دەبردن.

ساتێك دوو سوارەکە چوونە پێشەوە سەرکردەی شۆڕش ڕویکردە دوژمن و هاواری کردوو پێی ووتن:

من ئیحسان نوریم بۆ ئەوە هاتووم پێتان ڕابگەیەنم کورد نایەوێ زیانتان پێ بگەیەنێت، باشتر ئەوەیە چەکەکانتان فڕێ بدەنە سەرزەوی و هیچ پێویست بەوە ناکات بترسن.

سەربازەکانی تورك دەمودەست چەکەکانیان فڕێداو شەڕەکە لەوێدا کۆتایی پێهات و زیانی تورك لەم شەڕەدا زۆربوو، سەرۆکەکەیان کوژرابوو، بەڵام بەداخەوە گەلێك گوللەش بەر سنگی (ادو امکی هسەسوری) کەوتبوو، ئەو سنگەی پڕبوو لەخۆشەویستی و دڵسۆزی خاوێن بۆ خاکی پاکی نیشتمانەکەی.

بەیارمەتی دیلە تورکەکان توانرا ڕووی لوولەی تۆپەکان ئاراستەی سەربازگەی سەربازگەی (بایزید) کراو چەند تۆپێکی پێوەنرا، بەڵام بەداخەوە ژمارەی ئەو گوللە تۆپانەی دەستگیرکرابوون تەنها حەوت گوللە بوو، تۆپەکانیش زۆر قورس بوون توانای گواستنەوەیان نەبوو بگوێزرێنەوە بۆ شوێنە بەرزەکانی چیاکە، لەبەرئەوە تۆپەکانمان تێکداو بەجێمان هێشتن بۆ ئەوەی تورکەکان بەکاریان نەهێنن.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٩٩)ی یاداشتەکەیداباسی نوێنەری ئەرمەنیەکانی کردووە کە ناوی (ڤاهان)بوو کە ئەفسەر بوو لەسوپای ڕووسدا، لەو کاتەدا لەگوندی (شیخلو) بوو لەسەر گردێکی نزیکەوە دەیڕوانیە کۆڕی شەڕەکە، کە ئەوانەی ناردبونی بۆ (بۆرنی ڕەش)

بەسەرکردایەتی (فرزندە بەگ)بو کە لەسەرەتای شەڕەکەدابریندار کرابوو, یارمەتیدەرەکەشی کە (نورو)ی کوڕی (موسی بیرکی)ی ئازاو دلێر بوو بەداخەوە لەو شەڕەدا کوژرابوو.

وەرگێڕی یاداشتەکەی ئیحسان نوری,صلاح بروراری لەپەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا ئاماژەی بۆ نامیلکەکەی (ئاپۆ عوسمان صبری)کردووە کە لەو نامیلکەیەدا باسی بریندار‌بوونی فرزندە بەگی کردووە کەچۆن بەو برینداریەش کوڕی شەڕەکەی بەجێ نەهێشتبوو.(ئەو فرزندە بەگە کە شۆڕشەکە شکاو پاشەکشەی کردوو چووە ئێران لەوێ ئەو زامەی کوشندە بوو لەوێ بەئاوارەیی کوشتی وەکو لەشوێنی تردا باسی ئەو ئاوارەبوونەی دەکرێت).

ئیحسان نوری لەباسەکەیدا دەڵێت: لەو کاتەدا •بروهسکی) بەتاقی تەنیا لەشاخی (قوتیس)ەوە ڕوویکردە شۆڕشگێڕەکان بۆ یارمەتیدانیان, لەبەرئەوەی فرزندە بەگ بریندار بوو (نورو)ش کوژرابوو, بۆیە لایان وابوو ئەو سوارە (کە بروهسکی بوو) لەلایەن تورکەکانەوە نێررابوو بۆ یارمەتی دوژمن, لەبەرئەوە شۆڕشگێڕەکان کشانە دواوە بۆ ئاگری‌و بروهسکی‌ش ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ ئاگری.

ئیحسان نوری دوای ئەوەی باسی چەند ووردە شەڕێکی‌تر دەکات لەگەڵ بۆردومانکردن لەلایەن فڕۆکەکانەوە لەلاپەڕە (١٠٢)دا وتوویەتی:

حکومەتی تورکیا (کمال الدین سامی پاشا)ی باڵیوزی لەبەرلینەوە هێنایەوەو کردی بەسەرکردەی هێزەکانی دژی شۆڕش‌و ئەو جەنراڵە شاری (وان)ی کرد بەبنکەی خۆی, ئەو (کمال الدین)ە کاتی خۆی لەساڵانی (١٩١٩-١٩٢٠)دا سەرکردەی فرقەی نۆهەمی تورك بوو لەقفقاس‌و نوێنەری

مستەفا کەمالیش بوو لەئەستەمبول و لەو ساڵانەدا ئیحسان نوری دژی حکومەتی فرید پاشا بوو لە ئەستەمبول، بۆیە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ کمال الدین سامی پاشاداو ساتێك حکومەتی فرید پاشا کەوت و علی رەزا پاشا چووە جێگەی کە پێوەندی خراپ نەبوو لەگەڵ مستەفا کمالدا، ئیتر ئیحسان نوری خۆی دورخستەوە لەفەرمانی ڕەسمی و بۆ جارێکیتر کمال الدین پاشا کرایەوە بەقائدی فرقە، لەبەرئەوەی (کمال الدین پاشا) شارەزاییەکی زۆری هەبوو دەربارەی ئیحسان نوری و ئەو شارەزایەتییەی بەحکومەت ڕاگەیاندبوو، وەکو دەوترا لەبەرئەوە بوو حکومەت کمال الدین پاشای لە برلینەوە هێنابووەوە.

دوای ئەمە ئیحسان نوری لەلاپەڕە (١٠٦)ی یاداشتەکانیا چۆتەوە سەرباسی درێژەپێدان بەشەڕو وتوویەتی:

هێرشەکانی کورد لەسەرەتادا بەسەرکەوتووی دەستی پێکرد، بەڵام بەداخەوە سوودی نەبوو چونکە لەڕاستیدا ژمارەی شۆڕشگێڕان بەرامبەر بەهێزەکانی تورك وەکو دڵۆپێك ئاو وابوو لەچاو ئاوی ڕووباری تورکەکانا، لەبەرئەوە تەنها هەر تاقە ڕێگەیەك مابوو کە بریتی بوو لەوەی بکوژیت یابکوژرێیت.

ساتێك شۆڕشگێڕان هێرشێکی توندیان کردە سەر دوژمن لەجەبهەی (قورطان)ی لای باکوری چیای (کوبگول) کە لەژێر دەسەڵاتی تورکدا بوو، توانیبویان هەندێ شوێن بگرن و پاشەکشەیان بەتورك کردبوو بەرەو (قاباق تەپە)و دوژمنیان شپرزەکرد بەڵام لەمە زیاتر نەیانتوانی مەبەستە سەرەکیەکانیان دەسگیر ببێت چونکە ژمارەی هێزەکانی دوژمن ئێجگار زۆربوو، کە شۆڕشگێڕەکانمان دیلەکانیان دەگرت یەکسەر چەکەکانیان لێ

دەسەندن و بەرەلآیان دەکردن, ئەو ناوچەیەی لەژێر دەسەلآتی ئاگریەکاندا بوو بێ سووتەمەنی بوو, بێ ئاو بوو, برسێتی کاری تێکردبووین, هەرچۆنێك بوو شەڕ چەند ڕۆژێکی تری کێشاو هەمیشە فڕۆکەکان بۆردومانیان دەکردین و کوژراوو بریندارمان تادەهات زۆرتر دەبوو, لەبەرئەوە پاش چەند ڕۆژێك بەتاریکایی شەو هێزەکانی ئاگری توانییان پاشەکشە بکەن بۆ شاری (باشکند) لەباشووری ڕۆژهەلآتی ئاگریدا کە مرکزی ناوچەی (ئارالۆ). کە دانیشتوەکانی تورکمان بوون کە شارەکە نزیکی ئاوی ئاراسە لەسنوری سۆڤێتداو بەر لەڕۆژهەلآت هێزەکان شارەکەیان داگیرکردوو ئەو هێزەی تورك کەلێی بوو شارەکەی بەجێ هێشت و هێزی کورد دوایان کەوت و لەکاتێکدا لەڕێگەی ٠اخدر)ەوە دەکشانە دواوە ڕێگەی لێگیراو نەیتوانی خۆی دەربازبکات و ناچاربوو کشایە دواوە بۆسەر سنوری سۆڤێت و پاش ئەوەی زیانێکی زۆری لێ کەوتبوو نیوەی هێزەکەیان کە بریتی بوو لە(١٥٠) سەرباز نیوەیان لێ بەدیل گیران جگە لە(٣٠)کەسی تریان کە لەناو شاردا دەستگیر کرابوون و لەدواییدا حکومەتی سۆڤێت پێشوازی لەو تورکە ڕاکردوانە کرد کە بەخۆیان و چەکەکانیانەوە ناردیاننەوە بۆ شاری (أخدر) لەڕێگەی (نارڤارا)وە.

دانیشتوانی (باشکندر) بەگەیشتنی ئاگریەکان زۆر شادمان بون و پێشوازییان لێکردن و مەڕیان بۆ سەربڕین بەرامبەر بەئالأی کوردستان کەلەجیاتی ئالأی تورك بەرزکرابوەوە لەسەربانی خانووی حکومەت لەناوشاردا.

(ملا حسین) کە تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەری ناسراو بوو لەناوچەی (وان)ەوە هاتبووە ئاگریو لەناو عەشیرەتی (گلتوری)دا گوزەرانی دەکرد, بڕیاریدابوو لەگەڵ (عمر بسی)ی سەرۆکی عەشیرەتی (گلتور)و چەند چەکدارێکی تری لێهاتوو (تاش بورون) داگیربکەنو ڕێگە لەگەیشتنی یارمەتی بگرن بگاتە تورکەکان لەدوای هێرش بردن بۆسەر (باشکندر).

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێ: ئەو (تاش بورون)ە ئەوە نیە کە عائدی بایزیدە بەڵکو شوێنێکی ترە کە کەوتۆتە نێوان (أخدر)و (باشکند).

ئەو شەڕە هەشت سەعات درێژەی کێشاو هەروەکو (زوهدی گویفن) لەیاداشتەکانیا باسیکردووە ڕۆژی دوای دەستپێکردنی ئەو شەڕە حکومەت فرۆکەیەك سەربازی نارد بۆ (تاش بورن)و داگیری کردو پاش چەند ڕۆژێك (عمر بسی) سەرۆکی عەشیرەتی کلتوری بۆ تۆلچەسەندنەوەو بۆ پینەکردنی ئەو هەڵەیەی کە کردبووی لەهێرش بردنیا بۆسەر (تاش بورن) و بەو پەڕی ئازایەتییەوە شەڕیانکردو دوژمنیان ناچارکرد بەپەلە پروسکێ لەچادرەکانیان ڕایانکرد, بەلأم بەداخەوە لەکاتی شەڕدا گوللەیەکی دوژمن بەرسنگی ئەم پاڵەوانە (مەبەستی عمر بسی) کەوتو شەهید کرا.

دوای ئەمە شۆڕشگێڕەکان درێژەیان بەهێرشەیەکەیاندا گەلێك شوێنیان لەبەرزاییەکان لەچنگی تورك ڕزگار کرد, بەلأم زۆری پێ نەچوو تورکەکان یارمەتیەکی زۆریان گەیاندە (أخدر) بەئۆتۆمبیلی لۆرییو بەرامبەر بەو هێزە زۆرە تازەیە شۆڕشگێڕەکان نەیانتوانی ئەو بەرزاییانەی گرتبویانن بیان پارێزنو ناچاربوون کشانەوە بۆ بنکەکانی خۆیان.

هەروەکو ئیحسان نوری ئاماژەی بۆ کردووە, زوهدی گویفن لەیاداشتەکانیا نوسیویتی:

((ڕۆژی (٧/مانگی ئاب) چەتەکان لەناوچەی (ئارالق) خۆپیشاندانێکی شێتگیرانەیان کردوو بۆ ئەوەی طابوورێکی پیادەو چوار تۆپ لەژێر سەرکردایەتی (کامل بەگ)ی قائد فرقەدا نێررا بۆ(تاش بوردن)و جگە لەوە فەوجێکی سوارەش لەگەڵ طابورێك لەهێزەکانی بنکەی (اخدر) خرانە ژێر دەسەڵاتی فرقەوەو خەریك بوو (تاش بورن) تووشی کارەساتێکی گەورەیان بکات کە لەڕۆژی (٩/ئاب)دا قائدی فرقە بەتەلەفۆن ئاگادارکرا کەوا کوردەکان نیازیان وایە هێرش ببنە سەر (ئارالق)و بۆ ئەوە فەوجێك و طابورێك لەهێزەکانمان بەسەرکردایەتی (فواد بەگ) نێرا بۆ ناوچەی (ئارالق)و پاش ئەوە زانیمان کە کوردەکان بەشەو هێرشیان بردۆتە سەر (تاش بورن) ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرو سەربازیان کوشتووەو بریندار کردووەو ئیحسان نوری بەخۆیو هێزێکی (٤٠٠)چەکدارەوە پەلاماری هێزەکانی ئێمەی دابوو لەجبهەی (ئارالق)بۆ ئەوەی دەستبگرێت بەسەر چەك و جبەخانەکانی ناو (تاش بورن)و ئیحسان نوری هێزێکی بەسەرکردایەتی (عمر بسی) نارد بۆ (تاش بورن)و لەویێ زیانێکی زۆر گەیەنرا بەهێزەکانمان)).

ڕۆژنامەی (جمهوریت)ی تورکی دەستیکرد بەبڵاوکردنەوەی بەسەرهاتەکانی چل ساڵ لەمەوبەر کە ئەوەی پەیوەندی بەکوردستانەوە هەبوە بەم جۆرە بوە:

لەژمارەی ڕۆژی (٢٧/تمموز/١٩٣٠)دا لەژێر ناوی (کوردەکانی هەکاری)دا ووتراوە:

((ئەو چەتانەی ئاژاوەیان دەنایەوە لەسەر سنورەکانمان و لەناو خاکی وڵاتدا هەموویان بەتەواوەتی لەناوبران و ڕیشەکێش کران، بەڵام لەمەی ئەم

جارەیانا( مەبەستی شۆڕشی ئاگرییە) شتێکی تریان بەرپا کردووە لەلای سنوری عێراقەوە کە (شێخ هرزل) ئەوی لەموصل دادەنیشت هێزێکی (٥٠٠)سواری ناردووەو پەلاماری ناوچەکانی هەکاری داوە لەرۆژانی (٢١-٢٢/تەموز) پاسدارانی سنوور بەتوندی بەرەنگاریان بونەوەو ناچارکران پاشەکشە بکەن بۆ باشوور دوای ئەوەی زیانێکی زۆریان لێ کەوت.

لەچیای ئاگری هێشتا هەڵوێست هەروەکو خۆی وایەو (صالح ئومورتاغ پاشا) کە سەرکردەی هێزێکی گەورەیە کرا بە لێپرسراو بۆ هێرش بردن بۆسەر چەتەکانی ئاگریو هێرشی دووەمان بەم نزیکانە دەست پێ دەکاتو چەتەکان جاروبار لەشاخەکان دێنە خوارەوە بۆ پێدەشتی (أخدر)و زیانێکی زۆریان لێ کەوتووەو هەموویان ڕاودەنرێنو لەناودەبرێن, ئەوانەشیان کە لەشاخی ئاگریدان لەپشتەوە ئابلوقە دراونو ڕێگەی ئەوەیان لێگیراوە بتوانن خۆیان بگەیەننە ناو خاکی ئێرانەوە.

سەرکردەی چەتەکانی ئاگری ئیحسان نورییە کە ئەفسەرێکی یاخیبووی ڕاکردووەو ئەو خائنە بەر لەمە لە موئتەمەری ڕاپەڕیوەکانا بەشداری کردبوو (مەبەست ئەو ڕاپەڕیوانەیە کە لەدوای شەڕی جیهانی دژی داگیرکەرانی تورکیا دەستیانکردبوو بەبزوتنەوە)و لەکاتی خۆیدا لەبەر پێی غازی گەورەدا (مەبەست مستەفا کەمالە) زەوی ماچکردبوو ئیحسان نوری لەموئتەمەری شەڕدا هەندێ داخوازی دەربارەی کورد خستبووە بەرچاو, بەڵام ساتێك داخوازیەکانی پشتگوێ خرا پەنای بردە بەر چیا(مەبەستی ڕوداوەکەی بیت الشبابە کە بەرلەدەستپێکردنی شۆڕشی پیران ڕویدابوو وەکو لەباسی چوارهەمی بەشی دەیەمی بەرگی دووهەمدا

بەدورودرێژ باسی ئەو ڕوداوە کراوە)، ئێستە چەتەکان بە (مشیر – جنرال) ناوی ئەبەن کەخۆی خەڵکی شاری بدلیسەو ژنەکەی بەرەگەز تورکە)).

لەڕۆژنامـــــەی (جمهـــــوریتی تـــــورکی)دا لــــەژمارەی ڕۆژی (٢٩/تەمـوز/١٩٣٠)باسـێکی دەربـارەی ئـاگری بڵاوکردۆتـەوە کـە ئەمـە کورتەکەیەتی:

((هەڵوێسـت لەئاگریـدا هـەروەکو خـۆی وایـەو بۆمبـای فڕۆکـەکانمان چەتەکانی تەواو پەرێشان کردووەو هیوای ئەوەیان نەماوە بەهیچ شێوەیەك ڕزگاریـان ببێـتو توانـای هـیچ جۆرە پـەلاماردانێکیان نـەماوەو بـەر لەچەند ڕۆژێك بەیانێکیان بڵاوکردۆتەوە کە تیایا وتویانە: برا کوردەکانمان دەتوانن بـبن بەنەتەوەیـەکی گـەورە، ئیمـڕۆ هـەموو میللـەتێك بـێ ووچـان لـەپێناوی سەربەخۆیدا خەبات دەکاتو میللەتی ئێمە ئیمڕۆ هێشتا لەژێر باری گرانی تورکـدا دەناڵێنێـت!! ئایـا لەمـەودواش هـەر دەتانـەوێ لـەژێر بـاری گرانـی بەندایـەتی تورکـدا بمێننـەوە؟ وڵاتەکـەی ئێمـە فراوانـە، لـەڕۆژئاواوە هـەتا سنووری ئێران دەگرێتەوە لەباشوریشەوە دەگاتە ناو خـاکی عێـراق، ئـەم ناوچانە هەر لەکۆنەوە شوێنی باووباپیرانمان بوون کەوا ئیمڕۆ لـەپێناویا شـۆڕش دەکـەین، کەواتـە هەڵسـنو ڕاپـەڕنو دەسـت بکـەن بەتێکۆشـانو خـەباتی پـیرۆز... هـەروەها بیسـتومانە بێجگـە لـەخۆیبون کۆمـەڵێکی تریشیان پێکهێناوە بۆ ئەوەی هەموو کورد یەك بخات)).

ڕۆژنامەی (جمهوریت) لەژمارەیەکی تریا، لـەڕۆژی (٣٠/تەمـوز/١٩٣٠) باسێکی تری بەم شێوەیە بڵاوکردۆتەوە:

((هەواڵنێری ڕۆژنامەی تایمس لە ئەستەمبول ڕاپۆرتێکی ناردووە بۆ ڕۆژنامەکەیو وتویەتی:

هـەزاران چـەتەی کـورد لەچـیای ئـارارات دەسـتیان بەسـەر چـەند شـوێنێکی قایمـدا گرتـووەو کوردەکـانی ئێـران یارمـەتیان ئـەدەن و حکومەت بۆ کوژانـەوەی ئەو شۆڕشە هێزێکی گەورەی ناردووە بۆ ئەو ناوچـانە کـەژمـارەی ئـەو هێـزە بریتییـە لـە(٦٦)هەزار سـەرباز بـەپاڵ پشتی(١٠٠) فڕۆکە)).

ئیحسـان نـوری دەڵێـت: زوهـدی گـویڤن لەیاداشـتەکانیا دەربـارەی هەڵوێست ووتوویەتی:

((حکومەتەکەمان بەپێویستی زانی کاروبار لەگەڵ حکومەتی ئێراندا ڕێك بخات و بۆ ئەو مەبەستە دوا احتجاجی بەر لە (٤-٥)ڕۆژ لەمەوبەر ناردووە بۆ حکومەتی ئێران کە ناوەڕۆکەکەی جۆرە هەڕەشەیەك بوو, بۆ وەرامی ئەوە حکومەتی ئێران وتوویەتی:

پێوەندی ئێمەو تورك پێوەندییەکی مێژوویی و دۆستانەیەو ئەوی لەو نامەیـەی حکومـەتی تورکـدا هـاتووە جێگـەی داخـە چـونکە ئێمـە هـیچ پیوەندییـەکمان نیە بـەو ڕاپەڕینـەی لـەو نامەیـەی حکومـەتی تورکیـادا باسیکراوە)).

هەروەکو زوهدی گویڤن باسیکردووە حکومەتی تورکیا لەنامەی دوهەمیا کەبۆ ئێرانی ناردووە وتوویەتی:

((پێویسـتە دۆسـتایەتی نێوانمـان لەسـەر بناغـەی ئـەوە پێـك بێـت کـە هەردولامان سنوری هاوبەش بپارێزین و ڕێگە نـەدرێت بەهەندێ کـەس لـەو سـنوورە بپەڕێتـەوە کـە ئـەو پەڕینەوەیـە زیـان بەدراوسـێکەی بگەیـەنێت و ئەولایەی پاڵ پشتی ئـەو چەتانە بی‌و یارمـەتیان بـدات ڕێـزی لای لاکەی‌تر نامێنێت و بوونی دۆستایەتی لەو جۆرە هیچ مانایـەکی تیـادا نیـەو ئێمـە لای

خۆمانەوە ئامادەین هەموو جۆرە چەکێك بەکاربێنین‌و چەتەکان ڕاو بنێین‌و ئەگەر پێویستی کرد دوایان دەکەوین بۆناو خاکی ئێرانیش)).

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (١١٠)ی یاداشتەکەیدا باسی ئەوەی کردووە کەچۆن یارمەتیدانی ئێرانیەکان بۆ توورك بوو بەهۆی ئەوەی ڕیزەکانی شۆڕشگێڕان لەئاگری پەرەوازەو پرش‌و بڵاوببنەوەو بوو بەهۆی ڕوخانی بنکەی شۆڕش لەئاگری‌و ئەو یارمەتیدانەی ئێران بۆ تورك لەدوای هەرەسهێنانی شەڕەکەی (دۆڵی زیلان)ەوە دەستی پێکردو ساتێك هەندێك لەخێزانەکانی ناوچەکە بەناچاری پەنایان بردە بەر عەشیرەتی (جلالی) لەناو خاکی ئێراندا (عەشیرەتی جلالی لەناو سنوری تورکیاو ئێراندا بوون‌و ئەوانەی ناو تورکیا لەناوچەی بایەزیدا بون‌و ئەوانەی ئێرانیش لەناوچەی (ماکو)و ئەمانەی ناو خاکی ئێران کاتی خۆی لەساڵی (١٩٢٠)دا لەتورکیاوە پەنایان بردبوە بەر ئێران‌و لەدوایدا سەرۆکەکەیان کە لەتاران بوو لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە گیرا)).

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێت: تیرەی ٠خلکان) کە بەشێکە لەعەشیرەتی جلالی لەمیلی سنووری تورکیاو ئێراندا لەناوچەیەکدا کە پێی دەوترێ (ئوفاجیك)، تورکەکان بەبیانوی ئەوەی خێزانە ئاوارەکانی کورد لەتورکیا لەساڵی (١٩٣٠)دا لەسنوور دەپەڕینەوە بۆناو خاکی ئێران، فڕۆکەکانیان لەڕەشماڵەکانی تیرەی (خلکان)یان ئەدا لەناوچەی (چالدێران)دا سەرۆکەکەیان کە (خالد ئاغا)بوو خۆی‌و عەشیرەتەکەی کەوتنە ژێر بۆمبابارانی فڕۆکەکانی تورك‌و خالد ئاغا خۆی‌و تاقمەکەی ناچاربوون چوونە (ئوفاجیك)و ئێرانیەکان نەك هەرخۆیان بێدەنگ کرد بەرامبەر بەو بۆردومانکردنە بەڵکو سەرەڕای ئەوە سەرکردەی هێزەکانی ئێران لە(ماکو)

بڕیارێکی دەرکرد کە پێویستە خالد ئاغاو تاقمەکەی بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان بۆ ئەو شوێنەی تورکەکان بۆردومانیانکردبوو...

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا دەڵێ: لەڕاستیدا نەدەزانرا مەبەستی ئێرانیەکان لەو بڕیارەیان چیبوو؟ ئایا دەیانویست ئەو هەموو خێزانانە لەژێر بۆمبای فڕۆکەی تورکدا بکوژرێن و لەناوببرێن یاخوود بۆ ئەوە بوو ناچاریان بکات خۆیان تەسلیمی تورکەکان بکەن.

پاش کێشەو بێنەو بەرەیەکی زۆری نێوان کاربەدەستانی ئێران و ئەو عەشیرەتەدا کە ئەمانە سووربوون لەسەر ئەوەی ماڵ و منداڵەکانیان نەنێرنەوە بۆ شوێنی بۆردومانکراو، (فتح الله خان)ی رائد موساعیدی سوپای ئێران لەگەڵ تاقمێك سوار چوونە سەر عەشیرەتەکەو دووبارە هەڕەشەیان لێکردن ئەبێ بڕیاری حکومەتی ئێران بەجێ بێنن و لەئەنجامدا فتح الله خان دەمانچەکەی دەردەهێنێت و محمد ئاغای برای خالد ئاغا دەکوژێت و سواری ولاغەکەی دەبێت و خۆی دەرباز دەکات بەلام ئەو سوارانەی لەگەڵیا بوون هەموویان دەگیرێن و چەکەکانیان لێ دەستێنن و لەپاشدا بەریاندان و عەشیرەتەکە ناچاربوو بەشەو کەوتە ڕێو کە گەیشتە ناوچەی (گا جوت) سەربازەکانی بنکەی سوپای تورك گوللە بارانیان کردن و ئەوانیش پەلاماری شوێنی سەربازەکانیان داو بەئەفسەرو سەربازەوە هەموویان گرتن و چەکەکانیان لێ سەندن و توانیان بگەنە ئەو شوێنەی کە مەبەستیان بوو.

ڕۆژی دوایی هەواڵی کوشتنی محمد ئەمین ئاغای برای خالد ئاغا گەیشتە ئاگری‌و بۆ ئەوەی هەڵوێست زۆرتر ئاڵۆز نەبێت لێپرسراوی کورد لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی ئاگری چونە لای عەشیرەتی جلالی‌و گیراوەکانی

ئێرانیان بەرداو بەخۆیان و چەکەکانیانەوە نێررانەوە بۆ (ماکو)و لێپرسراوی کورد نامەیەکی نارد بۆ (جنرال حسن خان مقدم)و پێی ووت ئێوە چی بەباش دەزانن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ئێمەش ئامادەین بەو جۆرە رەفتار بکەین و لەوەرامی ئەمەدا جەنرال حسن خان ئەفسەرێکی نارد کە ناوی (ئاغا لاروف)بوو بەلێپرسراوە نێرراوەکەمانی وتبوو کەوا (موسی ئیبراهیم) راپۆرتێکی بۆ ناردوین و لەو راپۆرتەیدا وتوویەتی سوارەکانی ئاگری خۆیان ئامادەکردووە هێرش ببنە سەر سنووری ئێران و ئەو موسی ئیبراهیمە لەسەر گردی (ئایبەی) رەشماڵی هەڵدابوو، بەلام وادیاربوو ئێرانیەکان بەزۆر ئەو راپۆرتەیان بەو شێوەیە پێ نوسیبوو، ئیحسان نوری بۆ دڵنیاکردنی ئێرانیەکان خالد ئاغای لەسەرکردایەتی عەشیرەتی جلالی لادەبا وە(ئامۆ)ی کوری لەجیاتی باوکی کرا بەسەرۆك، ئیحسان نوری لەلاپەرە (١١٦)ی یاداشتەکانیا وتوویەتی:(ئاوارەکانی دۆڵی زیلان هاتنە ئاگری و بەمە ژمارەی ژن و منداڵ ئێجگار زۆربوو، کێشەیەکی زۆرمان تووش بوو بۆ دابینکردنی خۆراك.

(لزگین سلو) کە گەورەی سەرۆکەکانی (ساکی) بوو رەشماڵەکانی لەلاپاڵی ئاگریدا هەڵدابوو، لای ئەو ئاوێکی زۆرو مشە هەبوو بۆ هەموو مەڕو ماڵاتەکان، بەلام بۆ نەگبەتی کە ئەو ئاوارانە گەیشتنە ئەوێ ئاوەکە ووشك بوو کە بەهەزاران ساڵ بوە کەس نەیبیستبوو ئەو ئاوە قەت ووشکی کردبێت.

*باسی نۆهەم*

## دوای هێرش و شکاندنی شۆڕش

ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا، لاپەڕە (١١٧) باسێکی تەرخانکردووە بەناوی (دوا شۆڕش)و وتوویەتی:

((فڕۆکەکانی تورك بێ وچان بۆردومانی دانیشتوانی ئاگریان دەکردو چەکی کوردیش بەرامبەر بەو فڕۆکانە بریتی بوو لەو تفەنگانەی هەیان بوو، بۆیە ئیتر چارنەماو کاتی ئەوە هات دەبوایە لووتکەی چیاکە بەجێ بێڵین و بگەڕێینەوە بۆناو دۆڵەکان و (نادر بەگ)ی ئازاو نەبەردی کوڕی حسین پاشا خۆی و سوارەکانی ئاگری یان بەجێ هێشت بۆ ئەوەی خواردن بۆ ئەو هەموو خەڵکە پەیدا بکەن.

ئیحسان نوری دەڵێ: لێرەدا پێویستە بڵێم (ممۆ، نادر) هەردوو کوڕەکەی حسین پاشا بەپێچەوانەی باوکیان، بەجووتە لەڕێگەی میللەتی کوردا خەباتێکی سەختی ئازایانەیان دەکردو هەموو هاوولأتیان خۆشیان دەویستن و ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرتن لەگەڵ ئەوەشدا کوشتنی حسین پاشایان لەلایەن (مدنی) کوری (حاجی موسی بەگی سەرۆکی ناوچەی (موش) پێ ناخۆش بوو چونکە (مدنی) کابرایەکی پیاوکوژی خائن بوو

(لەباسی شەشەمدا – خۆئامادەکردن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە باسی ئەو خیانەتەی (مدنی)کرا کەچۆن حسین پاشای باوکی (ممۆ, نادر)ی کوشتبوو.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکانیا دەڵێ: دەربارەی پەیداکردنی خواردن, حاکمی ماکۆ ملازمی یەکەم کە (ئاکالاروف) بوو ناردی بۆلای سەرکردەی شۆڕش و پێی ڕاگەیاند کە ئاگری‌یەکان دەتوانن کاروانێك بنێرن بۆ ماکۆ بۆ ئەوەی لەوێ هەرچیەکیان پێویست بێت دەتوانن بیکرن و بیبەن, کاتی گەیشتنی کاروانەکە بۆ (ماکۆ) باڵوێزی سۆڤێت ئاگاداری ئەو گەیشتنە بوو, تورکەکانی ئاگادار کردبوو ئەو کاروانە بۆچی هاتبوون, لەڕاستیدا ئەو یارمەتیانەی حاکمی ماکۆ کارێکی باش و پیاوانە بوو ئەگەر ئەمەی بەنیازێکی پاك و باش بکردایە لەکاتێی واقات و قڕی و تەنگانەدا, بەڵام بەداخەوە دەرکەوت لەسەرەتاوە بڕیارەکە بریتی بوو لەپلان و غەدر کردن بۆ ئەوەی خەباتی ئاگریەکان دامرکێنێتەوەو کۆتایی پێ بێت.

ئاگریەکان کەلایان وابوو ئەوانیش وەکو ئێرانیەکان لەڕەگەزی ئارین بەبیریانا نەدەهات ڕۆژێك لەڕۆژان ئێرانیەکان بەو جۆرە خیانەتیان لەگەڵا دەکەن و هەر لەبەر ئەوەش بوو بەخۆشیەوە کاروانێکی گەورەیان ناردبوو بۆ ماکۆ, بەڵام دوای ناردنی ئەو کاروانە هێزێکی گەورەی تورك کە ژمارەیان (٣٣)هەزار بوو بەپاڵپشتی چەکی قورس و فڕۆکە هێرشیان بردە سەر بنکەی ئاگری و لەهەمان کاتدا ئێرانیەکانیش لەپشت ئاگریەوە خاکی خۆیان خستە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی تورك بۆ لەناوبردنی شۆڕشگێڕەکان, بەو جۆرە دەرکەوت یارمەتیدانەکەی ئێران چاوبەست و درۆ بوو, ئەم ناپاکییەیان لەوەشدا زۆرتر ڕوون بوەوە کە حاکمی ماکۆ پێوەندی بەعەشیرەتی (قزلباش ئوغلو)ی کورد کردبوو کە ئەم عەشیرەتە

چەند ساڵێك بوو لەخزمەت حکومەتی تورکدا بوو, تورکەکان لەو ڕۆژەدا ئەوەیان پێ سپاردبوون پارێزگاری لەبەشی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاگری بکەن‌و هانیان دان کە بچنە ناو خاکی ئێرانەوە کە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان بوو لەڕابردودا پاش ئەوەی بەڵێنی لێخۆشبونیان پێ درابوو (دیارە لەلایەن ئێرانەوە).

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا لەلاپەڕە (١١٩) باسی تەقەلای تورکەکانی کوردووە کەچۆن بەدرۆ بەڵێنیان بەهەندێ کەس دابوو دەتوانن بچنە شوێنی خۆیان ئەگەر واز لەشۆڕش بهێنن‌و لەو ڕووەوە نامەیان ناردبوو بۆ (بروهسکی) و (شیخ عبدالقادر)و پێیان ڕاگەیاندبوون کەوا حکومەت لێیان خۆش بووە, بەڵام ئەوان دەمێك بوو لەدرۆو دەلەسەو جەورو ستەمی تورك گەیشتبوون, بۆیە ئەوانەی نامەیان بۆ نێررابوو بێجگە لە(حسن ئاغای حیدری)و بایز ئاغای کوڕی بەولاوە کەسی‌تر نەچووە لای تورکەکان... هەندێ لەعەشیرەتی حیدری ویستیان هەردوکیان بکوژن. بەڵام ئاگریەکان ڕێگەی ئەوەیان پێ‌نەدان کە پیاوێکی پیری وەکو حسن ئاغا بکوژرێت, هەرچەند لەدوایدا بۆمان دەرکەوت تورکەکان زۆری پێ نەچوو لەزیندانا ئەشکەنجەیانداو کوشتیان.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (١١٩)دا باسی دوا هێرشی تورکی کردووە بۆسەر شۆڕشگێڕان‌و چۆن پەیتا پەیتا هێرشیان بردۆتە سەریان هەتا تەنگیان پێ هەڵچنین.

ئاگریەکان زۆر دڵنیابوون لەوەی هێڵی پشتەوەیان کە بریتی بوو لەسنوری ئێران هیچ مەترسییەکی نەبوو چونکە ئێرانیەکانیان بەبێ لایەن

دەزانی, بۆیە هەمووماڵو منداڵو مەڕو ماڵاتیان ناردبوو بۆ ئەو ناوچانە بۆئەوەی خۆیان بەئاسانی بتوانن بەرەنگاری تورکەکان بین.

تورکەکان هەر بەبۆردومانکردنی شۆڕشگێڕان وازیان نەهێنا بەڵکو دەستیان کرد بە بۆردومانکردنی ژنو منداڵە بێ تاوانەکانیشو بۆردومانکردنەکەیان زنجیرەی نەدەپچڕا.

لەکۆری شەڕەکەدا (بروهسکی)و هەندێ لەچەکدارەکانی (هسەسوری) لای ڕاستیانگرتبوو, بروهسکی سنگی بەسەر زەویدا چەقاندبوو, بڕیاری دابوو بەهیچ جۆرێك پاشەکشە نەکاتو تەنها مەگەر مردن بیتوانیایە تەقەی تفەنگەکەی بێدەنگ بکاتو ئەو هەموو بۆردومانکردنو پەلاماردانەی تورك کاری تێنەکردوو لەجێی خۆی نەیجولاّن.

لەڕۆژی سێهەمی بەرگریکردن لەو هێرشەی تورك, پێشمەرگەکانی ئاگری پشتیان نابوو بەتاشەبەردەکانی ئاگرییەوەو بڕیاریاندابوو دلێرانەو نێرانە تا دواهەناسەیان شەڕبکەن, بەلاّم ئەوەی کارەکەی لێتێکداین ئەوەبو کاتێك بەخۆمان زانی لەسنوری ئێرانیشەوە گرمەی تۆپو رەشاشو تفەنگ لەناوچەی (ئایبە)یەوە ئاڕاستەمان کراو ئەو گولەباران و تۆپ بارانە خەستە زۆر کاریکردە سەر پێشمەرگە, بەلاّم بڕیاردرا وەلاّمی ئەو تەقانە نەدرێتەوە کە لەسنوری ئێرانەوە دەکرانە سەرمان, تومەز ئەو تەقانە هی ئەو هێزەی تورك بوو کە لەناو خاکی ئێران خۆی حەشاردابوو, لەپشتەوە پەلاماری شۆڕشگێڕەکانی کورد درا کە ئەمە بووە هۆی نیگەرانی ئاگرییەکان لەحکومەتی ئێران کەساڵەهابوو خۆیان بەدۆستی کورد لەقەڵەم ئەداو زۆرجار کورد لەپێناوی ئێرانا دوژمنایەتی لەگەڵ تورکدا کردبوو.

بەو جۆرە گلۆڵەمان کەوتە لێژیو هەڵوێست ئێجگار سەخت بوو، لەبەرئەوە چارنەما دووبارە شۆڕشگێڕەکان ڕویانکردەوە لووتکەی چیاکانو لەڕاستیدا شەڕەکە ئەوەندە قورس بوو صالح پاشای سەرکردەی هێزەکانی تورك ناچاربوو داوای هێزی یارمەتی بکاتو توانرا چەند سەربازێکی تورك بەدیل بگیرێت، بەڵام گەیشتنی هێزەکانی تورکو بەستنی ڕێگەی یارمەتیدان بۆ پێشمەرگەکان کارێکی زۆر سەختی کردە پێشمەرگەکانو هێزەکەی بروهسکی درایە بەرتۆپو ژمارەیەکی لێ کوژراو دیمەنێکی ئێجگار سامناکو پڕ لەخەفەت بوو، لەولاشەوە ژنو منداڵ لەژێر گوللە بارانی دوژمندا پەرەوازەو سەرگەردان بوونو لەکارەساتەکەی کربلا دەچوو لەگەڵ جیاوازی هەردوو هەڵوێستدا چونکە لەوەی کەربەلادا عەرەبەکان دەستدرێژیان نەکردبووە سەر ژنو منداڵ بەڵام ڕەفتاری تورکەکان لەهەموو حسابێك دەرچووبوو، بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە بەنوکی ڕمو شیرەکانیان ورگی ژنو منداڵانیان دەدڕیو پێشمەرگەکان ناچاربوون بۆ پاراستنی حەیاو ئابروی خۆیانو بۆ ئەوەی ژنەکانیان نەکەونە ژێر چنگی ئەو دڕندانەوە وازیان لەئاگری هێناو بۆ ڕۆژی دوایی لەبەرەبەیانا مەڕو ماڵات بەجێ هێڵرا بۆ ئەوەی نەکەونە کەمینی ئابلۆقەدانی تورکەکانو خۆیان دەربازکرد کە ئیحسان نوری خۆشی لەناو ئەو دەربازبوانەدا بوە.

ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا وتوویەتی: لەگەڵ ئەو هەموو بارگرانیو ڕۆژە توشو سەختەدا، لەکاتی کشانەوەماندا توانرا هەندێ سەربازی تورك بەدیل بگیرێتو هەندێ لەشۆڕشگێڕەکان خۆیان گەیانە ناو دۆڵی (ئاخوریك)و لەوێوە لەگەڵ بروهسکیدا خۆیان دەربازکردو (رشویی سلو)ی سەرکردەی ئازای عەشیرەتی (بکران) خۆیو تاقمەکەی لەگەڵ سید رسولو

هەنــدێ لــەپیاوەکانی ڕوویــانکردە دۆڵــی (زیــلان)و تورکــەکان لــەوێ پەلاماریانـدانو (رشـویی سـلو) کـوژراو سـید رسـول کـە لەسـەر لوتکـەی چیاکانی نزیکی بایزیـد خـۆی حەشـاردابوو چـەند ڕۆژێـك مایـەوە, بـەڵام برسێتی زەیفی لێسەندو پەرێشانیکردو تورکەکان گرتیانو کوشتیان.

بـەو جـۆرە ئاگری کـە ڕەمـزی سەربەسـتی کـورد بـوو کەوتـە ژێردەسـتی دوژمنو شۆڕشەکەی لەناوچوو.

دەربـارەی ئـەو هەڵوێسـتەی ئێـران کـە ڕێگـەی دابـوو بـەهێزەکانی تـورك لەپشتەوە پەلاماری کورد بدەن, کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) ئامـاژەی بـۆ ڕۆژنامـەی (تـایمس)ی لەنـدەنی کـردووە کـە لـەڕۆژی (١٩٣٠/٨/١٣)دا دەرچـوو بـوو باسـی ئـەو هەڵوێسـتەی ئێرانـی کـردووە هەرچەند تورکەکان ئەوەی ڕۆژنامەی تایمسیان بەدرۆ خستبووەوە, کریس کوچـرا وتوویـەتی: تورکـەکان لـەو هێرشـەیانا کـە لـەڕۆژی (١٩٣٠/٨/١٠)دا کردبویـان کلکـەی (زەیتـونی) لەگـەلیی (سـەرداربلاغ) کـە لـەنێوان هـەردوو ئاراراتـدا بـوو ڕێگـەیان بـەکوردەکان گـرتو پەلاماریانـدانو لـەو شـەڕەدا ئیحسان نوری بەپەلە پروسکێ خۆی گەیاندبووە ناو خاکی ئێرانەوە.

کـریس کوچـرا ئامـاژەی بـۆ دوکیـومنیتی ژمـارە (fo.371-15369) ڕۆژی (١٩٣١/٦/١٦)کـردووە کـە لـەو دوکیومنیتـەدا دوو ڕەخنـەی گرتـووە, یەکـەم ڕەخنەی لەئیحسـان نوری گرتـووە کەوتوویـەتی دەبوایە ئیحسـان نـوری لـەو هەڵوێسـتە ناسـکەدا هەرچـۆنێك بوایـە دەبـوو ناوچـەی شـەڕەکەی بـەجێ نەهێشتایەو نەچوایەتە ئێران بۆ ئەوەی لەوێ ببێت بەپەناهەندە, چونکە کە ئەڕۆیشـتو ناوچـەکەی بـەجێ هێشـت نـەتوانرا سـەرکردەیەکیتر لەلایـەن خۆیبونـەوە بۆ شـۆڕش دابنرێـت بـۆ درێژەپێـدان بەشـەڕو خـەبات, ڕەخنـەی

دووەمیش بەشێوەیەکی گشتی لەشارەزایان و مێژوونوسانی کورد گرتووە کەبایەخێکی ئەوتۆیان نەداوە بەتۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم شۆڕشە مەزنە(بێگومان تا کاتی ئەو دوکیومنیتە یاداشتەکانی ئیحسان نوری بڵاونەکرابوەوە).

پروفیسور حسرتیانیش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٩) دووبارە باسی هەڵوێسی ئێرانی کردووە کەچۆن ڕێگەی دابوو بەهێزەکانی تورك لەپشتەوە پەلاماری شۆڕشگێڕەکانی کورد بدەن، کە بەو ڕێگەدانەی ئێران بەتورك توانرا جم و جوڵ و هات وچۆی کورد بڕن.

حسرتیان لێرەدا ئاماژەی بۆ یەکێك لەبڵاوکراوەکانی (وکالتی هەوالنیرانی ئەنادول) کردووە کە لە(١٢ی تەمموزی ١٩٣٠)دا نوسیویتی:

((بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە لەناوچەی (زیلان) کە یارمەتی لەناو خاکی ئێرانەوە دەهات بۆی پەلاماری (موخادیس، بایزید، باتنوتس، ئەرچیخ) یاندابوو، بەڵام هەموو تەقەلاکانی ئەو یاخیبوانە بێ هوودەبوو، توانرا لە(١٥ی حزیرانی ١٩٣٠)دا هەموو شتێك کۆتایی پێ بهێنرێت) سەرچاوەی حسرتیان لەباسەکەیدا ئاماژەی بۆ ژمارەی ئەو بڵاوکراوە کردووە کە بریتی بووە لە ژمارە (٨-٩)ی ساڵی ١٩٣٠ لاپەڕە (٨-٩) کە لەطاشقندە دەرچووە).

حسرتیان لەلاپەڕە (١٠٩)ی هەمان کتێبیدا دەربارەی ئەو هەواڵ و دەنگ وباسانەی کە لەڕۆژنامەکانی تورکدا دەربارەی شۆڕشی ئارارات بڵاودەکرانەوە دەڵێت:

(ئەو پڕوپاگەندانەو ئەو درۆو دەلەسانەی تورکەکان بۆ چەواشەکردنی بیروڕای گشتی جیهانی بلاًویان دەکردەوە هەموویان دووربوون لەڕاستیو لەگەڵ ڕاستی ڕوداوەکانا یەکیان نەدەگرتەوە).

حسرتیان لێرەدا ئامارەی بۆ ڕۆژنامەکانی (جمهوریەت)و میللیەت) کردووە کە وتبوویان ژمارەی چەکدارەکانی ئارارات لەوانەی شۆڕشی پیران زۆرتر بوون، کە ئەمەی ئەوان باسیانکردووە هەتا لەگەڵ ئەوەی وکالتی ئەنادۆڵدا بلاًوکرابووە یەکی نەدەگرتەوە کە ئەمەی دوایی وتبووی ژمارەی چەکدارەکانی کورد لەئارارات بریتی بووە لە (١٥٠٠) چەکدار.

حسرتیان دەڵێ لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەی وکالتی ئەنادولیش بلاًوی کردبووەوە هەر لەگەڵ ژمارەی ڕاستیدا یەکی نەدەگرتەوە، چونکە ئەگەر ژمارەی شۆڕشگێڕەکانی کورد لەئارارات هەمووی بریتی بووبێت لە (١٥٠٠) چەکدار ئاخۆ بۆچیو چۆن تورکەکان هێزێکی سوپاییی (٤٥) هەزار چەکداریان ئاڕاستەی ئەو ژمارە کەمەی کورد کردبوو)).

ئەوەی شایانی باسە ئەو ژمارەیەی پروفیسور حسرتیان باسیکردووە کە هێزەکەی حکومەت بریتی بووە لە (٤٥)هەزار، زنار سلوپی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) ئامارەی بۆ ڕۆژنامەی (تایمس)ی لندنی ڕۆژی (١٩٣٠/٧/٢٤) کردووە کە وتوویەتی: بەپێی ئەو هەواڵانەی لەڕۆژنامە تورکیەکان بلاًوکراونەتەوە ژمارەی ئەو هێزانەی حکومەتی تورك کە ڕووبەڕووی کورد بوبوونەوە بریتی بووە لە(٦٠)هەزار چەکدار.

بەر لەوەی بچینە سەر باسێکی تازە بەپێویستم زانی بێجگە لەو پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسانەی ڕۆژنامە تورکیەکانی وەکو (جمهوریەت) و (میللیەت)و بلاًوکراوەی وەکالەتی ئەنادول و درۆو دەلەسەو

پروپاگەندانەی تری تورك بخەینە پێش چاو کە ئەو هەموو درۆو دەلەسەو پروپاگاندە بلاْوکراوانە بۆ چەواشەکردنی هاوولاْتی تورکی خۆیان بووە کە تەنها بەمەبەستی سەرگرتنی چەند کەسێکی ڕەگەزپەرستی فاشستی ئەو هەموو کارەسات و کوشتارو زیانە مالْی و گیانییانەی بەسەر کوردو تورکدا هێنابوویان کردبوویان و بۆ پینەکردنی ئەو سیاسەتە فاشستییەیان کە بەپێی نەخشەی ئەوە هەموو هاوولاْتیانی تورکیایان خستبووە ژێر بارێکی قورس و گرانی ئابووری لەئەنجامی ئەوەی لەدەمی خەلْکیان دەبڕی و چەك و جبەخانەیان پێ دەکڕی و بۆ لەناوبردنی میللەتی کورد.

دوکتۆر عەزیز شەمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٢) ئامارەی بۆ هەندێ سەرچاوە کردووە دەربارەی پروپاگەندەو درۆو دەلەسەکانی تورك و کاربەدەستانی حکومەت دژی کوردو شۆڕشەکەی کوردو وتوویەتی:

((تورکەکان لەشۆڕشی ئاگریدا دەستیانکرد بەبلاْوکردنەوەی گەلیك پروپاگەندەو درۆو دەلەسە دژی کوردو لەخەلْکیان دەگەیاند ئەو بزوتنەوەو ئەو شۆڕشەی کورد بەهاندانی دەولْەتە ئیمپریالزمەکان بووە ئەگەر ئەو دەولْەتە بێگانانە واز بێنن ئیتر ولاْت سەرانسەری دەبێت بەبەهەشتێکی پڕ لەئاشتی و ئاسایش بەتەواوەتی لەهەموو لایەکدا بەرپا دەبێت)).

دوکتۆر شەمزینی ئامارەی بۆ ڕۆژنامەی (وقت)ی تورکی کردووە کە لەوتارێکیدا باسی (لورنس) ناوێکی کردووە گوایا سیخوری ئینگلیزەکان بووەو دەربارەی ئەو لورنسە وتوویەتی:

((ئەو چەتانەی (مەبەستی شۆڕشگێڕەکانی کوردە)لەمەوبەر بە بۆمبا لەناومان بردون، وائیمڕۆ بوون بەدەسکەلاو بلوێرژەنی ئەو پیاوکوژەی (مەبەست لورنسە) شەپقە دەکاتە سەری‌و بەرگی فەرەنگ لەبەردەکاو لەپشت ئەو چەتانەوە ڕاوەستاوە، کەڵبەتیژەکانی هەروەکو کەڵبەی تیژی دێوێکی گەورەو دڕندە دەبریسکێتەوە)).

سەیر ئەوە بووە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئێرانیش هەمان بالۆرەی تورکیان لێ ئەدایەوەو هەروەکو بی‌بی مەتۆ پڕوپاگەندەو ئاژۆو دەلەسەکانی تورکیان دوبارە دەکردەوەو بلاویان دەکردەوە، بۆ نموونە: ڕۆژنامەی (ئیقدام) لەژمارەی ڕۆژی (٢٦ی ئاياری/١٩٣٠)دا هەواڵێکی داتاشراوی پڕ لەدرۆو دەلەسەی بلاوکردبوەوە گوایە لۆرنس بەجل‌وبەرگی ئایینی ئیسلامەوە بینراوەو کوردەکان بەپیاوێکی پاك‌و نورانی تەماشایانکردووەو دەست‌و پێیان ماچ کردووەو ڕێزیان لێگرتووەو گوایا بەخواوەندیشی لەقەڵەم دەدەن (لام وایە ئەگەر تورك‌و ئێرانیەکان ئەم درۆیەیان بۆ هەر میللەتێکی‌تر ڕێك بخستایە دوور نەبوو هەندێ کەس باوەڕی پێ بکردنایە، بەلام بەرامبەر بە میللەتی کورد لەگاڵتەبەخۆکردن بەولاوە تێ نەپەڕیوە چونکە میللەتی کوردی سەرگەرمی ئاینی ئیسلام شتی‌وا پڕ لەسەیرو سەمەرەی بەشتێکی پەشم زانیوە).

هەروەکو ڕۆژنامەی جمهوریتی تورکی بڵاوی کردۆتەوەو ڕۆژنامەی (ئیقدام) ئاماژەی بۆ کردووە پەیامنێری جمهوری بۆ دۆزینەوەی ئەو لورنسە چووە بۆ بغدادو لەوێ بەبێ ئەوەی لورنس بەخۆی بزانێت وێنەیەکی گرتووەو بڵاوی کردۆتەوە کەوێنەکەش گوایا تاڕادەیەك لەشێوەی لورنس چووە.

(ئەو لورنسەی ڕۆژنامەی جمهوریت باسی کردووە, مەبەستی لورنسی نەفسەری بەناوبانگی ئینگلیزە کەلەلای عەرەبەکان بە ئەبو حنێك ناسراو بوە)

شمزینی بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو درۆو دەلەسەیەی ڕۆژنامەی جمهوریت ئاماژەی بۆ ژمارەکانی (٨-٩ و ١٦-١٧)ی بڵاوکراوەی ڕۆژنامەگەریی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کردووە کە لەساڵی ١٩٣٠دا لە(طاشقند) دەرچووە کە بەم شێوەیە وەرامی داوەتەوە:

(دیسانەوە بەیتو بالۆرەی (لورنس) هێنرایەوە سەرشانۆ... ئەوی ڕاستی بێ ئەوەندە باسی لورنس کراوە مرۆڤ واڵێ دەکات کەلای وابێ گوایە هەرچی ئەو دامو دەزگا سەرکوتکەرانەی ئینگلیز بەکاریان هێنابوو بۆ سەرکوتکردنی گەلان هەمووی هەر بریتی بووە لە لورنس.

ئەگەر وەکو دەوترێت لۆرنس ڕێکخەری یاخی بوونە کۆنە پەرستانەکەی ناو ئەفغانستان بووبێتو ئیمپریالیزمی ئینگلیز لەمەوپێش لورنسو لەشکرێکی فراوانی خۆی لەدورگەی عەرەبدا خستبێتە کار, کەواتە لۆرنس لەهەموو شوێنێکدا هەبوە( وەکو کورد ووتەنی دەبێ خدری زیندە بووبێت), ئیتر ئایا بۆچی ئیمڕۆش ئەو لۆرنسە بەکارنەهێنراوە بۆ دروستبوونی حکومەتێکی گەورەی کوردستان؟؟

بەلاّم دیارە لۆرنسی ناو مێشكو خەیاڵی تورکەکان پێوانەیەکی تایبەتی هەیەو دەڵێن ناوبراو جلوبەرگی ئاینی دەپۆشێت.. نوشتەو دوعای سادەو ساکار دەنوسێتو خەڵکیش ڕێزو نەوازشیان هەیە بۆیو دەستو پێی ماچ دەکەن کە لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەم کابرایەی ئەوان باسی دەکەن دەمێکە مردووەو نێژراوەو هەموو شارەزایەکی ڕۆشنبیر ئاگاداری مردنی ئەو زەلامەیەو دەزانێت کەی مردووە, ئیتر ئاخۆ ئەم درۆو دەلەسەو وڕێنەکردنەی ناو ئەو ڕۆژنامەیەی تورك چەندی بەچەند بێت؟؟)).

ڕۆژنامەگەری ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕواو ئەڵێت:

((ئەوانەی دەیانەوێ گیروگرفتو تەنگو چەڵەمەی توندوتیژی کوردستان پەردەپۆش بکەن لایان وایە بەمە ئیتر دەتوانن کێشەی کورد لەتورکیادا واپیشان بدەن توانیویانە بڵێن شتێك نەماوە پێی بوترێت کێشەی کورد کە بەوە جەوروستەمی کەمالیەکان بەرامبەر بەکورد بشارنەوەو والەکورد بکەن کوڵ بدات لەداواکردنی مافی خۆیو بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکەی لەناو ببەنو ئەوانەی بۆ داپڵۆسینی کوردو بەزۆر کردنی کورد بەتورکو فارسو لەهەموو بستێبکی کوردستاندا سەربازگەیەکی سوپایی دادەمەزرێنن, ئەو کەسانە خۆیان بەبلاّوکردنەوەی ئەفسانەکەی لۆرنس ڕیسوا دەکەنو کورد بەوە ناوی نازڕێنرێت)).

***باسی دەیەم***

## سزادان و كاولكردن و ئاوارەكردن

ئەوەی مەغول‌و جنگیزخان‌و تەیمووری لەنگ لەسەدەی بیستەمدا لەو رەفتارەی باووباپیری خۆیان نەكەوتون‌و چۆن باووباپیریان سەدان ساڵ لەمەوبەر لەرۆژهەڵاتی ئاسیاوە رویانكردبووە رۆژهەڵاتی ناوەراست‌و رۆژئاوای ئاسیاو لەو هاتنەیانا هەرچیەكیان هاتبووە رێ هەموویان كاولكردبوو، لەسەدەی بیستەمیشدا نەیان ویستبوو لەپیشەی باووباپیری خۆیان لابدەن‌و لەباسی شۆرشەكانی بەرلەشۆرشی ئاگری باسی ئەو هەموو كوشتارو دڕندەیەتیەی ئەوانمانكردووەو لەمەی ئاگریداغ‌و لەدوایدا لە شۆرشی درسیمدا ئەوەی جاران پێیان تەواو نەكرابوو بڕیاریاندا تەواوی بكەن.

دەربارەی ئەو تاوانانەی لەكورد كراوە لەدوای شۆرشی ئاگریداغ شتێك نییە مرۆڤ بتوانێت خۆی بێدەنگ بكات لێیی‌و گەلێك نووسەری بێگانەی بەویژدان لەوانەی پێنوسەكانیان بۆ تۆماركردنی باسی كارەسات‌و تاوانەكانی تورك تەرخان كردووە، هەریەكەیان بەشێوەیەك باسی

درندەیـەتی تـورك‌و تاوانـەکانیانکردووە کـە هەوڵئـەدەین کورتەیـەکی ئـەو سەرچاوانە بخەینە پێشی چاو:

پروفیسۆر حسرتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٩) ئاماژەی بۆ ڕۆژنامـەی (فجر الشـرق) کـردووە کـە ژمـارەی ڕۆژی (١٩٣١/٣/٢٠)دا وتوویـەتی هێزی تـورك (٢٠٠) گونـدی کـوردی وێرانکـردوو پێـنج هـەزاری بـێ تـاوانی لـەو گوندانـە بـەناڕەوا کوشـت, بـەلاّم لـەو زانیاریانـەی بەخۆیبوون گەیشـتبوو ژمارەی گوندە کاولکراوەکانی کورد لەئەنجامی شۆڕشی ئاگریدا گەیشتبووە (٦٠٠)گوند.

حسرتیان ئەڵێ: تاوانی سوپای تورك بەرامبەر بەکورد لەسنووری هەموو ڕەوشـتێکی خـراپ تێپـەڕی کردبـوو, کـار گەیشـتبووە ئـەوەی هـەتا لـەناو ئەنجومـەنی میللـی گـەورەدا نـائیبێکی خـەڵکی (قونیـە) خـۆی پـێ نـەگیراو لەکۆبونەوەیـەکی ئـەو ئەنجومەنـەدا هەسـتابووە سـەرپێ‌و ڕوپکردبـووە نورالـدین پاشـاو پێـی وتبـوو:(تـۆ تاوانباریـت بەرامبـەر بەوانـەی ڕویانداوەو پێویستە لەسەر ئەمە محاسەبە بکرێیت کەوا بوویتە هۆی ئەم هەموو خوێن ڕشتنە).

حسـن عرفـە لەلاپـەڕە (٥٩)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە (٥٢) ئامـاژەی بـۆ ڕۆژنامەیەکی تورکی کردووە لەوەرگێڕی کتێبەکەی حسن عرفە لەوەرگێڕانی نـاوی ڕۆژنامەکە بەڕۆژنامـەی بەرەبەیانی ڕونـاکیی ڕۆژهـەلاّت نـاوی بـردووە کـەلام وایـە بریتـی بێـت لەهـەمان ئـەو ڕۆژنامەیـەی لـەوەرگێڕانی کتێبەکـەی پروفیسـۆر حسـرتیان بـۆ عـەرەبی بـە –فجـر الشـرق) نـاوی بـردووە, لـەو ڕۆژنامەیەدا وتراوە:

((ئەرتەشی تورك پتر لە(٢٠٠) گوندی کوردی وێرانکردووەو دە پازدە هەزار ژن و منداڵی بێ تاوانی کوشتووە, بەڵام حزبی خۆیبون ڕایگەیاندووە کە ئەرتەشی تورك (٦٦)گوندو (١٥٢٠٦) خانووی ماڵە کوردی کاولکردووەو ئەوانەی لەکوشتن ڕزگاریان بوبوو بەناچاری پەنایان بردبووە ناو ئەشکەوت و شوێنە پەناکان.

صادق شرف کندی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٧١) ئاماژەی بۆ وتارێکی (ئەدموندن) کردووە کە وتوویەتی بەچاوی خۆی هەندێ لەو شوێنانەی دیوە کە شۆڕشی ئاراراتی تیاکرابوو, لەشوێنێکی وەکو (بدلیس)دا کە ژمارەی دانیشتووەکانی لەپێش شەڕدا (٤٠)هەزار کەس بووە لەدوای شۆڕش تەنها (٣)هەزار کەسی تیامابووەوە.

صادق شرفکندی ئاماژەی بۆ باسێکی (ل.رامبۆ) کردووە کەچۆن تورکەکان ژمارەیەك لەڕۆشنبیرانی کوردیان بەزیندوویی فڕاندبووە ناو گۆلی (وان)ەوەو هەموویان خنکاندبوون.

کریس کوچرا لەلاپەڕە (١٧٦)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٦), ئەمیش ئاماژەی بۆ کتێبەکەی (رامبۆ) کردووە بەناوی (پدر جنگل کورد) دەربارەی ئاوارەکردنی (جەلالی)یەکان کەچۆن لەو عەشیرەتە نزیکی دوو هەزاریان بەخۆیان و (٤٠)هەزار سەر مەڕو ماڵاتەوە ئاوارەکرابوون لەلایەن حکومەتی تورکەوەو بەزۆرەملی و بەپەرەوازەیی لەناوچە تورك نشینەکانا نیشتەجێ کرابون و ئەوانەشیان لەناو خاکی کوردستاندا مابونەوە باری ژیان و گوزەرانیان زۆر خراپتر بووە لەهی ئاوارەکان.. لەگۆڤاری (the kurds– نوسینی dived mcdowall) لەلاپەڕە (١٢)یدا باسی یاسای ژمارە (١٨٥٠)ی

کردووه کە دەقی ئەو یاسایە لەلاپەڕە (٦٥)ی کتێبی: challand opcit کە لەلایەن(kendal)ەوە نوسراوە لەم کتێبەدا وتراوە:

یاساکەی حکومەت بەم جۆرە بووە:

(هەر کۆششێك یا هەرکارو ڕەفتارێك لەلایەن کاربەدەستێکی تورکەوە کرابێت, ئەو کارە بەتاکە کەسێك کرابێت یابەچەند کاربەدەستی دەزگایەکی حکومەتیەوە لەناوچەیەکدا, ئەوەی ئەو کارەی کردبێت, چ سوپایی بووبێت یا (civil مدنی) لەنێوان ماوەی (١٩٣٠/٦/٢٠ هەتا دیسەمبری/١٩٣٠) کە بۆ مەبەستی دامرکانەوەی بزوتنەوەی یاخیبووەکان کرابێت یا بۆ دابینکردنی ئاسایش بووبێت لەناوچەکانی :(,zelm,ercisئاگریداغ agridag, ئورفە arva, لەگەڵ دەوروبەری pulumur لەئیقلیمی ئەرزنجان) یا لەهەرشوێنێکی ئەنادولیا, ئەو ڕوداوو کوشتن و کردارانەی بۆ سوودی وڵات کراون هیچیان بەتاوان ناژمێررێن و ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە بەرپرسیار نابن).

لەهەمان گۆڤاری (the kurds دا سەرچاوە (١) لەلاپەڕە (٦٥)یدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی (میللیەت)ی تورکی ژمارە (١٦٥٥) ڕۆژی ١٩٣٠/٩/١٦ کردووە کە لەو ڕۆژنامەیەدا وتارێکی وەزیرێکی تورکی بڵاوکردۆتەوە کە وتبووی:

(تەنها هەر ئەوە مافی هەیە خۆی بەخاوەنی ئەم وڵاتە بزانێت کە بەڕەگەز تورك بێت و ئەبێ ئەوانی‌تر تەنها وەکو بەندەو نۆکەر حسابیان بۆ بکرێت!!).

***باسی یازدەهەم***

## هەڵوێستی دەوڵەتان بەرامبەر کورد لەشۆڕشی ئاراراتدا.

هەرچەند لەباسی قۆناغەکانی شۆڕشی ئاراراتداو لەکاتی ڕووبەڕوو بونەوەی هێزی شۆڕشگێڕان و سوپای حکومەتی تورکدا چەند جارێك باسی هەڵوێستی دەوڵەتان کراوە، هەندێ سەرچاوەی تریش باسی هەڵوێستی دەوڵەتانیان کردووە بەرامبەر کورد لەو شۆڕشەدا کە لەو باسەدا نەکراون و هێشتبومانەوە بۆ ئەم باسە، والێرەدا هەوڵ ئەدەین کورتە باسێکی هەڵوێستی ئەو دەوڵەتانە بخەینە پێش چاو بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەو باسە دواون کە بەتایبەتی ئاماژەیان بۆ هەڵوێستی سۆڤێت و حکومەتی ئێران کردووەو بەر لەمە چەند جارێك باسی هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیامانکردووە دەربارەی شۆڕشی ئارارات و پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

**أ) هەڵوێستی سۆڤێت**

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (٦٢)ی یاداشتەکانیا لەباسی پێوەندی کوردو ئەرمەنیدا باسی هەڵوێستێکی سۆڤێتی کردووە بەرامبەر (ئەردەشیر

مرادیان)ی نوێنەری تاشناقی ئەرمەنی کە لەشۆڕشی ئاگریدا تاشناقەکان بوبوون بەلایەنگری خۆیبون و شۆڕشی کورد وەکو لەباسی پێکهاتنی خۆیبوندا بەرلەوە لێی دواین، کە ئیحسان نوری وتوویەتی:

((لەساڵی ١٩٢٩دا کە لەزوزان بوین و (ئەردەشیر مرادیان) لایەنگری شۆڕشەکەمان بوو، لەو ڕۆژانەدا نامەیەك و دیارییەك هاتبوو بۆ (ئەردەشیر)و لەنامەکەدا نوسرابوو: ئامۆزاکەت لە تەفلیسەو هاتوتە (یریڤان)و دەیەوێ بچێتە (ئارالق) کە شوێنێکە لەژووروی روباری •ئاراس)دا لەبەشی روسیا.

ئەردەشیر زۆر بەپەرۆش بوو بۆ بینینی ئامۆزاکەی و هەرچەند من (ئیحسان نوری) نەسیحەتم کرد نەچێتە ئەوێ چونکە ترسی ئەوەم هەبوو ئەمە پیلانێك بێت بۆ گرتنی ئەو، بەڵام سوودی نەبوو)). ئیحسان نوری لەیاداشتەکەیدا بەدوورودرێژ باسی چونەکەی ئەردەشیری کردووە کەچۆن (١٥) چەکداری خۆی لەگەڵا ناردبوو بەسەرکردایەتی (عمر بسی) و کە دەگەنە قراغی روبارەکە عمر بسی بەئەردەشیر دەڵێت نابێ بچیتە ئەوبەر چونکە خاکی روسەو تووشی گێچەڵێکی گەورە دەبیت، بەڵام پاسدارەکانی روس دەیخەڵەتێنن و پێی دەڵێن ئامۆزاکەت لەوبەرە چاوەڕوانت ئەکات، ساتێك ئەردەشیر سووربوو لەسەر پەڕینەوە عمر بسی ناچاردەبێت چوار سواری لەگەڵدا دەنێرێت و کە دەگەنە ئەوێ چەك و ولآخەکانیان لێ دەسێنن و ئەردەشیرو هەر چوار سوارەکە دەنێرن بۆ (یریڤان)و لەوێوە بۆ زیندانی (تفلیس).

ئیحسان نوری ئەڵێ: نامەیەکم نارد بۆ روسەکان و داوام لێکردن ئەردەشیرو ئەو شوارانەی لەگەڵیا بوون بەربدرێن، پاش ماوەیەك سوارەکانیان بەرداو جارێکی تریش نامەیەکم بۆ ناردن بە (سید رسول)دا

بەڵام کە گەیشتنە قەراغی ڕووبارەکە ڕوسەکان تەقەیان لە سید ڕسول‌و سوارەکانی کردو سید ڕسول بریندار کراو نەیتوانی نامەکەم بگەیەنێتە ڕوسەکان‌و ئەردەشێر مرادیانیش ئاوارە کرا بۆ (سبریا)و بەمە ئەردەشێر مرادیات دوورخرایەوە لەهاوکاریکردن لەگەڵمانا.

ئیحسان نوری لەلاپەڕە (١٠٣)ی یاداشتەکانیا باسی هەڵویستێکی تری سۆڤیێتەکانی کردووەو ئەڵێت:

((ساتێك هێزێکی تورك لەناو خاکی ئێرانا لەڕۆژهەلآتی چیای ئاگریدا پەلاماریان داین, لەو کاتەدا حاڵمان زۆر شڕو پەرێشان بوو, ژمارەی چەکدارەکانمان زۆر کەم بوبووەوەو بەرگەی هێرشی لێشاوی سوپای تورکی نەدەگرت, نوێنەری ئەرمەنی لەگەڵمانا بوو پێی وتین: ئەگەر لەماوەی بیست‌و چوار سەعاتدا خۆمان دەرباز نەکەین تورکەکان هەموومان دەگرن, بۆیە داوای لێکردین بەو شەوە چیای ئاگری بەجێ بهێڵین, بەڵام پێشمەرگە شۆڕشگێڕەکان کە ماوەی پێنج ساڵ بوو تامی ئازادی‌و سەربەستیان چێشتبوو ئەو پێشنیارەیان پەسەند نەکردو منیش لەنوێنەری ئەرمەنیەکانم گەیان هەرچیەکمان بەسەردا بێت هێشتا بیر لەوە ناکەینەوە ئاگری بەجێ بهێڵین.

بەرامبەر بەمە, نوێنەری ئەرمەنیەکان پێی ووتم: تۆ وەکو سەرکردەی ئەم شۆڕشە واباش‌و پێویستە هیچ نەبێ تۆ خۆت نەدەیت بەدەستەوەو خۆت دەرباز بکەیت‌و منیش لەوەرامدا پێم ڕاگەیاند مردنم لاباشترە وەك لەوەی ئەم شۆڕشگێڕانە بەجێ بهێڵم (لەڕاستیدا وەکو لەشوێنی خۆیدا باسمانکردووە ئیحسان نوری شۆڕشەکەی بەجێ هێشت‌و بوو بەپەنابەر لەئێران‌و ڕەخنەیەکی زۆری لێگیرا بەرامبەر بەمە).

ئیحسـان نـوری لەیاداشـتەکانیا لەسـەری دەڕوات و دەڵێـت: نوێنـەری ئەرمەنیـەکان کـە پێـنج کەسـی لەگەڵدا بـوو, بەرلـەوەی ئێمـە بـەجێ بهێڵێـت وتـی: بـا هـیچ نـەبێ خێزانەکـەت (مەبەسـتی یەشـار خـانمی ژنـی ئیحسـان نـوری بـوە) خـۆی دەربـاز بکـات, بـەڵام خێزانەکەشـم هـەروەکو مـن وەرامـی نوێنەکەی دایەوەو پێی ووت: ئێوە بڕۆن خواتـان لەگـەڵ بـێ و چـۆنی بـەباش دەزانن بەو شێوەیە خۆتان دەرباز بکەن.

بۆ ڕۆژی دوایی هێزێکـی سوپای سۆڤێت بۆ یارمەتیدان و هاوکاریکردن لەگـەڵ تورکـەکانا لـەناوی (ئـاراس) پەڕییـەوەو بەشـی بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی ناوچەکەی داگیرکرد.

پێشـمەرگەکان هەرچـەند دەیـانزانی هـیچ ئومێـدێکی سـەرکەوتن بـەدی نەدەکرا بەڵام ئەوەیان لاباشتر بوو شـەهید بکرێن و لەڕاستیشدا ئـەنجام هـەر بەوە گەیشت و تورکەکان بەوپـەڕی دڕندەیەتیـەوە ڕەفتاریـان لەگـەڵ خۆیـان و خاووخێزانیان کرد بۆ لەناوبردنیان.

ئیحسـان نـوری لەیاداشـتەکەیدا ئـەم چـوار دێـڕ شـیعرەی بـەو بۆنەیـەوە تۆمارکردووە کە وتوویەتی:

شێرو سونگیی تورکەکان ورگ ئەدڕن
دۆڵەکان بەڕەنگی سووری خوێنی کورد ڕەنگین بوون
چیاکان بەقرچەی گوللەی تۆپ و تفەنگەکان دەلەرێنەوە
ئەی ئازاو دلێرەکانی وڵات.... فریاکەون.

دەربارەی هەڵوێستێکی تری سۆڤێت بەرامبەر بە کورد گۆڤـاری (گـزینگ) کـە لەسـوید دەردەچـێت لـەژمارەی (١١)ی بـەهاری (١٩٩٦)دا باسـی دوکیـومێنتێکی سـۆڤێتی کـردووە لەلایـەن (ئەفراسـیاب حلمـی)یـەوە کـراوە

بەکوردی کە ڕاپۆرتی جێگری سەرۆکی بەشی ڕۆژهەلات- وەزارەتی دەرەوە (ح.ك.ش/٣٠٠٨ ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٣) کەتیایدا وتراوە:

((ئێمە (مەبەست سۆڤیێت) نەك تەنها پشتیوانیمان لەخەباتی کورد نەکردوە بەڵکو چاپەمەنیەکانیشمان بەلای باسی خەباتی ئەو میللەتەدا نەچوون و نمونەی ئەمە: لەساڵی ١٩٢٦دا کوردە ڕاپەڕیوەکان زۆرجار هەوڵیانداوە بەنامەو بەناردنی نوێنەری خۆیان بۆ (تەورێز)و (ماکو) پێوەندیمان پێوە بکەن کە ناوەڕۆکی ئەو نامەیە بەم شێوەیە بوە:

((لەلایەن دەوڵەتی ئاراراتەوە(مەبەست سەرکردایەتی شۆڕشی ئاگریداغە) نامەی ژمارە (٢٤) نێررا بەلام وەرامی ئەو نامەیە نەدرایەوە، بێجگە لەمە ئەو تەترە (مەبەست پەیام نێرە)ی ئێمە کە نامەکەمان پێداناردبوو گیراو زیندان کراو هەتا ئیستاش لەماکودا گیراوە)).. دوکیومێنتەکە لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

ئەگەر بەوردی لەبارودۆخ بکۆڵرێتەوە بەڕاستی ئەوا دەردەکەوێت کورد بەبێ یارمەتی ڕوسیای شورەوی ناتوانێت ڕزگاری ببێت، لەبەرئەوەی هەوڵدانی کوردەکان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئێمەدا (مەبەست سۆڤیێت)ە بەهیچ ئەنجامێك نەگەیشت بۆیە کوردەکان لەدواییدا بەنهێنی خۆیان گەیاندە ناو خاکی شورەوی بۆئەوەی ئێمە لێرە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین. (مەبەست ئەو کاتەی پاش ڕوخاندنی شۆڕشی ئاراراتە کە پاش چەند ساڵێك دوای شەڕی دووهەمی جیهانی کە سۆڤیێت چوونە ناو خاکی ئێرانەوەو لەئەنجامیا کۆماری کوردستان پێکهات لەمهاباد، بەلام بەداخەوە زۆری پێ نەچوو سۆڤیێت دەسبەرداری بوو، ئێران ئەو کۆمارەی بەجوانەمەرگی لەناوبرد).

دەربارەی هەڵویستی سۆڤێت بەرامبەر شۆڕشی ئاگریداغ, کریس کوچرا لەلاپەڕە (١٦٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١)دا وتوویەتی:

((لەکاتی شۆڕشی ئاگریدا ئاکارو کردەوەی شورەوی لەگەڵ حکومەتی تورکدا لەنەهێنیدا بوو, هەرچەند شەڕ نزیکی سنووری ئەوان بوبوەوە بەلام هەڵویستی خۆیان ڕوون نەکردەوە بەر لەشۆڕشی ئاگریداغ سۆڤێت لەساڵی (١٩٢١)دا پەیمانی دۆستانەی لەگەڵ تورك و ئێرانا بەستبوو, بەپێی ئەو پەیمانە بەهیچ جۆرێك ڕێگە بەوە نەدەدرا کە سۆڤێت خۆی لەکێشەی کورد تێوەردا)).

کوچرا لەهەمان لاپەڕەی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ڕاپۆرتێك کردووە ژمارە (ئای ئای -٣١١-٣١٣-١٩٢ ساڵی ١٩٤٧دا لەو ڕاپۆرتەدا وتراوە:

((دەوڵەتی سۆڤێت لەمانگی حوزەیرانی (١٩٢٧)دا لەموسکو دەستووری‌دا بە(کاراخان)ی کومیسیری کاروباری دەرەوەی سۆڤێت لەگەڵ (ئارالوڤ)ی بالوێزی پێشووی شوورەوی لەتورکیا هەردوکیان لەگەڵ زەکی بەگی تورك پەیمانێك مۆربکەن دژی کوردەکان و لەئەنجامی مۆرکردنی ئەو پەیمانەدا سۆڤێت سنوورەکانی خۆی داخست بۆ نیشانەی دۆستایەتی و هاریکاریکردن لەگەڵ تورکیاداو لەکۆتایی مانگی حوزەیراندا بەرلەوەی هێرش ببرێتە سەر ئارارات سۆڤێتەکان (٥٠٠)سواری خۆیان نارده گوندی (دەوەلوو) کەنزیك بە(ئاراکس) بوو, خەڵکی ئەو گوندە بۆیان دەرکەوتبوو ئەو سوارانەی سۆڤێت بەشەو بۆ یارمەتیدانی تورکەکان هاتبوون.

کوچـرا دەڵـێ: ئەمـە ڕونـی دەکاتـەوە, ئەگـەر سـۆڤێت لەشەڕیشـدا شانبەشـانی تورکـەکان هاوکـاری نـەکردبێت دژی کـورد بـەڵام تـەنها بەداخستنی سنوور خزمەتێکی گەورەی بەتورکەکان گەیاندبوو)).

لەپەراوێزی ژمارە (١٠)ی لاپەڕە (٥٥١), کریس کوچرا وتوویەتی:

(ڕوزیتا فوربو) توانیبووی تاقمێکی ئەرمەنی ببینێت کە (١٢)کەس بوون کەلـەژێر تـۆپ بـارانی سـۆڤێتەکانا کوژرابـوون هـەروەکو (وی.هوویـل) لەڕۆژنامـەی (بين المللـی) ڕۆژی (١٩٣٠/٨/٢٨)دا باسـیکردووە سـۆڤێتەکان دیوارێکی قایمیان دروستکردبوو بۆ ڕێگرتن لەکوردەکان.

ب) هەڵوێستی ئێران:

لەڕاستیدا هەڵوێسـتی حکومـەتی ئێـران دژی کـورد لـەهی دەوڵـەتانی‌تر کاریگەرتربوەو احسـان نـوری سەرکردەی شۆڕشـی ئاrارات لەیاداستـەکانیا بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە باسـی هەڵوێسـتی ئێرانـی کـردووەو وتوویـەتی مـن ئێرانم بەدوژمنی خۆمان نەدەزانی لەو کاتە ناسکەدا بـەو جۆرە زیانمـان پـێ دەگەیـەنێت. دەربـارەی ئـەو هەڵوێسـتەی ئێـران أحسـان نـوری لەڕۆژنامـەی ئاگریـدا کـە ئۆرگـانی شۆڕشـکەی ئـارارات بـوە ئـەو گلەییـەی خـۆی لـەئێران کردووە.

کـریس کوچـرا لەلاپـەڕە (٧٢)ی کتێبەکەیـدا ئامـاژەی بـۆ ڕاپـۆرتێکی باڵیوزخانــەی بریتانیــا کــردووە لــەتاران کــە لــەڕۆژی (١٩٣١/٤/١٧)دا ئامادەکراوە ژمارەی دوکیومێنتەکە (FO.371-153,9) لەو ڕاپۆرتەدا وتراوە:

((لەساڵی ١٩٣١دا حکومەتی ئێران هاوکارییەکی تـەواوی کـردووە لەگـەڵ حکومـەتی تورکیـاداو ئـەو (جـلالی)یانــەی چـوبونە ناوچـەی ئـاراراتو

هەندێکیشیان چوبونە ناو خاکی سۆڤێتەوە بەدرێژایی (١٠)کیلۆمەتر، ئەوانەی لەشۆڕشەکەدا چوبونە ناو خاکی ئێرانەوە بەشێوەیەکی پەرەوازەیی بەژن و منالەوەو بەخۆیان و مەڕومالآتیانەوە هەموویان پێش خۆدران و خالد ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی جەلالی چاری نەما لەگەڵ پیاوەکانیا بنەو بارەگایان کۆکردەوەو ڕویانکردەوە ناو خاکی تورکیا (بەر لەمە لەباسی هەشتەمدا وەکو باسمانکردووە احسان نوری باسیکردووە کەچۆن (فتح الله خان)ی ئەفسەری ئێران لەمەدا محمد ئەمین ئاغای برای خالد ئاغای کوشتبوو).

دوکتۆر عزیز شمزینی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٢) دەربارەی هەڵوێستی ئێران بەرامبەر بەکورد باسی ئەوەی کردووە کە لەنیوەی دووهەمی ساڵی ١٩٣٠دا لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕشگێڕانی کوردخەباتێکی سەختی بێ وچانیان دژی هێزەکانی تورك کردبوو، بەلآم هەڵوێستی ڕەزا شای ئێران بوو بەهۆی ئەوەی فشارێکی زۆر بخرێتە سەر شۆڕش و شۆڕشگێڕەکان کە ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شۆڕشەکە بشکێت و بەرگەی ئەو سوپا زۆرە مەشقپێکراوەی تورك نەگرێت کە لەهەموو لایەکەوە پەلاماری کوردیان دابوو.

دوکتۆر شمزینی لەشوێنێکی تری کتێبەکەیدا. لاپەڕە(٩٣) دوبارە چۆتە سەر باسی هەڵوێستی ڕەزا شای پەهلەوی کە لەناسکترین کاتی شۆڕشی کوردا فریای مستەفا کمال ئەکەوێت و هێزەکانی حکومەتی ئێران لەپشتەوە لەپێشمەرگەی کوردیداو لەئەنجامی ئەمەدا کورد کەوتە نێوان دوو هێزی دوژمنەوەو ژمارەیەکی زۆر لەشۆڕشگێڕانی کورد بەدیل گیران و ڕاپێچ کران بۆ زیندانی (قەسری قاجار) کە لەوێ زۆریان دەرمانخوارد کران و شەهید بوون.

دەربارەی ئەو هەڵوێستەی ئێران، صادق شرفکندی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٧٠) باسی ئەوەی کردووە چۆن ئێرانیەکان بەبیانوی سەرکوتکردنی جەلالیەکان هێزەکانی خۆی بۆ سوودی تورك بەکارهێنا دژی شۆڕشەکەی کورد.

حسن عرفە لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٢) باسی ئەو هێزەی ئێرانی کردووە کە حکومەت بەسەرکردایەتی (کولونیل علی خانی نەخچەوانی) ناردبوو بەناو بۆلێدانی چەکدارەکانی جەلالی‌و لەئاراراتی بچوکدا پەلاماری کوردیانداو بوون بەهاوکاری تورك کە بەرامبەر بەمە حکومەتی تورکیا وازی لەهەندێ ناوچەی (پاچیوك)دا کە لەڕۆژئاوای گۆلی وورمیەدابوو.

## باسی دوازدەهەم

# هەڵسەنگاندنی شۆڕش و کەم و کوورییەکانی و ئەو ڕەخنانەی لێی گیراوە

هەرچەند لەکۆتایی ئەم بەرگەدا باسێکی تایبەتی تەرخانکراوە بۆ هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکانی کورد بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان هەردوو شەڕی جیهانیدا لەباکوری کوردستان لەگەڵ باسی ئەو ڕەخنانەی لەو شوێنانە گیراوە, بەلاّم بەپێویستم زانی کورتە باسێکی هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئارارات و باسی کەمو کورییەکانیو ئەو ڕەخنانەی لێی گیراوە باس بکەین بەپێی ڕووداو بەسەرهاتەکان و لەژێر تیشکی ئەو بۆچوونانەی نووسەران لەباسەکانیانا دەربارەی ئەوە دواون.

شۆڕشی ئاگریداغ لەدوای شۆڕشی پیران یەکێك بووە لەو شۆڕشانەی کورد کەهەر لەسەرەتاوە ڕێکخراوێکی سیاسی ڕێبەری بووەو سەرپەرشتی دەزگاکانی شۆڕشی کردووە کە بریتی بووە لەخۆیبوونو لەسەرەتای شۆڕشەکەوە هەتا دوای شکاندنی شۆڕشەکەش خۆیبوون هەر لەچالاکی خۆی نەکەوتووە هەروەکو لەدواباسی شۆڕشی ئاراراتدا کە بریتییە لەباسی

بارودۆخی باکوری کوردستان ڕوون دەبێتەوە جیاوازیی خۆیبونی ڕێبەری شۆڕشی ئاگریداغو ئازادیی شۆڕشی پیران ئەوە بووە ئازادی هەر لەسەرەتاوە هێشتا کە بەتەواوەتی دەستی پێ نەرکردبوو تورکەکان بەنهێنیو چالاکییەکانی ئازادیو ئەندامەکانی زانیبوو, بەڕووداتی ڕووداوەکەی (بیت الشباب) تورك توانی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئازادی کە بریتی بوو خالد بگ جبرانو یوسف ضیاء بەگ بگرێتو ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی ئازادی کەشۆڕش دەستی پێکرد یا گیرابوون یاخۆیان دوورخستبووەوە لەشۆڕش لەبەر ئەوە تورکەکان توانیبویان لەماوەیەکی کەمدا شۆڕشی پیران دامرکێننەوەو ئەو سەرکردایەتیە تازەیەی لە شێخ سعید پیرانو ئەوانەی کردبوونی بەسەرکردایەتی جەبهەکان کە زوبەیان هەرچەند بەوپەڕی قارەمانێتیو ئازایەتیەوە خەباتیانکردبوو بەلام هیچ شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبووە لەکاروباری لەشکرکێشیدا بۆیە شۆڕشەکەیان لەماوەی نزیکی ساڵێك کەمتر بەولاوە نەیتوانی خۆی ڕابگرێتو سەرکردەکانی گیرانو لەسێدارەدران, بەلام شۆڕشی ئاگریداغ نزیکی (٣ –٤)ساڵە خۆی ڕاگرتو توانی لەو ماوەیەدا ڕووبەڕووی دوژمن ببێتەوە, هەرچەند بەداخەوە لەمەشدا هەندێ کاروباری پێویست بەشۆڕش نەخرابووە پێش چاو کەدەتوانین کورتەیەکی ئەوانە وەکو خوارەوە دەستنیشان بکەین:

١– ئایا بەرپابوونی شۆڕشی ئارارات بەڕێبەرایەتی خۆیبوون دوانەکەوتبوو لەچاو ئەو کاتەی کە دەبوایە بەرلەوە دەستی پێ بکردایە؟!

بەداخەوە ئەوانەی نەخشەی شۆڕشی ئاراراتیان کێشاو ئەو شۆڕشە گەورەیەیان دەستپێکرد زۆربەیان بەلای شۆڕششی پیراندا نەچوونو بیریان

لــەوە نــەکردەوە هاوکــاریو بەشــداری بکەنلــەو شۆڕشــەدا کــە لــەدوای زینـدانیکردنی چـەند سـەرکردەیەکی لێهـاتووی کەسـێکی سـوپایی شـارەزا بەشۆڕش و لەشکرکێشی جێگەی ئەو گیراوانـەیان نەگرتـەوەو بەمە شۆڕشـی پیران پشتگوێ خراو لەبـەر نەشارەزایی سـەرکردە تازەکانی ئەو شۆڕشـەی بەهــەزاران کــوردی خۆبەختکــەری لــەخۆبوردو گیــانی خۆیــان لــەپێناوی سەرکەوتنی ئەو شۆڕشەدا بەختکردبوو لەماوەیەکی کەمدا لەلایەن سوپای تورکـەوە لـەناوبراو ئەگـەر ئەوانـەی لـەدرەنگ وەختـدا بیریـان لـەپێکهێنانی (خۆیبـون)و دەسـتپێکردنی شۆڕشـی ئاگریـدا کـردەوە لـەکاتی شۆڕشـەکەی پیرانا بکەوتنایە خۆیان و لەجیاتی دوو شۆڕش لەدوو ناوچەدا شۆڕشێکی یـەکگرتووی فراوانیـان دەسـت پـێ بکردایـە ئایاحکومـەتی تـورك هـەروا بەئاسانی دەیتـوانی ئـەو شۆڕشـەی کـورد دامرکێنێتـەوە بەبێ ئـەوەی دان بەتاقە مافێکی نەتەوەی کوردا بنێت؟

بێجگـە لـەو کەمتەرخەمییـەی بەرامبـەر شۆڕشـی پـیران کرابـوو، سـاتێك خۆیبـوون پێکهـاتوو نەخشـەی بـەرپاکردنی شۆڕشـی ئاگریـداغ بڕیـاری لەسـەردراو سـەرکردەی شـۆڕش لەناوچـەی ئاراراتـدا دانـرا ئایـا بیر لـەوە کرایـــەوە پەیوەنـــدی بەســـەرکردەو ســـەرۆك عەشـــیرەتە بـــەتواناو دەسـەلاتدارەکانی ناوچـەی دەرسیم بکرێـت وەکـو (سـەید ڕەزا) کـە ئەمـەش لـەدوای لـەناوبردنی ئـارارات ئەوسـا بـۆی دەرکـەوت کـەوا نـۆرەش هاتۆتـە سـەرخۆی پـاش ئـەوەی بـۆی دەرکـەوت لەنەخشـەیانا حسـابی لـەناوبردنی خۆشـیان کردبـوو بـۆ ئـەوەی هـیچ کـوردێکی دەسـەلاتدار لـەهیچ ناوچـەو پارچـەیەکی بـاکوری کوردسـتانا نـەمێنێت و سـاتێك سـەید ڕەزاش دەسـتی دایـە چـەك و شۆڕشـێکی بـەرپاکرد وەکـو لـەدوای شۆڕشـی ئاگریـداغ باسـی

دەکەین تورکەکان لەماوەیەکی کەمدا توانیان شۆڕشەکەی ئەویش خامۆش بکەن‌و سەرکردەکانی لەناوببەن‌و ناوچەی درسیم وەکو ناوچەکانی شۆڕشی پیران‌و ئاگریداغ ئەویش کاول بکەن‌و دانیشتوەکانی پەرەوازەو ئاوارە بکەن.

بەداخەوە, ئەو سەرچاوانەی باسی شۆڕشی ئاگریداغیان کردووە, لەهیچیانا شتێکی ئەوتۆ نایەتە بەرچاو کە نەدانیشتوانی درسیم بەتەنگ شۆڕشی ئاگریداغەوە هاتبون‌و نەشۆڕشگێڕانی ئاگریداغیش تەقەلایەکی ئەوتۆیان دابوو سوود لەناوچەی درسیم وەربگرن هیچ نەبێت بۆ حەوانەوەی خێزانەکانی شۆڕشگێڕان بۆ بارسووکیی شۆڕشەکەیان!!

٢- پەیوەندی کۆمەڵی خۆیبوون بەدەوڵەتان‌و میللەتانەوە لەسنووری ئەو تەقەلا سنوردارەی سریابدرخان‌و چەند کەسێکی کەم بەولاوە تێپەڕی نەکردبوو کە هەندێ چالاکی‌یان لەئەمریکاو ئەورووپادا کردبوو کە هەموو بەرهەمەکەی ئەو چالاکی‌و پێوەندی کردنە لەکۆکردنەوەی پارەیەکی کەم لەئەمریکاو پەیوەندیەکی سەرەتایی لەگەڵ ئەرمەنیەکانا, ئەوانەی گەرچی بەهۆی ئەو کوشتارانەی تورك لێی کردبون توانایەکی ئەوتۆی شۆڕشگێڕییان لەناو خاکی تورکیادا نەمابوو, بەڵام ئەوەی چاوەڕوان دەکرا لێیانەوە دەسگیربێت هەمووی بریتی بوو لەبوونی نوێنەرێکیان کە ئەردەشیری مرادیان بوو لەناو شۆڕشدا کە ئەویش بەپیلانێکی بچووکی سۆڤیێتی دۆستی تورك خەڵەتێنراو شۆڕشی بەجێ هێشت.

احسان نوری سەرکردەی شۆڕشەکە لەیاداشتەکانیا باسی ئەوەی کردووە ئەو چەکەی کە بەدەست شۆڕشگێڕانی کوردەوە بووە بریتی بوو

تەنها لەتفەنگ کە شۆڕشگێڕان بەو جۆرە چەکە نەیانتوانیبوو بەئاسانی بەرگەی چەکە قورسەکانو فڕۆکەکانی دوژمن بگرنو نەتوانرابوو لەڕێگەی ئەو ئەرمەنیانەوە کە کاتی خۆی هەندێ لەولآتانی ڕۆژئاوا ئەوانیشی بەگورگان خواردوو دابوو هیچ نەبوایە بۆ ناویش بوایە دەبوو هەندێ چەکی کاریگەر بۆ شۆڕش پەیدابکەنو کاربەوەشەوە نەوەستابوو, جاروبار کەشۆڕشگێڕانی تفەنگ بەدەستی ئازاو نەبەردی کورد بەو چەکە سووکە توانیبویان چەند تۆپێك لەسوپای تورك بگرن. لەبەر نەبوونی شارەزاییەك لەناویانا نەتوانرابوو سوود لەو تۆپە داگیرکراوانە وەربگیرێتو لەجیاتی بەکارهێنانیان هەر ئەوەندە لەدەست هاتووە ئەو تۆپانەیان تێکداوە بۆ ئەوەی دوژمن جارێکیتر بەکاری نەهێنێتەوە کەبەمەش سوپای پڕچەکی تورك هیچ لاوازییەکی پێ نەگەیشتبوو.

سەیر ئەوەیە احسان نوری لەیاداشتەکانیا ڕەخنەی لەکاربەدەستانی ئێران گرتووە کەیارمەتی کوردیان نەدابوو بۆ فێربوونی چۆنێتی بەکارهێنانیو ڕەخنەی ئەوەشی لەئێرانیەکان, بەتایبەتی لەڕەزا شا گرتووە کەبوبوو بەلایەنگری تورکەکانو ڕێگەی دابوو بەهێزی تورك بچێتە ناو خاکی ئێرانەوەو لەپشتەوە لەهێزی شۆڕشگێڕان بداو بەمە خەباتکەرانی خستە نێوان ئاگری دوولاوە, تۆ بڵێی احسان نوری لەیاداشتەکەیدا ئەمەی باسکردووە ئاگاداری ئەوە نەبووبێت تورکیاو ئێران ماوەیەك بوو خەریکی ئەوە بوون پەیمانێکی دوو قۆڵی دۆستانە لەگەڵ یەکتردا ببەستن کە ناوەڕۆکی ئەو پەیمانە بەئاشکرا خەنجەرێکی دووەمی دەبوو ئاراستەی سنگی کورد بکرێت بۆ لەناوبردنی!!

یا تۆ بڵێی احسان نوری ئاگای لەوە نەبوبێتکە ساڵەها بوو ڕەزا شا مۆخ و ئێسقانی کوردی دەشکان و لەهەمان ئەو ساڵەدا کە هێزەکانی لەپشتەوە لەشۆڕشگێڕانی ئاراراتی ئەدا, لەناو خاکی کوردستانی ئێرانیشدا شۆڕشەکەی سمکۆی شکاکی بەو دەردە بردبوو کەبردی و لەڕێگەی پیلانێکەوە سمکۆی لەناوبردو بەمە شۆڕشێکی تری لەبەشێکی کوردستانا لەناو برد ئیتر چۆن ڕەزاشا بیری لەلەناوچونی شۆڕشی ئاگریداغیش نەدەکردەوە؟!

٣- هەر شۆڕشێك کە دەست پێ دەکات, بەتایبەتی شۆڕشێکی جەماوەری وەکو ئەوەی ئارارات بڕواناکەم سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە حسابێکی بۆ باری ئابووری خۆی و بۆ چۆنێتی دابینکردنی دەرامەت و پێویستیەکانی ئەو شۆڕشە نەکردبێت.. ئایا لەشۆڕشی ئاراراتدا, چ خۆبەخشەبوون و چ سەرکردایەتی شۆڕش تۆ بڵێی سودیان لەو کەم و کوڕیە ئابوریانە وەرگرتبێت کە لەشۆڕشەکانی بەر لەشۆڕشی ئاراراتدا هەستی پێکرابوو؟؟

بێگومان بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشێکی جەبهەوی زۆر جیاوازە لەبەرپاکردنی شۆڕشێکی پارتی‌زانی کە تاڕادەیەك ئەرکەکانی ئەمەی دوایی کەمترە لەوەی یەکەمیان..

بڕیاری دەستپێکردنی شۆڕشێکی جەبهەویی فراوان پێویستی بەچەند مەرجێك و بەدابینکردنی چەند پێویستیەك هەیە کە یەکێك لەو پێویستیانە بریتی‌یە لە دابینکردنی دەرامەتێکی ئەوتۆ کە بەشی ماوەی ئەو شۆڕشە بکات کە سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە بەپێویستی دەزانێت و ئەگەر لەسەرەتاوە ئەو دەرامەتەی بۆ دابین نەکەیت لەبەرپاکردنی شۆڕشێکی

پـارتیزانی بـەولاوە مانـای خۆبەکوشـتدانێکی ئاشـکرایەو شۆڕشـگێڕانی میللەتان هەر بەو شێوەیە بۆی چوون.

احسـان نـوری نەخشەکێشـی شۆڕشـی ئاگریـداغ و دانـەری سـەرکردەی هێزەکـانی شـۆڕش لەجەبهـەکان لەیاداشـتەکانیا دانـی بـەوەدا نـاوە کـە سـەختترین بارگرانییـەك کـە دەهاتـە بـەردەمی شـۆڕش بریتی‌بـوە لـەوەی شۆڕش لەتوانایدا نەبووە لەناسکترین کاتی شۆڕشدا, بێجگە لـەدابینکردنی چـەکێکی تێروتەسـەل بـۆ شۆڕشـگێڕان, نەشـتوانرابوو خـۆراك بـۆ شۆڕشگێڕان و بۆ خێزانـەکانیان ئامـادە بکرێـت کـە زۆرجـار ئـەو خێزانانـە لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانا بەناوچەکانی کوری شۆڕشدا هاتوچۆیان پـێ دەکراو لەسـەرەتادا حسـاب بـۆ چارەنووسـی ئـەو خێزانانـە نـەکرابوو کـە زۆرجـار شانبەشانی چەکدارەکان خاووخێزانەکانیشیان ئەکەوتنـە ژێـر بۆردومـان و گوللـەبارانی دوژمـن کـە ئەمـە زیـانێکی زۆری گەیانـدبوو بەشـۆڕش و بەشۆڕشگێڕان وەکو لەباسی ڕوداوەکانا بەدوورودرێژ باسیانکراوە.

٤- شۆڕشـی ئـارارات ڕێبـازی شۆڕشـی جەبهـەوی و فراوانـی گرتبووەبـەر, وەکـو احسـان نـوری پاشـا لـەزۆر شـوێنی یاداشـتەکانیا باسـی کـردووە, سـاتێك شۆڕشـگێڕان لەشـەڕو ڕووبـەڕوو بوونەوەیەکـدا دیلیـان لەسـوپای تـورك دەگـرت, تـەنها چـەکەکانیان لێ دەسـەندن ئیتر بەریان ئەدان و ئەوانیش ئەچونەوە لای کاربەدەستانی خۆیـان و دووبارە پڕچـەك دەکرانـەوەو دوای پشـوویەك کـە دەهاتنـەوە سـەرخۆیان دووبـارە دەنێررانەوە بۆ ڕووبەڕو بوونەوەو لێدان و کوشـتاری کورد, چونکە کورد لەهیچ شۆڕشێکدا ڕەفتارو کرداری ئەوەندە لەپلەیـەکی نزمـدا نەبووە ئەو بەدیل گیراوانە بکوژێت و لەبەرئەوەی توانای ئەوەشـی نـەبووە زینـدانێکی

کاتی بۆ ئەو دیلانە دروست بکاتو خواردنیان بداتێ ئەو دیلانەی هەروا سوکو ئاسان دەنـاردەوە بۆلای دوژمنەکانی بەبێ ئەوەی هیچ نەخشەیەکی ئەوتۆی کێشابێت بۆ سوود وەرگرتنو دانانی مەرجێك بۆ دوژمن بۆ بەردانی ئەو دیلانە کە شۆڕشی زۆر لەمیللەتان هەندێ جار لەسەر کێشەو چارەنووسی چەند دیلێك کارێکی وادەکەن سودێکی باشیان دەستگیربێت کەچی نەلەم شۆڕشەداو نەلەشۆڕشەکانی تری کوردا هیچ جۆرە تەقەلایەکیوا نایەتە پێش چاو کەکورد دابێتی بۆ سودی خۆی.

لەکۆتایی هەڵسەنگاندنو ئەو ڕەخنانەی دێنە پێش چاو دەربارەی شۆڕشی ئاگریداغ هەوڵ ئەدەم ئاماژە بۆ هەندێ سەرچاوە بکەم کە ڕەخنەیان لەشۆڕشەکە گرتووەو باری شۆڕشەکەیان بەپێی بۆچونی خۆیان هەڵسەنگاندووە.

احسان نوری سەرکردەی هێزەکانی شۆڕش لەلاپەرە (٩٥)ی یاداشتەکەیدا ڕەخنەیەکی زۆری لەسەرکردەکانی شۆڕش گرتووەو وتوویەتی:

((هێزەکانی ئاگری ئاگاداری ئەوە نەبوون کە عەشیرەتی (حیدران) بەر لەکاتی دەستنیشانکراو دەستیانکردبوو بەهێرش بردنو ساتێك هەواڵی ئەو هێرش بردنەمان پێ گەیشت هێزەکانی حکومەت لەهەموو لایەکەوە پەلاماری ئەو عەشیرەتەیان دابوو کە بەمە زیانێکی زۆریان بەخۆیانو بەشۆڕش گەیاند)).

ئەو هەڵەیەی احسان نوری باسیکردووە یەکەم هەڵە نەبووە کەکورد لەشۆڕشەکانیا کردبێتی, لەشۆڕشی پیرانیشدا هەڵەیەکی وازل کرا کەبوو

بەهۆی ڕوداوەکەی (بیت الشباب) کە بەرگی پێشوودا باسی ئەو زیانە کراوە کە لەشۆڕشی پیران کەوتبو بەهۆی بەرپابوونی شۆڕش بەرلەو کاتەی بۆی دەستنیشانکرابوو کە بریتی بوو لە(٢١/مارت/١٩٢٥)و دەربارەی ئەمە زنارسلوپی (قدری جمیل بەگ) لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) کە خۆی یەکێك بووە لەئەندامی کۆمەڵی ئازادی وتوویەتی: ئێمە کە ئەندامی کۆمەڵە بووین هیچ زانیارییەك نەگەیشتبوو بەئێمە کەوا جموجوڵ دەستی پێکردووەو کە گیراین و خراینە زیندانەوە لەناو زیندانەکەدا ئەوسا دەنگی تەقەی گوللەی پێکاچوونەکەمان هاتە گوێ))

احسان نوری لەیاداشتەکەیدا تاوانی ئەو هەڵە زلەی کەڕوویدابوو خستوویەتیە ئەستۆی (ممد بەگ) و (سید رسول) کە هیچ ئاگادارییەکیان لەو ڕووەوە نەگەیاندبوو بەسەرکردایەتی شۆڕش بۆ ئەوەی چی پێویست بوو لەو ڕووەوە بکرایە.

احسان نوری لەلاپەڕە (٩٦)دا ئاماژەی بۆ ئەو هۆکارانە کردووە کەبوبونە هۆی شکاندنی ئەو شۆڕشەی لە(زیلاندا) کرابوو کە ئەو هۆیانەی بەم جۆرەی خوارەوە باسکردووە:

١- عقید ابراهیم ئاغاو حمید بەگ ئەو پێشنیازو ڕاپرسیانەی لەگەڵ نەخشەیەکدا بۆیان نێررابوو پێڕەوییان نەکردبوو بەجێیان نەهێنابوو.

٢- گۆترەکاری و هەڕەمەیی و بەرەڵایی و ناڕێکی و کەمتەرخەمی لەبەڕێوەبردنی کاروبارداو ئاگادارنەبوون لەبارودۆخ و هەڵوێست زیانێکی زۆری بەشۆڕش گەیاند.

٣- لەهەموو ناخۆشترو کوشندەتر ئەو ناکۆکیو نایەکیە بوو کە لەنێوانی (ممد ئاغا)و (سید رسول)ی جووتە سەرکردەی ناوچەکەدا ڕوویدابوو کەبوو بەهۆی ئاژاوەو ناڕێکی لەنێوان ڕیزەکانی شۆڕشدا.

٤- هەڵەیەکی کوشندەتر بریتی بوو لەوەی لەو شەڕەدا هیچ حسابێکی ڕێكوپێك نەخرابووە بەرچاوو کاتێك شەڕەکە پێش وەخت دەستی پێکرد بەرلەوەی خۆ ئامادەبکرێت بۆ ئەو شەڕە گەورەیەو ئەنجام بەوە گەیشت هیچ دەرفەتێك نەمابوو بتوانرێت یارمەتی بگەیەنرێتە شۆڕشگێڕانو خۆشیان نەیانتوانیبوو بەرگەی ئەو هێزە زۆرەی دوژمن بگرن.

٥- خیانەتی عەشیرەتی (کسکوی) کەبووبوون بەهاوکاری دوژمن کارێکی وای کرد تورکەکان بەئاسانی بتوانن خۆیان بگەیەننە دۆڵی (زیلان) کە ئەمە هۆی سەرەکی شکاندنی شۆڕشەکە بوو.

بەو جۆرە هۆی شکاندنی شۆڕش لە(زیلان) لەلایەکەوەو کەمتەرخەمی دانیشتوانو چەکدارانی ناوچەی زیلان لەلایەکی ترەوە, بەهۆی دەمەقاڵەی نێوان ممد بەگو سعید رسول لەبەر کەللە ڕەقیو دەمار ئەستوری هەردوولایان کە بەداخەوە ئەمە یەکێکە لەنەریتی عەشایری, ئەمانە هەموویان بوون بەهۆی پەرەوازە بوونی چەکدارەکان کە هەریەکەیان بۆخۆی هەوڵی دابوو بەپەلە پروسکێ خۆی بگەیەنێتە لایماڵو منداڵەکەی کە لەکوێستان بوون.

احسان نوری لەیاداشتەکەیدا لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

بەو جۆرە ئەو شەڕە ناکامو ناپوختەی لە(زیلان)دا ڕوویدا پشتی شۆڕشی شکانو زیانێکی زۆری بەکورد گەیاندو لەم شەڕەدا (عوسمان)و (ئەبوبەکر)ی جووتەکەی (ئەمین پاشا) لەبەر ناڕێکی سەرکردەکانی ئەو

شەڕە بەخۆڕایی کوژران و دوای ئەم شکاندنە تورکەکان دەستیان کرد بەکوشتار لەژن و مندالّ و پیری دانیشتوانی دۆڵی (زیلان) و بەکرێگیراوەکانی عەشیرەتی کسکوی هەرچی لەتوانادا بوو کردیان و دەستیانکرد بەکاولکردنی هەرشوێنێك دەستیان بیگەیشتایەتی و تالأنیەکی زۆریان لەدانیشتوانی ناوچەکە کرد.

دەربارەی کەم و کوڕیەکانی شۆڕشی ئاگریداغ، مامۆستا جەلال تالّەبانی لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٢٢) ڕەخنەی لەخۆیبوونی ڕابەری شۆڕشی ئاگریداغ گرتووە کە ئەمیش هەر لەسەر شێوەی کۆن پێکهاتبوو، هەموو کەم و کوڕیەکانی حزب و کۆمەلّ و ڕێکخراوەکانی بەرلەخۆی پێوەدیاربوو، نەیتوانی جەماوەری کورد بکات بەهێزی سەرەکی شۆڕشەکەو ڕێبازێکی ڕاستی دەستنیشان نەکردبوو بۆ چارەسەرکردنی باری کۆمەلأیەتی و ئابووری و شەقلی عەشایری و ئەرستوکراتی پێوە دیاربوو، دەتوانریّ بوترێت حزبی خۆیبون بریتی بوو لەحزبی خاوەن مولّك و بۆرجوازییەکانی کورد.

بەلأم سریا بدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٧٩) دەربارەی هەلّسەنگاندنی شۆڕشەکە وتوویەتی:

((جیاوازی شۆڕشی ئارارات لەگەلّ شۆڕشەکەی پیرانا ئەوەیە ئەم دروشمی سەربەخۆی کوردی بەرزکردبوەوە نەك مافی حوکمی ناوخۆی و بوژاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی.

بەو جۆرە جیاوازی خۆیبونی شۆڕشی ئارارات لەگەلّ (ئازادی) کە خاوەنی شۆڕشی (پیران) بوو ئەوە بوو خۆیبوون پرۆگرام و پێڕەوێکی،

ڕوون و ئاشکرای هەبووەو بریتی بووە لەشۆڕشی هەموو جەماوەری کوردو شۆڕشێکی ناوچەیی نەبووە وەکو ئەوەی پیران.

سریا بدرخان ڕەخنەی سەرەکی لەشۆڕشەکەی ئاگریداغ ئەوەیە کەلای وایە دەبوایە بێجگە لە (احسان نوری) جێگرێکیش هەبوایە بۆ ئەوەی ئەو جێگرە لەبریتی احسان نوری دەستی بکردایە بەشەڕێکی پارتیزانی.

کریس کوچیراش لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) هەمان ڕەخنەی لەخۆیبوون گرتووە کە نەیتوانیبوو جێگرێك بۆ احسان نوری دابنێت بۆ ئەوەی ئەو جێگرە درێژە بەشۆڕشەکە بدات بەشێوەیەکی پارتیزانی.

لەڕاستیدا ئەو ڕەخنانەی لەشۆڕشەکەو لەخۆیبوون و لەسەرکردەی هێزەکانی کورد گیراوە هەموویان لەشوێنی خۆیدابوون, بەڵام لام وایە دەبێ ڕەخنەیەکیش لە احسان نوری بگرین کە نەدەبوو شۆڕش بەجێ بهێڵێت و ببێت بەپەناهەندە لەئێران و دوور نەبوو ئەگەر احسان نوری خۆی شوێنی ئەو جێگرەی بگرتایەتەوە کە هەندێ لەڕەخنەگران وتویانە لەوانەبوو ئەو جێگرە بەشەڕی پارتیزانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خۆی بگرتایەو مانەوەی بەو شێوەیە دوور نەبوو ڕێگەی لە دوژمنانی کورد بگرتایە کە نەتوانن بەئاسانی دەست بەو کاولکارییە بکەن کە لەدوای شکانی شۆڕشەکە کردوویان.

## باسی سیازدەهەم

# بارودۆخ لەدوای شکاندنی شۆڕشی ئاگریداغ

هەرچەند شۆڕشی ئاگریداغ شکابوو، سەرکردایەتی شۆڕش ئەندامەکانی پەرەوازە بوبوون و احسان نوری پاشای سەرکردەی شۆڕش لەتاران بوو بوە ئاوارەو لەویٚ نیشتەجیٚ بووبوو، بەلاٚم تاوان و زەبرو زەنگی تورکەکان هەتا دەهات خراپتر دەبوو، بەوپەڕی دڕندەیەتی یەوە ڕەفتاریان لەگەڵ دانیشتوانی کوردا دەکردو ئەوانەشی کە بەشدار نەبوبوون لەشۆڕشی ئاگریدا لەو جەورو ستەمەی تورك ڕزگاریان نەبوبوو، بۆیە لەهەندیٚ ناوچەدا کە دانیشتوانی گەیشتبووە تینیان بەناچاری و بۆ پاریٚزگاری کردن لەخۆیان و خاوخیٚزانیان ڕووبەڕووی دەسدریٚژیکەرەکانی حکومەتی تورك دەبونەوە.

دەربارەی ئەوە زنار سلوپی کەخۆی ئەندامیٚکی چالاکی کۆمەڵی خۆیبوون بووە، لەلاپەڕە (١٨٤)ی کتیٚبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) باسی چەند کەسیٚکی کردووە کەوتوویەتی:

((شێخ عبدالرحمن كەوەختی خۆی لەدوای شۆڕشەكەی (پیران) هێشتا كۆڵی نەدابوو, لەدوای شكانی شۆڕشی ئارارات هەر لەچالاكی خۆی نەكەوتبوو.

ئەو شێخ عبدالرحمانە بوبوو بەئەندامێكی چالاك لەلقی (موصل)دا هەمیشە لەچالاكیدا بوو دژی حكومەتی تورك.

ساتێك (عارف بەگ) لە(میكیس) لەساڵی ١٩٣٢دا ڕاپەڕینێكی دەستپێكردبوو لەناوچەكانی (هەكاری)و (میكیس)و هەواڵی گەڕانەوەی (داود ئاغای) كوڕی (ئیبراهیم پاشای هسكی) كە لەزۆر سەرچاوەدا بە (برۆ) ناوبراوەو كە (٤٠٠)چەكداری كۆكردبوەوەو سەرلەنوێ كرابوو بەبنەمای بزووتنەوەیەكی تازە لە(ئارارات)دا, كۆمەڵی خۆیبوون بۆ كۆكردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو جموجوولە (شێخ عبدالحمن)ی لەگەڵ بیست چەكداردا نارد كە یەكێك لەوانە (یوسف میرزا)ی خەڵكی گوندی (ئیرس) بوو لەناوچەی (ئیقلیم كفر) لەگەڵ عبدالرحمن محمدو (علی قولنشی)و مەلاكانی (ئیره)و ئەمانە هەموویان ڕویانكردە ئارارات, بەلاّم لەڕێگادا ساتێك شێخ عبدالرحمن تفەنگەكەی ئەداتە دەست (نەجمۆ)ی پیاوی, نەجمۆ بەوپەڕی خیانەتو ناپیاوییەوە بەو تفەنگە شێخ عبدالرحمن دەكوژێتو سەری دەبڕێتو كەللەی سەری بەتاریكای شەو ئەبات بۆ توركەكانو بەو شێوەیە لەو ڕۆژە ناسكو سەختەدا میللەتی كورد تێكۆشەرێكی ئازاو كۆڵنەدەری وەكو شێخ عبدالرحمن لەكیس چوو.

گۆڤاری (گزینگ)ی ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٩٦ باسی ئیبراهیم پاشای كردووە لەدوای شكانی شۆڕشی پیراندا (باوكی ئەو داود ئاغایەی بەرلەمە زنار سلوپی باسیكردووە) لەگەڵ (فەرزندە)دا توانیبویان (١٠٠٠) چەكدار

کۆبکەنـەوەو بڕیاریانـدا لەهەنـدێ ناوچـەی ئێـرانیش بـەهاوکاری کردنـی جەلالیەکانی نزیکی (ماکو) درێژە بەخەبات بدەن.

گۆڤاری گزینگ باسی فروفێڵی کاربەدەستانی ئێرانی کردووە کەچۆن ئیـبراهیم پاشـایان خەڵەتانـدبوو, بـەناوی گفتوگۆکردنـەوە شـوێنێکیان دەستنیشان کردبوو بۆ بینینی ئیبراهیم پاشا کە بەخۆیو (٩٧) سوارەوە ڕویـانکردبووە ئـەو شـوێنە, بـەڵام لـەڕێگادا بۆسـەیان بـۆ نـابوەوەو تەقـەی لێ دەکـەنو ئیـبراهیم پاشـا دەکـوژرێو (فەرزنـدە) جڵـەوی کاروبـار دەگرێتـە دەست, بەڵام (فەرزندە)ش هەمان هەڵەی ئیبراهیم پاشای دووبارە کردەوەو لەڕێگادا پەلاماریانداو ئەویشیان بەبریندارى بەدیل گرت.

دەربـارەی دڕندەیـەتی تـورك بەرامبـەر بـەکورد لـەکاتی شۆڕشـی ئـارارات و لـەکاتی سـزادانو ئـاوارەکردنی کـورد بەکۆمـەڵ دوکتـۆر عزیـز شمزینـی لەلاپـەڕە (١٠٥)ی کتێبەکەیـدا سەرچـاوە (٤١) ئامـاژەی بـۆ بڕیـارێکی کۆمیتـەی ڕاپەڕانـدنی مەکتـەبی (سوسـیال ئیـنتر ناسیونال)ی کرێکـاران کـردووە کـە لـەڕۆژی (١٩٣٠/٨/٣٠)دا لەشـاری (زویـرنخ)ی سویسـرە کردووە کە لەو بڕیارەدا وتراوە:

((کۆمیتـەی ڕاپەڕانـدنی سوسیالیستی کرێکارانی جیهـان) سـەرنج بـۆ ئـەو کوشـتارانە ڕادەکێشـێت کـە دەوڵـەتی تورکیا نـەك تـەنها دژی ئەوانـە کردوێتی کە بەشدارییان کردبوو لەشۆڕشـدا, بەڵکو دژی ئـەو کوردانـەش کـە بەشـدار نـەبوون لەشۆڕشـداو هـەروەکو چۆن کـاتی خـۆی تـەنگیان بـە ئەرمەنیـەکان هەڵچـنیبوو بـۆ لـەناوبردنیان, بەرامبـەر بـەکوردیش هـەمان بڕیـاری لـەناوبردنی ئەوانیشـیاندا, کەچـی بەرامبـەر بـەم هـەموو تاوانانـە ڕایـی گشـتی نـاو نەتـەوە گـەورەکانی لێـی بێـدەنگنو ورتـەیان لێ نایـەو

دەنگی بێزاری خۆیان دەرنابڕن بەرامبەر بەو دڕندەیەتیەی تورك, لەبەر ئەوە دەستەی راگەیاندن داوا لەجیهان دەكات دژی ئەو بەسەرهاتەو ڕووداوە خوێناویانە بوەستن و دەنگی بێزاری خۆیان دەرببڕن)).

لەڕاستیدا توركەكان گوێیان نەدابووە ئەوەی ڕێكخراوێكی جدیهانی ڕەخنەیان لێ بگرن بەرامبەر بەو ڕەفتارانەی دژی كورد دەیان نواندو هەروەكو پروفیسۆر حسرتیان لەكتێبەكەیدا سەرچاوە (٤٩) باسی وتارێكی عصمت ئینونوی كردووە بەبۆنەی كردنەوەی هێڵی شەمەندەفەری (سیواس) لە ئەنجومەنی وەزیراندا ووتبوی:

((تەنها هەر نەتەوەی توركو ئەوەی بەڕەگەز خۆی بەتورك دەزانێت مافی ئەوەی هەیە خۆی بەهاوولاّتی تورك بزانێت و ئەوی بەوە ڕازی نەبێت خاوەنی هیچ مافێك نییە)) بێجگە لەو وتارەی (عصمت ئینونو (محمد ئەسعد بەگ)یش كە وەزیری دادوەری توركیا بووە لەكاتی دەنگدانێكدا كەلە (ئەدیمش)دا كرابوو بەئاشكرا وتبووی:

((ئێمە لەولاّتی توركیادا دەژین كە ولاّتێكە لەهەرە گەورەترین ولاّتانی جیهان دەژمێرێت لەڕووی سەربەستیەوە, ئەو كەسەی بیەوێ خۆی هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی ببێت بەنوێنەری ئێوە پێویستە ئەو كەسە لەڕەگەزی تورك بێت و تەنها دەبێ تورك خۆی بەگەورەی ئەم ولاّتە بزانێت و ئەوانەی بەڕەگەز خۆیان بەتورك نازانن تەنها مافی ئەوەیان هەیە وەكو كۆیلەیەك سەیری خۆیان بكەن و پێویستە لەسەر دۆست و دوژمن بەباشی لەم ڕاستیە بگات).

ڕۆژنامەی (حاكمیت میللەت) یش لەژمارەی ڕۆژی (١٩٣٠/٨/١٠)دا وتوویەتی:

((ئـەو داخوازيانـەی لەلايـەن كيـوی و وەحشـيەكانەوە داوا دەكريـت (مەبەستـی داخوازيـەكانی خويبـون بـووە) زمـانی ئـەو كەسـانە كـە قسـەی پـیٚ دەكـەن هـەموو ووشـەكانی لەدووسـەد ووشـە زۆرتـر تێپـەڕناكات كـە شێوەی ژيانيشيان وەكو ژيانی نيـوە مـەيمونو نيـوە مرۆڤێك وايـە, بـەڵام ئاسايی لانكـەی شارسـتانێتی (كـەزۆرجار بـەتوركيا ووتـراوە – ئاسـيای بچـووك) گـویٚ لـەو جـۆرە داخوازيانـە ناگرێـت چـونكە ئەوانـە (مەبەسـت كـوردە) بەوپـەڕی بـیٚ شـەرمييەوە داوای شـتیوا دەكـەن كـە لەسـەر ئـەو داخوازييەيان شايانی ئەوەن لەناوببرێنو لەڕاستيشدا تائيستە هـەر بـەو شێوەيەش ڕەفتاريان لەگەڵدا كراوە)).

پروفيسـۆر حسـرتيان بەرامبـەر بـەو بۆچـوونەی وەزيـری دادوەری تـوركو ئـەو دان پيانانـەی ئـەو ڕۆژنامەيـە, لەلاپـەڕە (١١١)ی كتێبەكەيدا هەمان سەرچاوەی پێشوو وتوويەتی:

((وڵاتێـك كـەوەزيری دادوەرييەكـەی بـەو شـێوەيەو بـەو پـەڕی بـیٚ شەرمييەوە لافو گەزافی ئەوە لیٚ بدات كە وڵاتەكەی بەگەورەترين وڵاتـی سەربەسـتی دەژمێرێـت ئاخۆ ئيتر دەبـیٚ چـۆن ڕەخنـە لەڕاپـەڕينی كـورد بگيرێت كە خـۆی ئـەدات بەكوشـت بـۆ ئـەوەی لـەو توركـە داگيركـەرە خـۆی ڕزگار بكات؟)).

ئـەوەی شـايانی باسـە, دوكتـۆر جـەمال نەبـەزيش ئامـاژەی بـۆ هـەمان ڕۆژنامـەی ميللـەت (Milliyet)ی ژمـارە (١٦٣٦)ی ڕۆژی (١٩٣٠/٨/٢١) كـردووەو باسـی ژمـارە (١٦٥٥)ی هـەمان ڕۆژنامـەی كـردووە كـە لـەڕۆژی ١٩٣٠/٩/١٩دا دەرچـووەو لەپـەڕە (١٠٤) كتێبەكەيـدا سەرچـاوە (٣١)

وتوویەتی ئەو ڕۆژنامەیە لەو ژمارەیەیدا ئاماژەی بۆ وتارێکی (محمود ئیسات بوزکورت) کردووە کە وتوویەتی:

((لەتورکیادا ئیمڕۆ ئازادی لەناویا لەهەموو سوچێکی ئەم دنیایە زۆرترەو ئەم نیشتمانە خاکی تورکەو ئەوی لەم وڵاتەدا بەڕەگەز تورك نەبێت تەنها هەر یەك مافی هەیە ئەویش بریتییە لەخزمەتکاریو کویلەیی کەلام وایە (محمود ئەسعەد بەگی حسرتیان)و (محمود ئیسات بوزکورت) کە دوکتۆر جەمال ناوی هێناوە هەر یەکێك بوون.

لەڕاستیدا هەڵوێستی تورکەکان بەرامبەر بەکورد وەکو لەڕۆژنامەو وتارەکانی عصمت ئینونوو محمود ئەسعد بەگدا باسیانکردووە تەنها ئەو هەڵوێستەیان بەرامبەر بەکورد هەر لەدوای شۆڕشی ئاگریداغ دەرنەبڕیوە، بەڵکو ئەو سیاسەتە پڕ لەڕەگەزپەرستیەیان بوە بەویردی دەمیانو لەو ڕووەوە دوکتۆر جەمال نەبەز لەلاپەڕە (١٠٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٣١) وتوویەتی:

((پاش کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهان، یەکسەر ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی تورکیا دەستیانکرد بەبڵاوکردنەوەی درۆو دەلەسەو بوختانکردن دژی کوردو لەو ڕووەوە ڕۆژنامەی (son post)ی ڕۆژی ١٩٤٦/٤/١١ وتوویەتی:

((لەتورکیادا کەمە نەتەوەیەك بەناوی کوردەوە نییە، لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەو شوێنانەی بێگانەکان بەکوردستانو ئەرمەنستان ناویان دەبردن، لەو شوێنانەدا تورکی دواکەوتوی تێدا دەژیاو زمانەکەیان کە بریتی بوو لەجۆرە تێکەڵیەکی فارسیو عەرەبی زمانێکی

دیکەیان لەزمانی تورکیە ڕەسەنەکەیانەوە دروستکرد, زمانێك کە ئاوازەیەکی زۆر سەیرو عەنتیکەی هەیەو ناویان ناوە کوردی)).

دەربارەی ئەو بۆچونەی ڕۆژنامەی (son post) کە دوکتۆر جەمال نەبەز ئاماژەی بۆ کردووە, دوکتۆر عەزیز شەمزینی لەلاپەڕە (١٠٤)ی کتێبەکەیدا وتوویەتی.

(ئەکرەم ئوزاقلی)ی گێل لەو گۆڤارەدا (کە سەرچاوەکانی‌تر بەڕۆژنامە ناویان بردووە) بیرو باوەڕە شۆڤێنیەکانی خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە کە وتوویەتی:

((لەهیچ کاتێکدا کەمایەتی کورد لەتورکیادا نەبووە نەبەنیشتەجێ بوون‌و نەبەکۆچەری‌و دەیان ساڵ لەمەوبەر لەناوچەکانی تورکیادا کە بێگانەکان بەکوردستان‌و ئەرمەنیای دەزانن هەندێ تورکی دواکەوتوو دەژیان, ئەو تورکە دواکەوتوانە لەبەرئەوەی بەدابڕاوی لەناوچەیەکی دوری ناو دەوڵەتی عوسمانیدا دەژیان فێری هەندێ وشەی عەرەبی‌و فارسی بون‌و ئەو زمانانەی ئەوانەی ئیمڕۆ پێی دەدوێن زادەی ئەو وشانەیە بۆناو زمانی تورکی, بەلآم لەم ڕۆژگارەدا فێرگەکان هەلومەرجێکی لەباریان پێکهێناوە, لەبەرئەوە ئومێدەوارین لەئایندەیەکی نزیکدا ئەو شێوە زمانە بەیەکجاری نەمێنێت‌و لەناو بچێت)).

بێگومان نوسەری ئەو باسەی (son post) کە دوکتۆر جەمال باسیکردووە, نوسەری هەمان شتە کە دوکتۆر عزیز شمزینی بەدورودرێژتر باسی کردووە, کە ئەم جۆرە بۆچونانەی کاربەدەستانی تورك‌و نوسەرە ڕەگەزپەرستەکانی تورك‌و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیان قەوانێکی کۆنەو لایان وایە بەو درۆو دەلەسانەی ئەوان واز لەزمانە ڕەسەنەکەی باووباپیرانی

خۆیان دەهێنن و لایان وایە بەو پروپاگەندانەی بڵاوی دەکەنەوەو بەکورد دەڵێن (تورکی شاخاوی) مێژوونووسان و سیاسەتمەدارانی میللەتان کە ماوەیەکی زۆرە لەڕەگ و ڕیشەی میللەتی کورد کۆڵیونەتەوەو ئیمڕۆ زمانەکەیان ئێجگار پوختەترە لەزمانە تورکیەکەی خۆیان کە پڕیانکردووە لەوشەی بێگانەو ئەوانە دوای حەفتا ساڵ بەسەر ئەو درۆو دەلەسانەی تورکدا ئیمڕۆ زمانی کوردی وای لێ هاتووە شارەزایانی مێژوو زمان، دان بەرەسەنی میللەتی کوردو زمانی کوردیدا بنێن و میللەتی کوردیش شانازی پێوە دەکات.

تورکەکان تەنها بەو درۆو دەلەسەو پڕوپاگەندانەی دژی کوردو زمانی کوردی بڵاویان دەکردەوە کۆڵیان نەداو بێ ووچان خەریکی لەناوبردنی کوردو تواندنەوەی میللەتی کورد بوون لەبۆتەی تورکدا بێجگە لەوە هەوڵی ئەوەشیان ئەدا لەوڵاتان بگەیەنن کەلەتورکیادا شتێك نەماوە پێی بوترێ کورد یان بزوتنەوەی کورد.

دەربارەی ئەمە زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٨٥)ی کتێبەکەیدا باسی بەدرۆخستنەوەی ئەو هەواڵانەی کردووە کە تورکەکان دەربارەی هەڵوەشانەوەی (خۆیبون) بڵاویان کریدووەوە، ئەو بەدۆرخستنەوەیە لەلایەن خۆیبونەوە نێردرابوو بۆ ڕۆژنامەی (دوغری یول- ڕێگەی ڕاست) کە لەحلب دەرچووەو بەپێی لاپەڕە (١٨٥)ی کتێبەکەی زنارسلوپی وەرامەکەی خۆیبون بەم جۆرە بووە کە نێرراوە بۆ ئەو ڕۆژنامەیەو لەژمارەی (١٩٣٣/٨/١٢)دا بڵاوکرابووەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

((لەژمارەی ڕۆژی ١٩٣٣/٨/٦)ی ڕۆژنامەکەتانا هەواڵێکتان بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناوی (هەڵوەشانەوەی خۆیبوون) کەوا دیارە ئەو

هەواڵەتان لەڕۆژنامەکانی (ئەلف باء) و (النداء)ەوە وەرتان گرتووەو وتوتانە خۆیبـون بۆیـە خـۆی هەڵوەشـاندۆتەوە بـۆ ئـەوەی سـوود لـەو یاسـای لێخۆشبوونە وەربگرێت کە لەلایەن حکومـەتی تورکەوە دەرچووە, بەڵام ئەم کۆمەڵـەی ئێمـە (مەبەسـت خۆیبونـە) کـەزمان حـاڵی کـوردەو ئامـانج و مەبەسـتەکانی کـورد ڕادەگەیـەنێت بـڵاوی دەکاتـەوە ئـەو میللـەتی کـوردەی ساڵەهایە مـاڵ و گیـانی خـۆی پێشـکەش کـردووە بـۆ ڕزگـاربوونی لەجەورو ستەم و چەوسانەوەو ئەم جمعیەتە بووە بەبەشێك لەهەست و ویژدان و گیانی میللەتەکەی و لێی جیانابێتەوەو سەرکردە نەبەردەکانی وەکو احسان نوری و (برو) و (فەرزندە) و (مەمۆ) و (نزیر) وەگەلێکی‌تر لەگەورەپیاوەکانی کورد کە هەریەکـەیان لاپەڕەیـەکی پـڕ لەشـەرەفیان لـەناو لایەنـەکانی مێـژووی میللەتەکەی خۆیانا تۆمارکردووەو ناویـان لـەناو دڵ و جەرگی میللەتەکەیان جێگیربوون و چەسپاون, ئایا ئەوانە هـەموی هـەروەکو ڕۆژی ڕونـاك شتێکی ئاشـکرا نییـە کەڕێکخراوەکـەمان چـاوەڕوانی هـیچ جـۆرە لێخۆشـبونێکی حکومەت نییە, ئەو حکومـەتـەی هـەموو مافەکانی کوردی پێشێل کـردووەو هەموو جۆرە ڕەفتـارێکی دڕندانـەی بەرامبـەر بەکورد کـردووە, ئایا لـەو بارو هەڵوێستەداو لەم ڕۆژانـەدا شتێکی شێتانەو بێ مێشـکی نییـە ئەگـەر داوای لێبوردن لەڕژێمێکی خوێناوی وابکات کە جێگە نەماوە لەکوردسـتانا کاول نـەکردبێت و هـەزاران مرۆڤی بێ تاوانیان داوەتـە بـەر گوللـەو (کمـال فوزی, دوکتۆر فواد, محمود, طیب علی و گەلێکی تریان اعدام کردووە) تـەنها لەبـەر ئەوەی کورد بون و ئایا ئەوە کارێکی بێ ویژدانانە نییە کە سـەر ڕای ئـەو هەموو تاوان و کوشتارانە ناوی کورد دەزڕێنن و بەدناوی دەکەن تـەنها لەبـەر ئـەوەی یـەك دوو کەسـی ناپیـاوو لاداو لـەڕێبازی میللەتەکەی خۆیـان لایـان

داوەو بۆ لێخۆشبونێکی درۆ کە جێگەی باوەڕ نییە سودیان لەبەڵێنی درۆی حکومەت وەربگرن‌و بەمەش بڵێن هەڵوەشانەوەی خۆیبون؟!

نامەکەی خۆیبون لەسەری ڕۆیشتووەو وتوویەتی:

تورکەکان پێنج ساڵ لەمەوبەر لێخۆشبونێکی تری لەو جۆرەیان دەرکرد (مەبەست ئەو لێخۆشبونەیە کەلەساڵی (١٩٢٨)دا حکومەتی تورک دەری کردبوو) بۆ ئەوەی خەبات‌و تێکۆشانی کورد لەناو ببەن, بەڵام دەرکەوت ئەو لێخۆشبونە هەمووی فروفێڵ‌و دەسبڕین بوو لەبەر ئەوە جارێکی‌تر هیچ کوردێکی تێکۆشەر بەو فروفێڵانە هەڵناخەڵەتێت چونکە ئیمانێکی تەواوی بەپاکی‌و ڕاستی مەسەلەی میللەتەکەی خۆی هەیەو لاوانی کورد کۆڵنادەن هیچ شتێك وایان لێ ناکات وورە بەردەن‌و بەهیچ جۆرێك سارد نابنەوە لەخەبات‌و تێکۆشانی خۆیان‌و لاوانی کورد هەمیشە چاویان بڕیوەتە ڕێبازی تێکۆشەرانی خۆیان لەوانەی بەوپەڕی مەردایەتیەوە لەبەر دادگاکان‌و لەبەر قەنارەکانا کۆڵیان نەداو هاواریان دەکرد (بژی کوردو کوردستان).

تۆوی ئەو بیروباوەڕە پاکەی لەمێشکی لاوانا چەکەرەیان کردووە شتێك نییە والەکورد بکات لەخەباتی خۆی لابداو ئەوانەی قوتابخانەکانیان لێ بەستراوەو ڕێگەی خوێندنیان لێ گیراوە چاوەڕوانی ڕۆژی ڕزگاربونن..

لەبەر ئەوە تکایە ئەو هەواڵە پڕ لەدرۆیانەی بڵاوتانکردوونەتەوە ڕاستیان بکەنەوە)).

دەربارەی بەدرۆخستنەوەی کاربەدەستانی تورك‌و ڕۆژنامەکانی تورك کە گوایە (خویبون) خۆی هەڵوەشاندبوەوە, بێجگە لەو نامەیەی کە لەلایەن خۆیبونەوە نێررابوو بۆ ڕۆژنامەی (دوغری یول) کە بەرلەمە

باسمانكرد, دوو هەڵویستی تری خۆیبون بەڵگەی ترن بۆ ئەو درۆیانەی تورك دەربارەی هەڵوەشانەوەی ئەو كۆمەڵە بلاّوی دەكەنەوە.

هەڵویستی یەكەم:

توركەكان لەدوای شكانی شۆڕشی ئاگریداغ نەخشەیەكیان ئامادەكردبوو بۆ لەناوبردنی كوردو توانەوەی لەبۆتەی توركداو نەخشەكێشی ئەمە (عابد عوسمان)بووە.

(عابدین عوسمان – یائوزمان) یەكێك لەپێشنیازەكانی ئەوە بووە ناوچە كورد نشینەكان بكرێن بەچەند بەشێكەوە كە نوسەران هەریەكەیان بەجۆرێك باسی ئەو بەشانەیان كردووە.

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٥٦)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە ٠٥٧) وتوویەتی:

(ساتێك مصطفی كمال بۆی دەركەوت ئەو بڕیاری لێخۆشبوونەی دەریكردبوو كارێكی وای نەكردبووە سەر كوردو لێی دڵنیانەبوون, بۆیە لەئایاری ساڵی ١٩٣٢دا یاسایەكی دەركرد بۆ گواستنەوەی كوردو بەپێی ئەو یاسایە ولاّت كرا بەچوار بەشەوە:

١- بەشی یەكەم: ئەو ناوچانەی دانیشتوەكانی خاوەنی ڕۆشنبیرێتی توركن.

٢- بەشی دوهەم: ئەو ناوچانەی تەرخانكرابوون بۆ ئەو كوردانەی بەزۆرە ملیّ لەشوێنی خۆیانەوە بۆ ئەم بەشە گوێزرابوونەوە بۆ ئەوەی لەبۆتەی توركدا بتوێنرێنەوە.

٣- بۆ ئەوانە تەرخانکرا کە ڕاگوێزراوەکان دەتوانن بەسەربەستی تیابژین لەوانەی خاوەن ڕۆشنبیریتی تورکن بەلام حکومەت ئەرکی ژیان و دابینکردنی ژیانیان ناگریتە ئەستۆی خۆی.

٤- بریتی بوە لەو ناوچانەی کە پێویست بوو حکومەت بەزۆرە ملیو بەبەکارهێنانی هێز دەستیان بەسەردا بگرێت و بۆ بەرژەوەندیی ولات و لەبەر هەندێ هۆی ئابوری و ڕۆشنبیری و سیاسی و سوپایی و دابینکردنی ئاسایش پێویستە دانیشتوانەکانی تەنها هەر لەو شوێنانەدا بمێننەوە کەبۆیان دەستنیشانکراوەو گواستنەوەی شوێنیان لێ قەدەغەیە؛

پروفیسۆر حسرتیان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٩) ئەو بەشانەی زنارسلوپی بەچوار بەش باسیکردون حسرتیان کردونی بەسێ بەشەوە, بەلام بەپێی کتێبەکەی دوکتۆر عزیز شمزینی دەبێ ئەو یاسایەی زنار سلوپی باسیکردووە یاسایەکی تایبەتی بووە کە لەسەر پێشنیازو نەخشەکەی (عابد ئوزمان) سازی کردبوو, شمزینی ئەو بەشانەی بەم شێوەیەی خوارەوە باسکردووە.

١- موفەتیشیەتی گشتی ژمارە (١) کە مەلبەندەکانی دیاربکربوە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی دیاربکرو بدلیس و وان و هەکاری و موش و ماردین و ئوفەو سعرتی دەگرتەوە, بۆ بەڕێوەبردنی ئەم موفەتیشیەتە گشتی یە (ئیبراهیم تالی) کە یەکێك بوو لەدۆستە نزیکەکانی مستەفا کەمال لەگەل وەهبی کەوالی سیواس بوو, وەئابدین ئوزمان, عەونی یوسف ئەمانە هەموو کران بەکاربەدەست و لێپرسراوانی ئەم بەشە.

٢- موفەتیشیەتی دوهەم: ناوەندەکەی (مرکز)ەکەی (تراکیا) بوە.

٣- موفەتیشیەتی سێهەم: لە ئەرزروم.

٤- موفەتیشیەتی چوارەم: (ئەلازیك) كە سنوری ئەم بەشە هەموو ویلایەتە كوردنشینەكانی دەگرتەوە وەكو ئەلازیك, درسیم بنگول.

لەڕاستیدا پێشنیازو نەخشەكەی (عابدین ئوزمان) تەنها بریتی نەبووە لەو دابەشكردنەی لەو سەرچاوانەدا ئاماژەیان بۆ كردووە بەڵكو بریتی بووە لە نەخشەیەكی دوورودرێژ كە لە(٢٣) لاپەڕەدا ئامادەی كردووەو حكومەتی تورك وەك گوێگرانێك هەندێكی كردووە بەیاساو بەجێی هێناوە كەهەندێ سەرچاوە باسی هەندێ لەناوەڕۆكی ئەو نەخشەو پێشنیازەیان كردووە. (لەباسی یەكەمی بەشی دووهەمدا- شۆڕشی درسیم كورتەی‌ئەو نەخشەیەی عابدین ئوسمان باسی دەكرێت لەو ٢٣ لاپەڕەیەدا باسكراوە). دەربارەی ئەوە, پروفیسۆر حسرتیان لەكتێبەكەیدا سەرچاوە (٤٩) ئاماژەی بۆ هەندێ لەو مادانە كردووە كە وتوویەتی:

مادە (١-٢): دەسەڵات دەدرێت بەكاربەدەستانی توركو پۆلیس توانای ئەوەی دەبێت هەموو جۆرە پەیوەندییەكی نێوان عەشایرەكان لێك بپچڕێننو ڕێگە نەدرێت بەهیچ سەرۆك عەشیرەتێك دەسەڵاتی جارانی بمێنێت (حسرتیان ئەڵێ: ئەمە ئەو سەرۆك عەشتیرەتانەشی دەگرتەوە كە جاران خۆیان بەكرێ‌یان دەگرتنو كردبویانن بەكوتەكی دەستیان دژی شۆڕشگێڕانی كورد.

مادە (٣) هەموو زەوی‌و زاری ئەو شوێنانەی حكومەت بەپێویستی دەزانێت دەبن بەموڵكی حكومەت (حسرتیان دەڵێ: بەپێی ئەم ماددەیە دانیشتوانی كورد لەهەمووماڵو موڵكی خۆیان بێ‌بەش كران.

ماده(٤) ئەو موڵکانەی بەپێی مادەی (٣) دەستیان بەسەردا دەگیرێت دەدرێن بەو تورکانەی لەیۆنانەوە ڕویانکردۆتە تورکیا.

مادە (٥) کاربەدەستانی حکومەت دەسەلأتی ئەوەیان دەبێت ئەگەر گومانیان لەهەرکەسێك هەبێت ئەو کەسە بەخۆی و خاووخێزانەوە لەو شوێنە دەرکەن.

مادە (٦-٧) پێویستە هەموو جۆرە هەنگاوێك بنرێت بۆ ئەوەی کورد وای لێ بکرێت زمانەکەی خۆی لەبیربچێتەوەو پێویستە کورد تەنها ڕێگەی ئەو کارو فرمانانەی پێ بدرێت کە بەزەبری لەش و توانا جێبەجێ دەکرێن (یەعنی قەدەغەکردنی هەموو کاروبارێکی زانیاری و ڕۆشنبیری).

مادە(٨) ئەو کوردانەی لەناوچەکانی خۆیانەوە دەگوێزرێنەوە بۆ ناوچە تورك نشینەکان پێویستە ژمارەیان لە (١٠٪) دانیشتوانی تورکەکان تێپەڕ نەکات.

مادە (٩) وەزیری ناوخۆ دەسەلأتی ئەوەی دەبێت ڕەوەندو کۆچەرییەکان ئەگەرچی هەمووشی بەتورك حساب نەکرابن و دووربن لەڕۆشنبیرێتی تورکەوە، پێویستە ئەوانە دابەشبکرێن بەسەر گوندو شارەکانداو ئەو خێزانانەش کە لەسەر سنورەکاندا دەژین و جێگەی گومانن لەلایەن دەوڵەتەوە، پێویستە هەروەکو چۆن قەرەجەکان فێری ڕۆشنبیرێتی تورك نەبوون دەبێ ئەمانەش وەکو ئەو قەرەجانە دەربکرێن بۆ دەرەوەی وڵات.

مادە (١٠) فقرە (١) پێویستە ڕێگە بەهیچ سەرۆك عەشیرەتێك نەدرێت تواناو دەسەلأتی هیچ شتێکیان هەبێت ئەگەرچی لەدادگاکاندا یا بەپێی هەندێ مەراسیم ئەو جۆرە دەسەلأتەیان پێ درابێت.

ماده (١٠) فقره (٢) تەرخانكراوه بۆ چۆنێتی دابەشكردنی ئەو زەوی‌و زارانەی حكومەت دەستی بەسەردا گرتووه بۆ دابەشكردنی ئەو توركە ئاوارانەی ڕویانكردبووه توركیا.

ماده (١٠) فقره (٣) وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە سەرۆك عەشیرەت‌و شێخەكانی كورد بگوێزێتەوەو دابەشیان بكات بەسەر ئەو شوێنانەدا كەخۆی بەباشی دەزانێت ئەگەر بۆی دەركەوت مانەوەیان لەشوێنەكانی ئێستەیانا زیانی دەبێت بۆ ئاسایشی وڵات.

حسرتیان ئەڵێ:

بەبڵاوبونەوەی ئەم یاسایە ئاژاوەو نائارامی‌یەكی توندوتیژ لەكوردستانا پەیدا بوو, حكومەت بۆ خاوكردنەوەو خامۆشكردنی بارودۆخ بڵاوی كردەوە ئەو یاسایە لەدوای دە ساڵی‌تر ئەوسا كاری پێ دەكرێت, بەڵام سەیر ئەوە بوو هەمووی دوو ساڵ تێپەڕی نەكردبوو بەسەر ئەو یاسایەدا حكومەت لە (١٩٣٤/٦/١٢)دا یاسای ژمارە (٢٥١٠)ی دەركرد بۆ چۆنێتی ڕاگوێزان‌و ئاوارەكردن‌و نیشتەجێ كردنیان كە مەبەستی لەوە تەنها هەر كورد بوو.

حسرتیان لەلاپەڕە (١٦٠)ی كتێبەكەیدا لەسەری ڕۆیشتووەو وتوویەتی:

((ساتێك بورجوازی تورك بڕیاری نەهێشتنی دەسەڵاتی سەرۆك عەشیرەتەكانی دەركرد, لەڕاستیدا ئەو دژایەتیەی بەرامبەر بەو سەرۆك عەشیرەتانەی بۆ ئەوە نەبوو كە پلەو ڕادەی ڕۆشنبیری‌و باری ئابووری جەماوەری كورد باش بكات‌و بەرزی بكاتەوەو ڕزگاریان بكات لەچەوساندنەوە, بەڵكو ئەو یاسایەی وەكو كوتەكێكی دەستی بەكاردەهێنا بۆ هەڵوەشاندنەوەی شیرازەی نەتەوەی كوردو توانەوەی لەبۆتەی نەتەوەی

تورکدا کە ئەم ڕاستی‌یە لەمادە (١١)دا ڕوون دەبێتەوە کە لەو مادەیەدا بەئاشکرا وتراوە:

١- ڕێگە بەهیچ کەسێك نادرێت لەوانەی زمانی تورکی بەزمانی باوو باپیری خۆیان نازانن کە هیچ گوندێك یا گەڕەکێکی تازە دروست بکەن بۆخۆیان‌و بۆیان نییە هیچ ڕێکخراوێك بۆخۆیان پێك بێنن.

٢- وەزارەتی ناوخۆ دەسەڵاتی هەیە هەرچی بەباش بزانێت بیکات بەرامبەر بەوانەی دوورن لەڕۆشنبیرێتی تورکەوەو بۆی هەیە دووریان بخاتەوە بۆ ئەو شوێنانەی بەباشی دەزانێت, وەبۆشی هەیە بێبەشیان بکات لەجنسیەی تورکی.

٣- ڕادەیەکی سنووردار دانرابو بۆ کوردە ئاوارەکراوەکان کە بەپێی ئەو بڕیارە دەبوایە تێکەڵ بکرانایە بەکۆمەڵگاکانی تورك‌و ڕێگەیان پێ نەدرێت لەهیچ شوێنێکدا ببن بەزۆرینەی دانیشتوانی ئەو شوێنە.

حسرتیان بێجگە لەو مادانەی پێشوو, ئاماژەی بۆ مادە (٢٩)ی ئەو یاسایە کردووە کە وتوویەتی:

((ئەوانەی ناوچەی یەکەم دەبێ هەتا ماوەی (١٠)ساڵ لەو شوێنانەی بۆیان تەرخان دەکرێت بمێننەوەو نابێ بەهیچ شێوەیەك بەجێی بهێڵن.

دەربارەی ئەو یاسایەی پروفیسۆر حسرتیان باسی کردووە, زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٥٧)ی کتێبەکەیدا بەرامبەر بەو یاسایەی لەڕۆژنامەی (میللیت)ی ژمارە (٢٢٣٧)ی ڕۆژی ٥/ی ئایاری ١٩٣٢دا بڵاوکرابووەوە بەیانێکی (خۆیبون)ی بڵاوکردۆتەوە (کەئەمەش بەدرۆخستنەوەیەکی تری تورکە کە بڵاویانکردبووەوە خۆیبون خۆی هەڵوەشاندبووەوە, لەو بەیانەدا وتراوە:

((ئەی هاووڵاتیانی کۆڵنەدەر، وائیمڕۆ میللەتی کورد دووبارە تووشی مەترسیترین بەسەرهات هاتووە لەمێژووی خۆیداو ئەم جارە تورك بەئاشکراتر لەهەموو جارێك دەستی کەوتۆتە ڕوو بەرامبەر بەکورد.

ئەو یاسا شوومو ڕەشەی بیستوتانەو خوێندوتانەوە بریتییە لەوەی تاقمێکی درۆزنو ساختەچی لەژێر پەردەی ئەنجومەنی میللی گەورەدا چۆن خۆیان شاردۆتەوەو یاسایەکی زاڵمانەی پڕ لەساختەیان بۆکورد دەرکردووە کە لەڕۆژنامەی (میللەت)ی ڕۆژی (٥/ئایار/١٩٣٢)دا ژمارە (٢٢٣٧) کە لەو یاسایەدا وتراوە:

ئەوانەی زمانی تورکی بەزمانی نەتەوایەتی خۆیان نازانن ڕێگەی ئەوەیان پێ نادرێت بەهیچ شێوەیەك گوندو گەڕەكو شوێنی کاروباری خۆیان چاك بکەنەوەو ئاوەدانیان بکەنەوەو نابێ هیچ جۆرە چالاکیەك بنوێنن.

کورد لەماوەی چوار هەزار ساڵ لەمەوپێشەوە هەتا ئێستە لەناو خاکی باووباپیرانی خۆیدا ژیاوە، وائیمڕۆ بەخۆیانو خاووخێزانەوە دوورخراونەتەوە بۆ (ئەنادۆل)و هەموویان لەو پەڕی ژیانی هەژاریو برسێتیو نەبوونیدان... ئایا ئەمە ناگەیەنێت حکومەتی تورك زۆر دەمێکە نەخشەی لەناوبردنی کوردی کێشاوەو هەر لەڕاگوێزانی یەکەمەوە مەبەستو نیازەکانی تورك بەرامبەر بەکورد ئاشکرا بوەو لەو ڕۆژانەوە شیرو سونگیەکانیان ئاراستەی سنگی هەموو کوردێك کردووە، کە هەمان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەرمەنیەکانیشدا کردو دەبێ چاوەڕوانی کردەوەی خراپتریشیان لێ بکرێت.

ئەی هاووڵاتی خۆشەویست... تۆ ئەندامی ناو کۆمەڵگای میللەتەکەی خۆتی‌و بەرپرسیاریت بەرامبەر بەمیللەتەکەت کە بەداخەوە تائیستە نەمان توانیوە تواناو دەسەلاتمان بۆ سوودی خۆمان بەکاربێنین‌و جارەها یەك لەدوای یەك خەڵەتێنراوین‌و لەخشتە براوین.

واحکومەتی تورك بێ پێچ‌و پەناو بەئاشکرا پێمان دەڵێت نابێ هیچ کوردێك بەزیندوویی بژی، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر هەموان واز لەهەموو ناکۆکی‌و ناڕێکیەکانی ناو خۆیان بهێنن بچنە پاڵ نوێنەری میللەتەکەتان (کە مەبەستی (خۆیبون)ەو دەست بدەنە چەك کە ئەمە تاقە ڕێگایەکی ناچارییە کە بتوانرێت لەڕێگەی ئەوەوە بەربەرەکانی تاوانەکانی تورکی تاوانبار بکرێت‌و هەر لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانرێ کوردستانی پیرۆز ئازاد بکرێت‌و لەتاوانبار ڕزگار بکرێت.

ئەی هاووڵاتیان.. تۆزێك بیر لەوە بکەنەوە ئایا چۆن هەتا کەی دەتوانن بەرگەی برسێتی‌و نەبوونی‌و سزاو دەسدرێژیکردن‌و جنێودانی جەندرمەکانی تورك بگرن‌و پێویستە بەسەرهاتی ئاوارەبووەکانی پێشوو بخرێنە بەرچاو کەچۆن تووشی چەرمەسەری‌و ماڵ وێرانی بوبون‌و چۆن جەندرمەکانی تورك هەمیشە ئێمەیان بەکەرو گا ناودەبرد.

ئەم وڵاتەی باووباپیرانمانی تیادا نێژراوە، ئایا شایانی ئەوە نییە بی پارێزین‌و مل کەچ نەکەین بۆ ئەو یاسا سەخت‌و گرانەی بۆ لەناوبردنی ئێمە دەرچووەو دەیانەوێت کوردێك لەناو خاکی خۆیدا نەمێنێت؟!

ئەی برایانی هاووڵاتی....دەست بدەنە چەك بۆ ئەوەی لەدنیا بگەیەنین ئێمەی نەوەی باووباپیرانی ئازاو نەبەردمان ئامادەین لەپێناوی پاراستنی شەرەفی خۆمان‌و وڵاتەکەماناو لەپێناوی ڕزگارکردنی کوردا گیانمان بەخت

ئەکەین, ئەگەر ئێمە پیاوانەو ئازایانە شەڕ نەکەین, وامان لێ دێ هەمووسان لەبرسا بمرین, لەبەر ئەوە ئەم بانگەوازە فەرامۆش مەکەن و بچنە پاڵ هاوولاتیەکانتان و هەمیشە ورەتان بەرزبێت و کۆڵ مەدەن... بڕواتان بێ, ئەگەر ئێوە دەست بەڕاپەڕینێکی چەکدارانە بکەن, ئەوا ژمارەیەکی زۆر لەئەفسەران و ڕۆشنبیرانی کورد بەدەنگتانەوە دێن و هاوکاریتان ئەکەن و بەهەموان شۆڕشێکی دلێرانە بەرپا دەکەین لەپێناوی سەرگرتنی میللەت و ولاتەکەمانا کە ئەبێ هەمومان سەروماڵمانی لەپێناودا فیدابکەین.

بێگومان شارەزای ئەوەن ڕزگارکردنی وڵات و نەتەوەکەمان پێویستی بەهەڵگرتنی چەك هەیە, لەبەر ئەوە سڵ مەکەنەوەو دوودڵ مەوەستن و دوورەپەرێز مەبن چونکە ئێمە هەروەکو مەڕێکی بەسزمان لەشوێنی خۆمانا بوەستین و جووڵە نەکەین ئەوا گورگەکان پەلامارمان ئەدەن و لەبەرئەوەی خۆتان بەکورد دەزانن تورکەکان نەك تەنها هەرخۆتان بەڵکو بەخاوو خێزانەوە هەمووتان لەناو دەبەن, بۆیە پێویستی‌یەکی نیشتمانیە لەم ڕۆژە ناسکەدا ئامادەبن بۆ فیداکاری لەپێناوی ڕزگارکردنی نیشتماندا بۆ ئەوەی مافی ڕەوای گەلەکەمان مسۆگەر بکرێت و شەرەفی کورد بپارێزیت.

ئەگەر هەندێکیشمان لەپێناوی ئەم مەبەستە پیرۆزەدا شەهید ببین ئەوانی‌تر لەناو خاکی خۆیانا بەسەربەستی و ئازادی لەگەڵ خاووخێزانیانا بەئارامی لەناو گوندو شارەکانی کوردا دەژین.

برایانی خۆشەویست: ئەگەر ئەم هاوارو بانگەوازەی ئێمە لەناخی دڵ و دەرونمانەوە بەئێوەی خۆشەویستی دەگەیەنین و تۆش دەتەوێ لەکۆت و زنجیری دوژمن ڕزگار ببیت ئەوا پێویستە بەدەنگیەوە بچیت و

بەپیچچەوانەوە کەمتەرخەمی کارێکی وادەکات هەمووومان لەناو بچین و کەرامەتمان پێشێل بکرێت.

ئەی هاوولاتیان ... داوای سەرکەوتنتان دەکەین

لیژنەی ناوەندییی خۆیبون

١٩٣٢/٦/١٦

بێجگە لەو نەخشەیەی لەلایەن (عابدین ئوزمان)ەوە ئامادەکرابوو، جگە لەو یاسایانەش کە حکومەتی تورك دەری کردبوو وەکو لەباسەکەی پرۆفیسۆر حسرتیاندا بەدوورودرێژ باسیانکراوە حکومەتی تورك نەخشەیەکی نهێنی ئامادەکردبوو دژی کورد خۆیبوون دەقی ئەو نەخشەیەی دەستگیر بوبوو کوپیەکی ناردبوو بۆ حکومەتی بەریتانیا بۆئەوەی پێی رابگەیەنێت کەتورك چۆن نەخشەی لەناوبردنی کوردی کێشاوە بۆ ئەوەی رێگە نەدرێت بەهیچ بزوتنەوەیەکی تری کوردو نامەکەی خۆیبون و فوتوکوپیی نەخشەکەی تورك لەبیروتەوە نێررابوو بۆ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا لەلایەن (SIR.SPEARS) کە نەخشەکە بەشێك بوە لەو نەخشە دوورودرێژەی (عابدین ئوزمان) ئامادەی کردبوو.

سەیر ئەوەیە دەقی ئەو نەخشەیەی (عابدین ئوزمان) لەدوای دە دوازدە سالْ لەدوکیومێنتیکی بەریتانیادا بلاْوکراوەتەوە، ژمارە (FO.371-34966) رۆژی ١٩٤٣/٥/١٠ دۆکیومێنتە باسی ئەوە دەکات کە (SIR.SPEARS) لەناو نامەیەکدا ناردوێتی بۆ سەرۆکی وەزیرانی بەریتانیاو وتوویەتی:

((ئەو نەخشەیەی تورك پرە لەهەرەشەو بەئاشکرا هەمووی بۆنی خوێن رشتنی لێ دێت)).

کە ئەمەی خوارەوە وەرگێرانی بەشێکی ئەو نەخشەیەیە کە ئابدین ئوزمان باسیکردووەو خۆیبون ناردوێتی لەرێگەی (SIR.SPEARS)ەوە:

١- پێویستە حکومەتی تورکیا وریای ئەوە بێت کەنابێ رێگە بەوە بدرێت هیچ راپەرینێکی تری کورد روبدات بەهاندانی بێگانە (دوکیومێنتەکە دەڵێ تورك لەمەدا مەبەستی سۆڤیت و سوریەیە).

٢- نیشتەجێکردنی تورك لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا پاش داگیرکردنی زەوی‌و زارەکانی ئەو ناوچانە (بێگومان مەبەست زەوی‌و زارەکانی کوردبوە)وە دابەشکردنیشیان بەسەر جوتیارەکانی تورکدا.

٣- نابێ بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بەوە بدرێت زمانی کوردی لەهیچ قوتابخانەیەکدا بەکاربهێنرێت‌و نابێ ڕێگەبدرێت لەزمانی تورکی بەولاوە هیچ زمانێکی‌تر لەناو وڵاتدا بەکاربهێنرێت.

٤- چاککردنی ڕێگەوبان بۆ ئاسانکردنی هات‌وچۆ لەو ناوچانەدا (بێگومان مەبەست ئاسانکردنی گەیشتنی هێزەکانی حکومەت بۆ هەر ناوچەیەك بیان ویستایە).

٥- باشکردنی باری ژیان‌و گوزەرانی کاربەدەستانی تورك لەوانەی لەدەزگا حکومەتیەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا کاروباری ڕۆژانەی حکومەت بەڕێوەدەبەن بۆ ئەوەی بەباشی لەو ناوچانەدا گوزەران دەکەن‌و پێویستە خانووبەرە بۆخۆیان‌و خاوخێزانیان دابین بکرێت.

٦- هەوڵبدرێت ئەو کارمەندانەی دەنێررێن بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەلات لەو فەرمانبەرانە بن کە کارامەو لێهاتووبن بۆ ئەوەی کاروبارەکانی حکومەت بەشێوەیەکی باش بەجێ بێنن.

کە ئەو نامەیەی (SIR.SPEARS)و کۆپی نەخشەکەی تورك دەگاتە لای سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا سکرتێرەکەی وەکو لەهەمان دوکیومێنتدا باسکراوە لەسەری نوسیوە:

((لەبەر ئەوەی سیاسەتی تورك لەسەر بناغەیەکی ڕەگەزپەرستی پێکهاتووە, بۆیە کاربەدەستەکانیشی هەر هەمان ڕێباز دەگرنەبەر بۆ ئەوەی هەستی نەتەوایەتی لەناو کەمەنەتەوەکانی تورکیادا لاوازبێت‌و

پەرەنەسێنێتو تورك وەكو میللەتێكی رەگەزپەرستو سەوداسەری سەربازێتی شتێكی ئەوتۆی لەباردا نییە بتوانێت خزمەتی رۆشنبیرێتیو شارستانێتی بكات)).

لەپاشكۆی ئەو دوكیومنێتەدا سكرتێرەكەی سەرەك وەزیران باسی سەرسوڕمانی خۆی كردووە كە خۆیبون چۆنو لە چ ڕێگەیەكەوە دەقی ئەو نەخشەیەی توركی دەستگیر بووەو وتوویەتی:

((تۆ بڵێی ئەو پێشنیازەی مفەتیشە گشتیەكەی تورك ئامادەی كردووە (كەمەبەست عابدین ئوزمانە) لەلایەن مركزی مخابەراتی رۆژهەلأتی بەریتانیاوە (the middle east intellegence army) كە كورتەكەی بریتییە لە (M.E.I.A) بەشێوەیەك لەشێوەكان گەیشتبێتە دەست خۆیبون؟))

لەباسی شۆڕشی دەرسیمدا, لەشوێنی خۆیدا دوبارە دەچینەوە سەر باسی پێشنیازەكانی ئەو نەخشەیەی (عابدین ئوزمان) كە پەیوەندی بەبارو هەلۆێستی كوردستانەوە بوە بەرلەدەستپێكردنی شۆڕشی دەرسیمداو ئەوەی شایانی باسە لەباسی سێهەمی بەشی سێهەمدا دوبارە ئامارژە بۆ ئەو یاسایانە دەكەینەوە كە حكومەتی تورك دەری كردووەو پروفیسۆر حسرتیان بەرلەمە ئامارژەی بۆ هەندێكیان كردووە بۆ ئەوەی ئەوانەی پروفیسۆر حسرتیان بەرلەمە باسیكردون لەزنجیرەی ئەو یاسایانەی حكومەتی تورك لەپەیمانی لوزان بەدواوە دەری كردووە.

بۆ پوچەڵكردنەوەی پڕوپاگەندەی توركەكان دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی (خۆیبون) زنار سلوپی لەلاپەرە (٢١٠)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە (٥٧) باسی چالاكی حۆیبونی بەم جۆرە كردووە:

((ئەندامە تازەکانی خۆیبون بەو پەڕی چالاکیو بیٚ ووچان لەبارودۆخی سیاسی تازە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان ڕێك بخەن بەشێوەیەکی چالاکانە لەپێناوی بەرژەوەندی نیشتماندا. چاوەڕوانی ئەوە داکرا هەندیٚ گۆڕانکاری تازە دەست پیٚ بکاتو لەگەڵ هەندیٚ لەڕێکخراوە سیاسیەکانا کەوتنە گفتوگۆو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن تواناو دەسەڵاتی هەموویان یەك بخرێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی هەموویان لەسەری ڕێکەوتبوون کە یەکێك لەو تەقەلایانە بریتی بوو لەو پێوەندییەی خۆیبون لەگەڵ مامۆستا رفیق حیلمی نیشتمانپەروەرو لیٚ هاتوو هەڵکەوتوو کە نوێنەری کۆمەڵی (هیڤی – هیوا) بوو لەباشووری کوردستاندا.

بۆ ئەو مەبەستە مامۆستا رفیق حیلمیو هاوڕێکانی (عزت عبدالعزیز بەگ– نقیب روکنی ناوسوپا)یان نارد بۆ مەرکەزی خۆیبون (لەدوایدا عزت عبدالعزیز لەگەڵ سیٚ ئەفسەری تردا کە مصطفی خۆشناوو خیر الله حمە قودسی هەموویان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە اعدام کران).

لەئەنجامی ئەمەدا بڕیاردرا نوێنەری هیوا لەگەڵ (اکرم جمیل پاشا) و (عبدالرحمن علی یونس ئاغا) کە نوێنەری خۆیبوون بوون یەکتری ببینن، بەڵام بەهۆی دەستپێکردنی شەڕی جیهانەوەبارودۆخی ناوچەکە ئاڵۆز بووبوو، لەو کاتەدا لەو شوێنەی دەستنیشانکرابوو نوێنەری هیوا نەیتوانیبوو نوێنەری خۆیبوون ببینێتو مامۆستا رفیق حیلمی ڕۆژی (١٩٤٤/٢/٩) نامەیەکی ناردبوو بۆ قدری جمیل بەگ (زنار سبوپی)و هۆی ئەو یەکتری نەبینینەی تیا ڕونکردبووەو داوای کردبوو (ئەسکەندەر بەگ)ی نوێنەری خۆیبوون بچێتە سەر سنوور (دیارە مەبەست سوریاو عێراقە)و لەڕێگەی (ئیبراهیم عزیز بەگ)ی نێردراوی هیواوە چاوی بە ئەسکەندەر بەگ

بکەوێت و نامەی هیوای بۆ بنێرن و بارودۆخی باشوری کوردستانی بۆ ڕوون بکەنەوەو کارێکی وا بکرێت پێوەندییەکی هەمیشەیی لەنێوان هەردوولادا بکرێت.

ئەوەی شایانی باسە، قدری جمیل بەگ لەلاپەڕە (٢١٣)ی کتێبەکەیدا بەدووردرێژ باسی نیشتمانپەروەرێتی و تواناو لێهاتوویی مامۆستا رفیق حلمی کردووە، دەربارەی (ئەسکەندەر بەگ)یش زنار سلوپی وتوویەتی ئەسکەندەر بەگ ئەندامێکی چالاکی خۆیبوون بووەو ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەدامەزراندنی کۆمەڵی خۆیبووونداو بەرلەوەی ببێت بەئەندامی خۆیبوون، لەدوای شەڕەکەی شێخ سەعیدی پیران ئەندامی (حزبی شعبی کورد) بوە.

بێجگە لەو چالاکیەی خۆیبوون لەگەڵ حزبی هیوادا لەباشووری کوردستان، دوای ئەوەی کۆماری مهاباد لەکوردستان دامەزرا قدری جمیل بەگ پاشای دیاربکری کە نوێنەری خۆیبوون بوو چووە مهابادو وەکو نوێنەری ئەو کۆمەڵە هاوکاریی کردووە لەگەڵ کاربەدەستانی کۆماری کوردستاندا لەمهابادو وێنەیەکی قدری جمیل پاشا لەگەڵ قازی محمدی سەرۆکی کۆماری کوردستان لەمهاباد لەلاپەڕە (٣٢٢)ی کتێبەکەی قدری جمیل پاشا/ زنار سلوپی) بلاوکراوەتەوە.

## بەشی دووهەم

# شۆڕشی درسیم (١٩٣٦-١٩٣٨)

لەدوای شۆڕشی ئاگریداغ و کاولکردنی سەدان گوندو سووتاندنی هەزاران خانوو وەکاولکردنی رەزوباخ و ئاوارەکردنی دەیان هەزار کوردو دوورخستنەوەیان بۆ ناوچە دوورەکان، ئیتر ڕژێمی تورك بۆ تەواوکردنی ئەو نەخشانەی لەشۆڕشی پیران و ئاگریداغدا بۆیان تەواو نەکرابوو، بڕیاریدا ناوچەی درسیمیش وەکو ناوچەکانی پیران و ئارارات کاول بکات و دانیشتوەکانی بەکۆمەڵ بگوێزێتەوەو لەخاکی نیشتمانی خۆیان دووریان بخاتەوەو بەشێوەیەکی پەرەوازەیی لەناوچە تورك نشینەکانا بەزورەملی نیشتەجێیان بکات بۆئەوەی لەماوەیەکی کەمدا وایان لێ بکات هیچ هەستێکی کوردایەتیان تیادا نەمێنێت و لەبۆتەی رەگەزی تورکدا بتوێنرێنەوە.

لەبەرگی دوهەمدا، لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم باسی ڕاپەڕینێکی ناوچەی درسیم کرا لەریزی زنجیرە ڕاپەڕینەکانی پێش شۆڕشی پیرانداو باسی ئەوە کرا تورکەکان لەماوەیەکی کەمدا توانیبویان ئەو شۆڕشە دامرکێننەوە کە بەداخەوە هەندێ لەسەرکردەکانی ناوچەی درسیم لەو ڕاپەڕینەدا کەمتەرخەمیان کردبوو، بەلای شۆڕشەکەدا نەچوبون، بۆ نمونە

(سەید ڕەزا)ی دەسەڵاتداری ناوچەکە بێلایەن وەستاو لای وابوو حکومەت حسابی ئەو بێ لایەنییەی بۆ دەکات و نەیدەزانی ڕۆژێکیش دێ پەلاماری ئەویش دەداو بەدەردی سەرکردەکانی تری کوردی لێ دەکات و لەڕاستیدا لەدوای دامرکانەوەی شۆڕشی ئاگریداغ نورەش هاتە سەر ئەو, حکومەت بەئاشکرا دوژمنایەتی خۆی بەرامبەر دانیشتوانی ناوچەکە دەربڕی و ساتێك سەید ڕەزا بۆی دەرکەوت حکومەت وازی لێ ناهێنێت و حسابی بێ لایەنیەکەی جارانی بۆ ناکات ئیتر ئەویش ناچاربوو, سەرکردایەتی شۆڕشێکی تری گرتە ئەستۆی خۆی بەڵام تازە کارلەکار ترازابوو, حکومەت خۆی بەهێز کردبوو نەخشەی لەناوبردنی کوردی کێشابوو بۆیە شۆڕشەکەی درسیمیش بەسەرکردایەتی سەید ڕەزا وەکو شۆڕشەکانی تر لەناوبرا.

باسەکانی ئەم بەشەی شۆڕشی درسیم بریتین لەم باسانەی خوارەوە:

باسی یەکەم: هەڵوێست لەباکوری کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و لەناوچەی درسیم بەتایبەتی بەر لەدەستپێکردنی شۆڕش.

باسی دوەم: هۆی دەستپێکردنی شۆڕش و بەشداربوانی شۆڕش و سەرکردەکانی شۆڕشش.

باسی سێهەم: سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕش و ڕووبەڕوو بوونەوەی شۆڕشگێڕەکانی درسیم بەرامبەر بەهێزەکانی حکومەت.

باسی چوارەم: شکانی شۆڕش و سەرەنجامی شۆڕش و سزادان دانیشتوان و ئاوارەکردنیان.

باسی پێنجەم: هەڵسەنگاندنی شۆڕش و کەم و کوورییەکانی.

## باسی یەکەمی

# هەڵوێست لەباکوری کوردستان بەشێوەیەکی گشتیو لەناوچەی درسیم بەتایبەتی بەر لەدەسپێکردنی شۆڕش

دوای ئـەو هـەموو تاوانانـەی تورکـەکان دژی دانیشـتوانی ناوچـەکانی ئاراراتیان کردبوو زۆری پێ نەچوو دەستیانکرد بەهەڕەشـەکردنو سزادانی دانیشـتوانی درسیمو کوردیـان ناچارکرد دووبـارە دەسـت بداتـەوە چـەكو شۆڕشێکی تـر دەسـت پـێ بکاتو گـەلێك سەرچاوە باسـی هەڵوێستی ئـەو ڕۆژانەی ئەو ناوچەیەیانکردووەو لـەم باسـەدا هەوڵئـەدەین کورتەیـەکی ئـەو سەرچـاوانە بخەینـە پـێش چـاو کەباسـی هەڵوێسـتیان کـردووە بەرلەدەستپێکردنی شۆڕش.

دەربـارەی بـاوردۆخی پـێش شـۆڕش، باسـیل نیکـتین لەلاپـەڕە (١٩٣)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٤) ئامـاژەی بۆ باسێکی (مارشـال دابیری) کـردووە کـە لەڕۆژنامـەی (لماتـان)ی ژمـارەی ڕۆژی (١٩٣٠/١٢/١)دا بـڵاوی کردۆتـەوە کـە وتوویـەتی: شۆڕشـی کـورد هێشـتا کۆتـایی پـێ نـەهاتووەو صـلاح الـدین کـوڕی شـێخ سـعید (مەبەسـتی شـێخ سـعیدی پیرانـە) کـەوەختی خـۆی لەدادگایەکی تورکدا زیندانکرابوو کەبەربوو ئەویش چوە پاڵ شۆڕشگێڕانی

درسیم کەخۆیان ئامادەکردبوو بۆ شۆڕش و جەندرمەکانی تورك لەساڵی (١٩٣٣)دا هێرشیان کردە سەر (شێخ فەخری) لەدەوروبەری دیاربکرداو دادگای حکومەتی تورك کە دادگایەکی سوپایی بوو زنجیرەیەك بڕیاری لەساڵی (١٩٣٤)دا دەرکرد بۆ لەسێدارەدان و زیندانکردنی هەمیشەیی چەند کەسێك و لەنێوان ساڵانی (١٩٣٤-١٩٣٧)دا کە حکومەت هەوڵی دابوو دەست بەسەر هەڵوێستدا بگرێت ڕاپەڕینی (اسبارتا) لەساڵی (١٩٣٥)دا بەرپاکرا کە (شیخ البدیع الزمانی کوردی) تیایا بەشدار بووبوو وەلەناوچەی (موش)دا جۆرە یاخیبوونێك ڕوویدا کەیاخی بووەکان بڕیاریاندا هیچ جۆرە باجێك نەدەن بەحکومەت و لەئەنجامی ئەمەدا شۆڕشی درسیم (تونجلی) دەستی پێکرد پاش ئەوەی حکومەت دەستی کردبوو بەدەسدرێژیکردن و کاولکردنی خانووی ئەو دێهاتانەی بەشداری‌یان کردبوو لەو ڕاپەڕین و یاخی بوونەدا.

باسیل نیکتین ئەڵێ: ئەگەر دەتەوێ بەتەواوەتی لەدڕندەیەتی و لەتاوانی تورکەکان بگەیت کتێبی (درسیم کردستان تأریخندە) بخوێنەرەوە (مەبەستی باسیل نیکتین کتێبەکەی نوری درسیمی‌یە کە تێکۆشەرێکی ڕۆشنبیری کوردو هاوکاری سەیدڕەزای سەرکردەی شۆڕشی درسیم بوە وەکو لەدوایدا چەند جارێك باسی دەکرێت).

دەربارەی هەڵوێستی بەرلەدەسپێکردنی شۆڕش، پروفیسۆر حسرتیان ئاماژەی بۆ بەشێك لەو مقالەیە کردوە کە لەرۆژنامەی (Temps)ی ڕۆژی ١٩٣٧/٨/١٨ دا بلاوکراوەتەوە کەباسی هەڵوێستی ئەو ڕۆژانەی بەم شێوەیەی خوارەوە کردووە:

((هەتا ئێستا نەتوانراوە عەشایرەکانی کورد لەبۆتەی ڕەگەزی تورکدا بتوێنرێتەوە چونکە کێشەکە ئێجگار ئاڵۆزەو ژمارەی ئەوانەی حکومەتی تورك بەتاوانباریان دادەنێت زۆرن ئەمە ماوەی دوو ساڵە حکومەتی تورکیا یاسایەکی بێ سنووری دەرکردووە کە بەپێی ئەو یاسایە دەسەڵاتێکی زۆرو فراوان دراوە بەوالیەکی سوپایی کە (عبدالله ئالب دوغان)ە، بۆ ئەوەی بتوانێت هەموو دەسەڵاتی خۆی بەکاربێنێت بۆ دابینکردنی ئاسایش لەناوچەکەداو ماوەی ئەوەی پێ دراوە هەموو جۆرە ڕێگەیەك بەکاربێنێت بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە، بەڵام لەوساوە هێشتا دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حکومەت هیچ شتێکیان بڵاونەکردۆتەوە، هەرچەند ئەو هەنگاوانەی حکومەت نابوی بۆسەرگرتنی نەخشەکەی هەتا ڕادەیەك کاری خۆیانکردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەتوانراوە کورد بێدەنگ بکاتو ئەو ترسو لەرزەی خرابووە دڵی دانیشتوانی (العزین)ەوە بۆ ترساندنیان ئەگەرچی لەسەرەتادا کاری خۆی کردبوو، بەڵام هەتاسەر ئەو ترسە درێژەی نەکێشا.

لەساڵی (١٩٣٤)دا حکومەت بڕیاریدا کارێکیوا بکرێت هەموو عەشیرەتەکانی ناوچەی درسیم بخرێنە ژێر کۆنترۆڵەوەو لەسەرەتادا بەزەبری پۆلیسو جەندرمەو پروپاگەندەو بڵاوکراوەکانی ناو ڕۆژنامەکانی تورك لەلایەن زاناو نوسەرانی تورك کە بڵاویان دەکردەوە کەوا کوردە زازاکانی (درسیم) بەڕەگەز دەچنەوە سەر ئەو تورکانەی لەدێرزەماندا لەدەشتەکانەوە ڕوویان کردۆتە چیاکانو بەمە لەچاو تورکەکانی تردا لەباری زمانو ڕۆشنبیرییەوە جیابوونەوەو دواکەوتوون، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەمانە هەموویان بەپەرۆشنو

بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هەوڵئەدەن بچنەوە ڕیزی براهاووڵاتیەکانی خۆیانو لەگەڵیانا ببنەوە بەیەك)).

حسرتیان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ موسوعەیەکی تورکی کردووە (موسوعە الحیاە) مجلدی حەوتەم، چاپی ئەستەمبول ساڵی ١٩٣٢ کە لەلاپەڕە (٢٩٩٦)دا ووتراوە لەیەکێك لەو بنکانەی بۆ کورد تەرخانکراوە (دیارە بنکەی ئاوارەکان) بووە، زۆربەی کوردەکانی کۆماری تورکیا بەزمانی تورکی قسە دەکەنو باری ژیانیشیان هەروەکو تورك وایە لەبەرئەوە ئێمەی کاربەدەستانی حکومەت ئەوانە بەنەتەوەیەکی‌تر ناژمێرین.

حسرتیان لەباسەکەیدا ئەڵێ: حکومەتی تورك بۆ سەرگرتنی ئەو نەخشەیەی بۆ درسیمی ئامادەکردبوو بەمەبەستی دابینکردنی ئاسایش، ویلایەتێکی تازەی لە درسیمدا دروستکرد بەناوی (تونجلی)بۆ ئەوەی ناوی درسیم نەمێنێتو هێزێکی حکومەتی تیاداناو بنکەیەکی بۆ دروستکردنو بەزمانی تورکیو کاربەدەستانی حکومەت بڵاویان دەکردەوە کەوا لەبەرئەوەی زازاکان زمانی خۆیان بیرچۆتەوە کە زمانی تورکی‌یە، بۆیە دووبارە فێری زمانەکەی باووباپیرانی خۆیان دەکرێنەوەو بەشێوەیەکی ڕەسمی بەکارهێنانی ووشەی کورد قەدەغەکراو ڕێگەنەدرا بەهیچ کەسێك ئەو ووشەیە بەکاربێنێتو ڕێگەش لەوە گیرا کەجلی کوردی لەبەربکرێتو گۆرانیش بەکوردی یاساغ کراو ڕێگەی لێ گیرا.

سەرچاوەیەکی‌تر کە بریتی‌یە لەگۆڤاری ( the kurds ) سەرچاوە (١) ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٨٢ باسی ئەوەی کردووە چۆن حکومەتی تورك دوای ئەوەی لەپاش تەواوبوونی شەڕی ئاگریداغ دەستیکردبوو بەئاوارەکردنی

کورد بەپێی ئەو یاسایەی لەساڵی (١٩٣٢)دا دەرچووبوو, ئەو کوردانەی ئاوارەکران لەناوچەکان درسیم کە ئیمڕۆ پێی دەوترێت تونجلی, دانیشتوانی ئەو ناوچەیە هەرچەند شوێنەکەیان زۆر گەورە نەبوو بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتوەکانی خۆڕاگربوون و ساتێك سێ فەیلەقی تورك پەلاماری ناوچەکەیاندان توانیان تاساڵی (١٩٣٨) بەرگری لەخۆیان بکەن.

لەکۆتایی باسی شۆڕشی ئاگریداغدا – بەشی سیازدەهەم– بارودۆخی کوردستان دوای شۆڕشی ئاگریداغ باسی ئەو نەخشەو پێشنیازەمان کرد کە (عابد ئۆزمان – عابد عوسمان) ئامادەی کردبوو وەکو پرۆگرامێك بۆ حکومەت بۆ ئەوەی ڕێگە لەبزوتنەوەی کورد بگرێت جارێکیتر سەرهەڵنەداتەوەو حکومەت بۆ بەجێهێنانی ئەو نەخشەیە چەند یاسایەکی دەرکرد کە لەو باسەدا ئامارەیان بۆ کراوەو ئەوی مابوەوە لەو نەخشەیە لەناوچەی درسیم و لەشۆڕشی درسیمدا بەکارهێنرا.

دەربارەی هەڵوێستی حوکمەتی تورك بۆ بەجێ هێنانی ئەو نەخشەیەو ئەو پێشنیارانەی لەناوچەی درسیمدا, دوکتۆر عەزیز شەمزینی لەلاپەڕە (٩٥)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤١) بەم شێوەیە باسیکردووە:

لەساڵی (١٩٣٥)دا تورکەکان بۆ تەواوکردنی سیاسەتی بەزۆر کردنی کورد بەتورك ڕویانکردە ناوچەی درسیم و بۆ سەرگرتنی مەبەستەکانیان پێویستییان بەڕاگەیاندنێکی تیوری و لەشکرکێشی هەبوو, لەو ڕووەوە ڕۆژنامەی (تان) لەژمارەی ڕۆژی (١٩٣٤/٨/١٨)دا ئامارەی بۆ ئەوە کردووە کە وتوویەتی:

(مەسـەلەی بـەتورك كردنـی خێڵـەكانی كـورد هێشـتا لـەقۆناغی سـەرەتاییدایە بەتایبـەتی پـاش ئـەوەی هەنـدێلا خـەریكی دەسـتتێوەردانن لەكاروباردا كەبەمە كێشەكە هەتا ڕادەیەك ئاڵۆزیی تێ كەوتووە.

نزیكـی دوو سـاڵ لەمەوبـەر (مەبەسـتی لـەدوای دەركردنـی ئـەو یاسایەی لەسـاڵی ١٩٣٢ دا دەركـرا كەلـەكۆتایی باسـی ئاگریداغـدا باسمـانكردووە) سیسـتەمێكی تایبـەتی هێنرایـە كایـەوە كـە بەپێی ئـەوە تێكـڕای دەسـەڵات هـەمووی درا بەفەرمانـدەی سـوپا كـە(عبـدالله ئالـب دوغـان) بـوو, بـەنیازی ئەوەی ئاسایش‌و هێمنی لـەو ناوچانەدا بەرپابێت كـە حكومـەت مەبەسـتی بووە)).

دوكتۆر عزیز شمزینی لەكتێبەكەیدا ئاماژەی بۆ بەشێك لەڕاپۆرتەكەی – یا پێشنیازەكەی– عابدین ئوزمـان كـردووە (بەداخـەوە باسی سەرچاوەكەی نـەكردووە) كەوتوویـەتی ئـەو ڕاپۆرتـە بریتـی بـوە لـە(٢٣) لاپـەڕە كـە بـەناوی (مفتشیەتی گشتی ژمارە(١), مەكتەبی تایبەتی)یەوە ناردوێتی بۆ وەزارەتی نـاوخۆی توركیا كـە وەكـو دوكتـۆر شمزینـی باسیكردووە كورتـەو پوختـەی ئەو ڕاپۆرتە بەم جۆرە بووە:

((ئەم ڕاپۆرتە ڕاپۆرتێكی تایبەتە بەچۆنێتی داڕشتن‌و دەستنیشـانكردنی سیاسەتی كاروبـاری نـاوخۆی ویلایەتـەكانی سەر بەناوچەی موفەتیشیەتی گشـتی یەكـەم (واتـە ویلایەتـەكانی بـدلیس, دیـاربكر, وان, هـەكاری, مـوش, مـاردین, ئورفـە, سیرت (سـعرت) كـە سـەیر ئەوەیـە ناوچـەی درسـیم لـەناو چوارچێوەی ئەم موفەتیشیەتەدا ناوی نەهاتووە).

ڕاپۆرتەکـە دەڵێـت: مەبەسـت لەڕاپۆرتەکـە دەسـتەبەرکردنی مانـەوەی ناوچـەکە وەك بەشـێکی جیانـەکراوە لەنیشـتمانی تـورك, بەتایبـەتی ئـەم ناوچەیە زۆر دەوڵەمەندە بەسامانی سروشتی.

ڕوداوەکەی شێخ سعید زادەی بیروباوەڕی کوردایەتی بوو (دان نانی ئەم ڕێبـەرو لێپرسـراوەی تـورك بەڕاسـتیی شۆڕشـەکەی شـێخ سـعیددا کـە وتوویـەتی شۆڕشـێکی ناسیونالسـتی بـووە هـەموو درۆو دەلەسـەکانی کاربەدەسـتانی تـورك‌و ڕۆژنامـەکانیان بـەدرۆ دەخاتـەوە کـە هەمیشـە ویستبویان ئـەو شۆڕشـە بەیاخی بـوونێکی کۆنەپەرستانە لەقەڵـەم بـدەن). هەروەها ئەو ڕاپەڕینەی تر کە بەسەرکردایەتی چەند کەسێك لەناو چیاکاندا هەڵگیرسـا وەك جولاٚنەوەکـەی (حـاجۆ)و ئـەوەی دانیشـتوانی (ساسـون)و ڕاپەڕینەکـــەی (ئاگریـــداغ), ئەمانـــە هـــەموویان بەهـــەمان بیروبـــاوەڕ زاخـاودرابوون‌و ئەوانـەی پڕوپاگەنـدە بـۆ ڕوداوەکـانی (زیـلان) پڕوپاگەنـدە دەکـەن ئـەوانیش هـەر بەهـەمان شـت پشـت ئەسـتور بوون وچەتەکانی (علـی جـان), (سـەید خـان)و دەسـت‌و پێوەنـدەکانیان کەلـە (٨٠ – ١٠٠) چـەکدار پێکهـاتبوون, هـەروەها بزوتنەوەکـەی (محمـد یـونس)و عبـدالرحمنی کـوڕی لە(ملکان) کە ئیمڕۆ خراوەتە سەر ناوچەی قەدەغـەکراوی (ساسـون) ئەمانـە هـەموویان زادەی بیروبـاوەڕی کوردایـەتی‌و چـەنەبازی‌و دەم درێـژی بـۆ مەبەستی وەدەسهێنانی ئۆتۆنۆمی بەتایبـەتی نـاوبراو (کـە مەبەسـتی محمـد یونسە) بەهـەڵس‌و کـەوتیا وەکـو مامۆستایەکی ژێـر دێتـە بەرچـاو, کەسـانی تریش وەکو (فەرزنـدەی حەسـەن نلـی حـەدۆ, یـادۆ, علـی خـان, سـەید خـان, عـزەت موسـی, جبرانلـی خالـد, حەسـنالدی خالـد, بدلیسـی, زیـا و (مەبەسـت

یوسف ضیاء بەگە) واحسان نوری پاشاو هیتر، هەروەها زیندوەکان و هەم مردووەکان هەموویان بەپاڵەوان و تێکۆشەری نەتەوەیی دادەنرێن.
ئەبێ دان بەوەدا بنرێت کە پروپاگەندەی دەرەوەی کوردستان لەوپەڕی برەودایە، لەبەرئەوە ئەگەر بەزانیارییە گرنگەکانی دەنگ‌وباسە ڕەسمیەکان و تایبەتەکان پشت ببەستم دەتوانم بەئاسانی بیروبۆچوونەکانی خۆم بسەلمێنم:
چالاکی بدرخانیەکان لەسوریە، پروپاگەندەو ئامۆژگارییەکانی مارکسیزم لینینزم لە (یریڤان – ئەرمەنیای سۆڤێت)، چالاکیەکانی ئەرمەنیەکانی دەرەوەی وڵات و بڕیارەکانی کۆنگرەی کوردی لەیریڤان، ئەمانە هەموویان بەمەبەستی بوژانەوەی گیان و هەستی کوردایەتیە، خورت بون و درێژەپێدان بەو چالاکیانە زیانێکی زۆر دەگەیەنن بەنیشتمانەکەمان.
ئیمرۆ کوردەکان ئەگەرچی بەیارمەتی ئەرمەنیەکان هیچیان بەهیچ نەکردووە، بەڵام بەتەمای ئەوەن لەکاتێکدا دەست بکەن بەڕاپەڕین کە تورکیا سەری لێ شێوابێ و گیروگرفتی ناوخۆو شەڕی دەرەکی تەنگی پێ هەڵچنیبێت.
لەڕاستیدا کوردو ئەرمەنیەکان کە ئیمرۆ لەسوریادا گیرساونەتەوە، ئەگەر بیانەوێ دەتوانن هێزێکی چەکداری دە هەزار کەسی پێکەوەبنێن و کوردەکانی ناوخۆی وڵات ڕاپەڕێنن و لەهەرکاتێکدا تورکیا تووشی تەنگەتاوی و تەنگ و چەڵەمەیەکی سیاسی بوو ئەوسا پەلامار دەدەن و لەگەڵ کوردەکانی ناو وڵاتدا هاریکاری دەکەن.
مەبەستم لەباسکردنی ئەم مەسەلانە بریتییە لەخۆدەربازکردن لەو زیانە ناوخۆیی و دەرەکیانەی بەهۆی مەسەلەی کوردەوە تووشی کۆماری تورکیا

دەبێت‌و مەبەستم دەستنیشانکردنی ئەو هەنگاونان‌و کارانەیە کە پێویستە بنرێن‌و بکرێن بۆ سەرکوتکردنی جولانەوەکە کە دەبوایە ئەم کارە زوو بکرایەو نەخرایەتە ئیمڕۆ.

بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانمان ئایا پێویستە کام ڕێگا بگرینەبەر؟؟ ئایا پێویستە ئەو ناوچەیەی لە(١٦) پارێزگا - ویلایەت- کەکوردنشینن، کەبەڕاستی ئەو شوێنانە لەجوانی دیمەن‌و سامانی زۆردا بەهەشتێکن بۆ خۆیان، ئایا دەبێ ئەو شوێنانە بەشێکی جیانەکراوەی تورکیا دابنرێن‌و دانیشتوە کوردەکەی بۆ یەکجاری بکرێن بەتورك یاخود ئەبێ درێژە بەو ڕێو شوێنە بدەین کەچەند ساڵێکە پێڕەوی دەکرێ‌و کارگەیشتووە بەوەی ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتی هەمیشەیی‌و چاودێری حکومەت‌و هێزەکانی دەوڵەتدا بێ؟

لێرەدا پێویستە ڕێز لەگەورە پیاوانی ناوچەکە بگرین، بەپارەو دیاری، فریوبدرێن‌و چاویان تێربکرێت‌و جۆرە ئارامیەك بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنرێت‌و هەر بەزم‌و کێشەیەکیش لەدواییدا ڕوویدا پێویستە هەنگاو بەهەنگاو چارەسەر بکرێت.

بەبڕوای من، ئەگەر هەل‌ومەرجی ناوخۆو دەرەوەی وڵات لەبەرژەوەندیی خۆمانابێ، پێویستە ڕێگای یەکەم هەڵبژێرین بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی لەدەرەوەی سنوری ڕۆژهەڵات‌و باشوردا بۆ مەسەلەی کورد کار دەکەن (مەبەستی کوردستانی ئێران‌و عێراقە) دەبێ لەوە تێبگەن‌و بێنە سەر ئەو باوەڕەی لەناوخۆی وڵاتدا کەس نییە لەزمانیان بگات یا هاوهەستی ئەوان بێت، بۆسەرگرتن‌و بەجێهێنانی ئەم مەبەستانەش چەند ڕێگایەك هەیەو پێویستە لەچەندین لاوە بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك بۆ مەسەلەکە بچین:

أ- پێویسته تورکه کۆچەرەکان لەهەردوو لای ڕێگەوبانی سەرزەمینیو هێڵی شەمەندەفەری دەریاچەی (وان)و پێدەشتەکانی (موش)و شارۆچکەکانی (بولانق)و (ملازکرد)ی پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات هەموویان نیشتەجێ بکرێنو بۆ بەجێهێنانی ئەم مەبەستە پێویستە پرۆژەیەکی چەند ساڵی بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو شوێنانە دابڕێژرێو دابەشکردنی زەوی بەسەر کۆچەریەکاناو دەست بکرێت بەدروستکردنو ئاوەدانکردنەوەی دێهات لەو ناوچانەدا.

بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ڕۆژانەی ئەو شوێنانە پێویستە تاقمێك کارگێڕی هەمیشەیی دیاری بکرێ لەشارەزایانی پزیشك, ئەندازیار, وەستاو شارەزای تکنیكو ئەگەر هەموو ساڵێك (٣-٥) دێهاتی تورك نشینی سەد خێزانی بەبەردەوام ئامادەبکرێت پێم وایە کارەکەمان زۆر سەرکەوتوو ئەبێتو ئەو دێهاتانەو مەسەلەی بەتورك کردنو تواندنەوەی گەلێکی دواکەوتووی نەخوێندەوار (مەبەستی کوردە) لەبۆتەی گەلێکی ڕوناکبیری پێشکەوتوودا ئاسانتر دەکات, ئەگینا کوردێکی شاخەوانی لەش ساغو تەڕپۆش بەکابرایەکی ئاوارەو دەستکورت ناکرێت بەتورك لەبوتەی تورکدا ناتوێنرێتەوە, بەتایبەتی هەموو جلو بەرەشڕو دادڕاوی ئەو کابرایە لەدەرپێیەکی سپیو کراسێکی شین بەولاوە هیچیتر نییە..

کابرایەك نەخۆشی مەلاریای تێ ورووژابێ, لەخانویەکی کۆندا بژی, لەبرسانا هەڵتروشکابێ, نەخۆشی هەراسانی کردبێت (مەبەستی تورکە ئەگەر حکومەت فەرامۆشی بکات)و هەمیشە خەریکی ئەوە بێ لەڕێگەی دادگاوە ببێت بەخاوەن زەویو زاری خۆی ئەو کابرایە چۆن دەتوانێت

بەئاسانی ئەو کوردە شاخاوییە لەش و مێشك ساغە لەبۆتەی تورکدا بتوێنیتەوە؟!

ب- پرۆژەی فێرکردنی زمان:

ئەوانەی دەمانەوێ بیان توێنینەوەو لەزانکۆکانی تورکیادا پەروەردەیان بکەین پێویستە وایان لێ بکەین لەجیاتی زمانی کورد بەزمانی تورکی بدوێن کە ئەمە کارێکی زۆر گرنگە لەبەرئەوە پێویستە بەر لەهەموو شتێك منداڵەکانیان لەباوك و دایکەکانیان دووربخەینەوەو لەفێرگەی شەوی تایبەتدا (وەکو شوێنی هەتیوخانەکان) کۆبکرێنەوەو بۆ شوێنی خەوتنیان قەرەوێڵەیان لەداروتەختەی ساکار بۆ دروست بکەین و مامۆستای لێوەشاوە کارامەو بەتواناو باشیان بۆ تەرخان بکەین کە فێرگەکانیان ببەن بەرێوە بۆ ئەوەی ئەو منالآنە بەگیان و هەستی تورکیزم پەروەردەو گۆش بکرێن و پێویستە لەسەر دەوڵەت دام و دەزگای پێویست بۆ ئەو مەبەستە ئامادەبکات و پێویستە زمانی تورکی بکرێت بەتاکە زمانی ئاخافتن لەناو ئەو فێرگانەدا.

شان بەشانی ئەمە دەبێ بەرنامەی تایبەت بەپرۆپاگاندەی تورکیستی و ڕێزگرتن لەگەورە پیاوانی تورك ئامادەبکرێت چونکە بەو جۆرە پرۆپاگاندانە دەتوانرێ گەورەپیاوانی تورك لای ئەو منالآنە خۆشەویست بکرێن و ماوەی ئەم پرۆژەیە سێ ساڵ بخایەنێت بەمەرجێك هەموو منالێك هەر ساڵەی (١٠ - ١١) مانگ لەخوێندندا بێت و پاش ئەو ماوەیە یاسایەکی تایبەتی دەربکرێت بۆ ئەوەی مەسەلەی تواندنەوە وەك کاری کۆمیسیونەکانی لێ بێت.

ج- پرۆژەی تواندنەوە:

پێم وایە پرۆژەی تواندنەوە لەسێ ڕشەدا جێبەجێ بکرێت.

١- ڕشەی ئابووری

٢- ڕشەی تەندروستیو کۆمەلآیەتی

٣- ڕشەی فەرهەنگی

**یەکەم: کارتێکردنی ئابووری:**

پێویستە دەسەلآتی ئابووری تەنها بۆ ئەو کەسانە بسەلمێنرێت کە بە یەکجاری وازیان لەکوردایەتی هێناوەو پێویستە لەڕێگەی ئەنجومەنی میللییەوە (دوکتۆر شمزینی لە وەرگێڕانەکەیدا بۆ کوردی بەخانەی گەل ناوی هێناوە) بازرگانەکان فێربکرێن چۆن کاسبی بۆ خۆیان بکەنو چۆن لەگەڵ کوردەکانا هەڵسوکەوت بکەنو لەگەڵ کوردە شاخاویەکانا پێویستە بەتورکی بدوێنو پێویستە وا لەکورد بکرێت چۆن دەوڵەتی خۆش بوێتو لێرەدا نابێ ڕێگە بەهیچ بازرگانێکی گەرۆك بدرێت لەخۆیەوە لەگوندێکەوە بچێت بۆ گوندێکیتر، چونکە ئەو بازرگانە گەڕۆکە (چەرچی) کە هەموو جۆرە کالآیەکی وەکو ڕۆنو هێلکە دەگۆڕێتەوە وەیا بەنرخێکی هەرزانی دەفرۆشێ ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی دێهاتەکان بەیەکەوە ببەسترێنەوەو لەئەنجامی ئەمەدا لەناو خۆیانا بەکوردی دەدوێنو زۆرجاریش بەپڕوپاگاندەو بلآوکردنەوەی دەنگوباس والەگوندنشینەکان دەکەن لەشاروشارۆچکەکان دووربکەونەوە.

بۆ زۆرتر چەسپاندنی دەسەلآتی مەڵبەندە ئابوریە ناوبراوەکانیش ئەبێ بۆ فەرمانبەرە کشتۆکاڵیەکانو بۆ پزیشکەکان چەند ولآخێك تەرخان بکرێن

بۆ ئەوەی هەمیشە بەناو دێهاتەکانا بگەڕێن و پەیوەندی بەلادێییەکانیشەوە بکەن و بەتێکەڵاوبوون و ئاخافتن بەزمانی تورکی پێویستە لەگەڵ ئەمەدا پروپاگاندەی پێویست بڵاوبکرێتەوە.

**دوهەم: کارتێکردنی تەندروستیو کۆمەڵایەتی.**

بۆ ئەوەی کارتێکردنی تەندروستیو کۆمەڵایەتی ئەو ئەنجامەی هەبێت کەخۆمان دەمانەوێت سەربگرێت، پێویستە لێپرسراوانی شارۆچکەکان بەسواری وڵاخ بەناو دێهاتەکانا بگەڕێن و پێوەندی بەدێهاتەکانەوە بکەن و تورك و کوردو قزلباش و علی ئیلاهیەکان هان بدەن ژنی یەکتر بخوازن و سەرلەیەکتری بدەن و ئەو فەرمانبەرو سەربازانەی لەڕۆژ ئاواوە ڕەوانەی ناوچە کوردنشینەکان کراون هەموویان هان بدرێن ژنانی کورد بخوازن و بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دەوڵەت زەویو زاریان بەسەردا دابەش بکات بۆ ئەوەی لەو ناوچانەدا جێگیر بن.

ڕاپۆرتەکەی عابد ئوزمان لەسەری دەڕواو دەڵێ:

بەر لەهەموو شتێك پێویستە بەهیچ شێوەیەك ماوە بەڕوناکبیران و فەرمانبەران و کارگوزارانی دەوڵەت نەدرێت بەزمانی کوردی بدوێن بەتایبەتی لەکاتی کارکردنداو تەنانەت نابێ فەرمانبەر لەگەڵ کارخوازە لادێییەکانیشدا کە فریان بەسەر زمانی تورکیەوە نییە لەگەڵیانا بەزمانی کوردی بدوێن و ئەو فەرمانبەرەی بەکوردی بدوێ دەبێ هەر لەسەرەتاوە ئاگاداربکرێن کەنابێ لەکاتی کارکردندا زمانی کوردی بەکاربێنێت و ئەگەر دوبارەشی کردەوە پێویستە وردە وردە مووچەکەی لێ ببڕێت و لەدواییدا مەسەلەکە بوو بەشتێکی ئاساییو هەر فەرمانبەرێك زمانی کوردیی بەکارهێنا پێویستە لەسەر کار لاببرێت و ئەبێ هەموو لێپرسراوێکی دەزگای

حکومەت و هەموو ئەفسەرێکی ئاسایش و پۆلیس لەبەجیٚهێنانی ئەم ئەرکە خۆی بەبەرپرسیار بزانێت.

عابدین ئوزمان لەسەری ئەرواو دەڵێت:

پێش ئەوەی کۆتایی بەمەسەلەی تواندنەوە بهێنم بەپێویستی دەزانم سەرنج بۆ چەند مەسەلەیەکی گرنگ ڕاکێشم کە بریتیە لە:

ئەو کوردانەی لایان وایە هەڵوێست و ڕوفتاری نەرمی دەوڵەت زادەی سۆزو بەزەیی نییە بەڵکو زادەی ئەو کردەوانەیە کە خۆیان ئەنجامیان داوە, هەروەها ئەوانەی دێهاتەکانیان کەوتۆتە سنووری ئەو ناوچە قەدەغەکراوانەی کە کاتی خۆی بەرهەڵستی دەوڵەتیان کردووەو بەپروپاگەندەکانی دەرەوەی وڵات خۆیان کردووە بەوابەستە, ئەمانە هەموویان یەك بابەتن و هەموویان ئێجگار زیانبەخشن و لەسەرێکی ترەوە زۆر گرانە بۆ ئێمە بیان توێنینەوە, لەبەرئەوە پێویستە یەکەیەکە ئەوانە دەستنیشان بکرێن و لەدوایدا دەرپەڕێنرێن, ئیمڕۆ کەس نازانێت ژمارەی ئەو جۆرە کەسانە چەندە, بەڵام ئەم ساڵ دەوڵەت بەژێرزارەکی بڕیاریداوە نزیکەی سیٚهەزار کەسیان لەناوچەکانی ڕۆژئاوادا نیشتەجیٚ بکات و بەپێی بەرنامەیەکی ڕێك‌وپێك لەماوەی (١٥–٢٠)ساڵدا ئەوانەی ناتوێنرێنەوە بەیەکجاری لەناودەبرێن و ئەوانەی دەمێننەوە بەیەکجاری بەفەرهەنگی تورکی گۆش دەکرێن و بەبیٚ بەجێهێنانی ئەمانەی خوارەوە مەسەلەی توانەوە سەرناگرێت.

أ– لەپرۆژەی تواندنەوەدا پێویستە:ـ

١– پێویستە بایەخ و گرنگی‌یەکی تەواو بدرێت بەئەنجومەنی میللی.

٢- بۆ خوێندنەوەی هەواڵی ناو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان پێویستە پەرتوکخانەی تایبەتی دابین بکرێت.

٣- بۆ ناساندنی شوێنەواری کۆنی تورك مۆزەخانەو پێشانگەی تایبەتی دامەزرێنرێت، تیپی گەڕۆکی گۆرانی بنێررێت بۆ دێهاتەکانو سینەماو ئیستگە دامەزرێنرێت کە ئەمانە هەمووی ئەنجامی باشیان ئەبێت.

لەدوای ئەوەی بۆچونی خۆمم بەکورتی دەربڕی دەربارەی چۆنێتی تواندنەوەی بەزۆرە ملی بەپێویستی دەزانم باسی ئەو مەسەلانەش بکەمکەبەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بەسەرگرتنی ئەو مەسەلەیەوە هەیە.

خاڵی یەکەم: بۆ لەناوبردنی کوردایەتی، یا بۆ بەجێهێنانی دامەزراندنی دەزگایەکی کارگێڕی توندوتۆڵ لەناوچە کوردنشینەکانا، پێویستە ڕێگەوبانی تازە هەبێتو ئەو ڕێگاوبانانەی من بەپێویستی دەزانم چاك بکرێن بریتین لە:

ا-ڕێگای دیابکر – سیلوان – ملکان – زیارەت – بتلس – رتاتوان.

ب-ڕێگای زیارەت- سیرت – هەکاری – بەرواری – جەناق – وان.

ج-ڕێگەی وان – باشقەلاّ – هەکاری – بەرواری.

د-ڕێگای ماردین – ساوور – میدیان – کەرجۆش – سیرت.

ئەگەر ئەو ڕێگاوبانانە بەناوچەی دەسەلاّتی موفەتیشیەتی گشتی ژمارە (١)دا (کە عابدین ئوسمان خۆی موفەتیشی گشتی ژمارە (١) بووە). ئەوا ئەو موفەتیشیەتە کەمتەرخەمی ناکاو بەهەموو شێوەیەك یارمەتی کاربەدەستان ئەدات.

بێگومان بەچاککردنی ئەو ڕێگاوبانانە ناوچەکە هەم لەڕووی مادی‌و هەم لەڕووی زارەکی‌یەوە (مەبەست سەپاندنی زمانی تورکی بەسەر کوردنا) گەشەدەکات‌و بەخورتی‌و بەڕێك‌وپێكی دەبەسترێتەوە بەدایکی نیشتمانەوە (کەمەبەست تورکیایە).

ئەو کوردانەی لەبۆتەی فەرهەنگی تورکدا ناتوێنەوەو هەزاران پروپاگەندەی کوردایەتی کاریان تێ دەکات, بەپێویستی دەزانم بخرێنە گروپی کارەوەو لەکاتی کردنەوەی ئەو ڕێگەوبانە تازانەدا کەڵکیان لێ وەربگیرێت‌و لەهەمان کاتدا دەبێ فێری زمانی تورکیش بکرێن‌و هەوڵی تواندنەوەیان بدرێت‌و نابێ هیچ چاوپۆشی‌یەکیان لێ بکرێت.

خاڵی دوهەم: پەیوەندی بەکوردەوە نەبوە

خاڵی سێهەم بەجێ بەجێکردنی پێشنیازەکانی ناو ڕاپۆرتەکەم گەلی تورك بەختەوەر دەبێت‌و تورکیا بەرەو پێشەوە دەبات.

ئەم ڕاپۆرتەم دەخەمە بەردەمی بەڕێوەبەری دەوڵەتی مەزن (عصمت ئینونو) کەبۆ وەدەسهێنانی شادمانی‌و بەختەوەری گەلی تورك لەسەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی تری دەبات‌و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تورکیا بەرەو پێشەوە دەڕوات.

من لەکاتێکدا ئەم ڕاپۆرتەم پێشکەش دەکەم, چارەسەرکردنی یەکێك لەگیروگرفتەکانی وڵاتەکەمان بەئەرکی سەرشانی خۆم دادەنێم بۆ ئەوەی دەربارەی ئەوە بڕیارو ئامۆژگاری پێویست دەربکرێت.

امزا/ موفەتیشی گشتی ناوچەی ژمارە (١)

ئابدین ئوزمان

(عابدین عوسمان)

دەربارەی ئەو ڕاپۆرتەی ئابدین ئوزمان کە دوکتۆر شمزینی دیارە باسی پێشەکیەکەی ئەو ڕاپۆرتەی کردووەو کورتەیەکی لێ وەرگرتووە کە ژمارەی لاپەڕەکانی ئەو ڕاپۆرتە (٢٣) لاپەڕە بووە, بەلاَم زنار سلوپی (قدری جمیل بەگ دیاربکری) لەلاپەڕە (١٦٠)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٥٧) بەدوورودرێژ باسی ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتەی کردووەو ڕەخنەی لەکەموکوورییەکانی ئەو زانیاریو ژمارانەی گرتووە کە ڕاپۆرتەکە ئاماژەی کردووەو وتوویەتی:

((ئەو زانیارییانەی هەتا ساڵی (١٩٢٤) لەدائیرەی قائیمقامیتی (بیلیجیك) داو لەدەزگاکانی تری ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاَتدا هەلْگیرابوون لەگەلْ ئەو سەرژمێرییەی لەساڵی (١٩٢٧)دا کرابوو پڕبوون لەهەلْەی ئاشکراو ژمارەی کورد دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیە بووە کە لەو ڕاپۆرتەدا (مەبەست ئەوەی ئابدین ئوزمانە) ئاماژەی بۆ کردووەو هۆی ئەمەش بریتییە لەوەی ژمارەیەکی زۆری کورد نەخرابووە ناو ئەو سەرژمێرییە کە مەبەستیش لەکەمکردنەوەی ژمارەی کورد ئەوە بووە ئەو سەرژمێرییەی پێ پینە بکرێت کە لەدوایدا لەساڵی (١٩٣٥)دا کرابوو.

بەپێی ڕاپۆرتەکەی ئابدین ئوزمان کوردی کردووە بەدوو بەشەوە.

**بەشی یەکەم:** ئەو تورکانەی بوبوون بەکورد (کە وتراوە ئەمانە هەموویان بەڕەگەز تورك بوون بەلاَم لەدواییدا بوبونەوە بەتورك وەکو زۆرجار لەباسو ڕۆژنامە تورکیەکانا بلاَویان کردۆتەوە).

**بەشی دوهەم:** ئەو کوردانەی نازانرێت چۆنو لە چ کاتێکدا بوون بەکورد.

بەپێی ئەو ڕاپۆرتە کە وتوویەتی. ژمارەی کورد لەو ناوچانەدا (١,٢٦٧,٥٧٣) کەس بوون بەلاَم تائێستە نەتوانراوە لەناو ئەم ژمارەیەدا

بەشی یەکەمو دوهەم لێك جیابکرێتەوە, تەنها ئەوەی ڕوون بۆتەوە ئەوەیە دانیشتوانی کورد پترن لەنیوەی دانیشتوانی ناوچەکە کە ئەمە ڕاستی‌یە لەڕووی ڕەنی گشتی جیهانی‌یەوە زیانێکی زۆری هەیە بۆ بەرژەوەندێتی ولآتەکەمان (زنارسلوپی لەپەراوێزی لاپەڕە (١٦١)ی کتێبەکەیدا وتوویەتی بەپێی سەرژمێری ڕەسمی لەساڵی (١٩٦٥)دا دانیشتوانی تورکیا بریتی بووە لە (٣١,٣٩١,٢٠٧)و ئەوانەی بەزمانی کوردی قسەیان کردووە ژمارەیان (٢,٣٢٥,٧٧٨)کەس تۆمارکراوە (بێگومان کوردێکی زۆریش هەبووە یا نەیانوێراوە بەکوردی قسەبکەنو یالەترسی کاربەدەستانی تورك خۆیان بەکورد دانەناوە لەئەنجامی ئەو هەموو جەورو ستەمەوە کە لەکورد کراوە لەنێوان ساڵانی (١٩٢٤ تا ١٩٦٥) کە تورکەکان خۆیان دانیان بەوەدا ناوە بەزۆر کوردیان لەبۆتەی تورکدا تواندۆتەوە.

بەپێی ڕاپۆرتەکەی ئابدین ئۆزمان کەزنار سلوپی باسیکردووە, عابدین عوسمان وتوویەتی:

(لەڕاستیدا لەناوچەکەدا کوردی تیادا نییە بەڵکو تەنها ئەو تورکانەی تیادایە کە تورك بوونو بوون بە کورد!!).

بەڕاستی شتێکی پڕ لەسەیرو سەمەرەیە کەبوترێ تورکی واهەبووبێت بووبێت بەکورد, لەهەمووشی سەیرتر نە عابدین ئوزمانو نەنووسەرانو ڕۆژنامە تورکیەکان کە هەمیشە ئەو قەوانەیان لێداوەتەوە جارێك لەجاران نەیان وتووە: هۆی چی بوە کە تورك خۆی کردبێت بە کورد! ئایا کورد ڕۆژێك لەڕۆژان دەوڵەتو حکومەتو دەسەلآتێکی ئەوتۆی هەبووە بەزۆر ئەو تورکانە بکات بەکورد وەکو چۆن تورکەکان بەئاشکراو بەزورە ملی کوردیان کردبوو بەتورك!؟!

ئەگەر تورکەکان لەو ڕووەوە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە کەبۆچی تورك بوە بەکورد, بەلام بەپێچەوانەوە کورد بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی بەدەستەوەیە کەچۆن هەندێ لەکوردەکان لەکاتی خۆیدا بوون بەتورك و ئەگەر تورکە ڕۆشنبیرەکان چاوێك بگێڕن بەشرفنامەی شرفخانی بدلیسی دا کە بەئاشکرا وتوویەتی: ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان حەزیانکردووە جنسیەی عوسمانی یان دەستگیربێت و لاشیان وابووە کوردو تورك هەردوولایان موسوڵمانی سوننی مەزهەب بون و لەبەرئەوە پشتاوپشت خۆیان بەتورك تۆمارکردووە.

ئابدین ئوزمان لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونە پڕ لەپێچ و پەنایەی دەربارەی کورد دەری بڕیوە نەیتوانیوە لەڕاستی یەك لابدا کەوتوویەتی:

((هەستی نەتەوایەتی لای کوردەکان ئەوەندە بەهێز بووە کە تورکەکانی دراوسێیان توانای ئەوەیان نەبووە لەناو بۆتەی خۆیانا کوردەکان بتوێننەوە... لای کوردەکان بیروباوەڕی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی بەشێوەیەك بلاوبوبوەوە کە مێشکی کوردەکانی ناوچەکەی پڕکردبوو)).

بێگومان عابدین ئوزمان ئەم ڕاستی یەی بۆیە وابەزەقی و بەئاشکرا باسکردووە لەڕاپۆرتەکەیدا بۆ ئەوەی کاربەدەستانی حکومەتەکەی خۆی ناچاربکاو هانیان بدات بەوپەڕی توندوتیژییەوە خەریکی تواندنەوەی کوردبن لەبۆتەی تورکدا.

زنار سلوپی لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەوەی عابدین عوسمان وتوویەتی کوردەکان تورك بون بەرەگەز بەلام لەماوەیەکدا بون بەکورد بۆیە پێویستە بگەڕێنەوە ڕیزی برا تورکەکان و دەربارەی ئەمە ڕوی دەمی کردۆتە ئابدین ئوزمان و پێی دەڵێت:

((باشە ئەگەر ئەو لای وایە کورد بەرەگەز تورك بوون بۆچی ناچێت سەیری لاپەڕەکانی ناو فایلەکانی دادگاکانی تورك بکات کەچۆن کوردەکان لەبەردەمی دادگاو لەبەردەمی پەتی قەنارەدا ئامادە نەبوون لەکوردایەتی خۆیان لادەن و بەپێچەوانەوە هاواریان دەکرد بژی کوردو کوردستان؟؟

ئەگەر لای وایە ئەوانە تورك بوون ئیتر بۆچی لەشوێنەکانی خۆیان هەڵیان دەکەندن و ئاوارەیان دەکردن بۆ ناوچە تورك نشینەکان؟

زنار سلوپی لەلاپەرە (١٦٧)ی کتێبەکەیدا باسی موئتەمەرەکەی (یریڤان)ی کردووە کە ئابدین ئوزمان وتویەتی ئەو موئتمرە بۆ دژایەتی تورکیا تەرخانکرابوو, ئەوەی ئەو کونفرانسە کۆبونەوەیەکی مێژوویی بورە وەکو زنار سلوپی باسیکردووە, بەپێویستم زانی بڕیارەکانی ئەو کۆبونەوەیە بخەمە پێش چاو.

ا) پاککردنەوەی مێشکی ڕۆشنبیرانی کورد لەکارتێکردنی ڕۆشنبیرێتی تورك.

ب) لێکۆڵینەوە دەربارەی ڕەگەزو مێژوی کورد لەسەر بناغەی بەڵگە مێژووییەکان و ئامادەکردنی نەخشەی کوردستان.

ت) لێکۆڵینەوە بۆ دەستنیشانکردنی پەیوەندی ڕەگەزی نێوان کوردو یزیدی و ئەرمەنی.

ج) یەکخستنی شێوەکانی زمانی کوردی بەنیازی سازکردنی زمانێکی یەککگرتوو,وە خوێندنی دەستوری زمانی کوردی و دانانی قاموسێکی کوردی لەگەڵ ئەبجەدیەتێکی (ئەلف با) تایبەتی بۆ نووسینی کورد.

هەروەکو زنارسلوپی باسیکردووە, وەرامی ئابدین ئوزمان بۆ ئەو برایانەی یریڤان ئەوە بووە وتوویەتی:هەمووی دژی بەرژەوەندیی دەوڵەتی

ئێمەو ئەو دەوڵەتانەشە کە کوردیان تێدا نیشتەجێ بوە (مەبەستی ئێران‌و عێراق‌و سوریا بوە).

زنار سلوپی دەربارەی ئەو راپۆرت‌و پێشنیازەی عابدین ئوزمان بۆ حکومەتی تورکیای ئامادەکردووە وتوویەتی کاشکی ئەو کابرا لێ پرسراوەی تورك دەرسێکی وەربگرتایە لەو وتارەی (ماکنمارا)ی وەزیری بەرگری حکومەتی ئەمریکا لەکاتی مناقەشەکردنی بۆجەی سوپای ئەمریکادا بۆ ساڵی ١٩٦٥ لەکۆنگرێسی ئەمریکادا (لام وایە ئەبوایە بی ووتایە لەدواییدا دەبوو دەرسی وەربگرتایە چونکە ئابدین ئوزمان راپۆرتەکەی لەساڵانی سی‌یەکانا ئامادەکردووە کە هێشتا وتارەکەی (ماکنمارا) نەزانرابوو.

((لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هیچ جۆرە ئاسایشێك بەرپانابێت هەتا ئەم سێ شتەی خوارەوە چارەسەر نەکرێت:

١- ئاشتبوونەوەی دەوڵەتانی عەرەب لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیلدا.

٢- سازکردنی دۆستایەتیەکی باش لەنێوان دەوڵەتە عەرەبیەکان لەناوخۆیانا.

٣- دابینکردنی مافی کەمایەتیەکانی کورد لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

زنار سلوپی لەلاپەرە (١٦٨)ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ سەرنج‌و بۆچونێکی تری عابدین ئوسمان کردووە کە لەڕاپۆرتەکەیدا وتوویەتی:

((لەدەرەوە, نزیکی دە ڕێکخراوی کورد بەناوی جۆربەجۆر هەیە هەموویان هەوڵی دروستبونی دەوڵەتی کوردستانی گەورە ئەدەن‌و داوا لەوڵاتان کراوە یارمەتیان بدەن بۆ گەیشتن بەو مەبەستە, ئەو ڕێکخراوانە

هەرچەندە هەموویان هاوکاری لەگەڵ یەکتر دەکەن بەلأم ئیمڕۆ هێشتا توانای ئەوەیان نیە هیچ سەرکەوتنێك وەدەست بێنن چاوەڕوانی هەل و دەرفەتێکی لەبار دەکەن, بۆیە پێویستە لەسەرمان بەتوندوتیژیو بەشێوەیەکی کاریگەرانە دژی ئەوانە کاربکەین کە لەسوریادا دە هەزار کوردی ئەویّ خۆیانی بۆ ئامادەدەکەن و ئەبێ بەهەمووومان هەوڵی پوچەڵکردنی ئەو تەقەلایە بدەین)).

زنار سلوپی لەلاپەڕە (١٦٩)دا لەسەری دەڕوات و دەڵێت:

((عابدین ئوسمان پێشنیاری ئەوەی کردووە کە ئەو ملیۆنە کوردەی لەناوچەی موفەتیشیەتی یەکەمدا دەژین(ئەم بەشە لەژێر دەستەڵاتی ئایدین ئۆزمان دابوە)کە شوێنەکەیان هەروەکو بەهەشت وایە لەناو خاکی نیشتمانی تورکدا, ڕێگەی ئەوەیان لێ بگیرێت کەنەتوانن هیچ جۆرە جم وجۆڵێك بکەن ئەو جمۆجۆڵە بچوك بێت یاخود گەورەو پێویستە لەوانەی دەرەوەش بگەیەنرێت لەوانەی لەچالاکیدان بۆ نەتەوایەتی کورد کەوا لەو شوێنانەدا کەسێکی وای تیادا نەماوە لەزمانەکەی ئەوان بگات یاخود هەستیان وەکو هەستی ئەوان وابێت)).

لێرەدا ووتەیەکی تۆفیق فکرتی شاعرونووسەری تورك دێتەوەبەرچاو کەکاتی خۆی وتوویەتی((دنیا هەمیشە هەروا تاریك نابێت,چونکە هەمووشەوێك ڕۆژێکی خۆشیشی بەدوادا دێت)).

عابدین لەشوێنێکی تری ڕاپۆرتەکەیدا وتوویەتی:

((بەڵێ,ئەو شەعبە دوا کەوتووەی لەشارستانیەتی دواکەوتووە(مەبەستی کوردە),ئەو تورکانەی هێنراوەتە ناویانەوە, ئەوانەی حکومەت هێناونی هەتا چارەسەری کێشەکانیان نەکرێت و پۆشتەو پەرداخ نەکرێن و

لەنەخۆشیی ملاریای ناوزنجەکان ڕزگاریان نەبێت ئایا چۆن دەتوانن بەئاسانی ئەو کوردە دواکەوتوانە لەناو بۆتەی خۆیانا بتوێننەوە؟؟ ئایا سوودی بوونی ئەو تورکانە چی‌یە لەوناوچانەدا ئەگەر هەل‌ودەرفەتی لەبارو باشیان بۆ نەڕەخسێنرێت‌و ژیانێکی باشیان بۆ دابین نەکرێت‌و چۆن دەتوانن جێگەی ئەو چەند ملیۆن کەسە بگرنەوە کەلەوناوچەوە دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنی تر؟

(لێرەدا عابدین عوسمان بەئاشکرا دانی بەوەدا ناوە کەکوردە گوێزراوەکان چەند ملیۆنێك بوون).

زنار سلۆپی لەلاپەڕە/١٧١ی کتێبەکەیدا باسی عصمت ئینونوی کردوە لەساڵی(١٩٣٥)دا ساتێك چوە بۆ کوردستان‌و لەدەشتاییەکانی دیاربکردا چاوی بەچەند داماوێکی نیشتەجێ بوو کەوتوە(کەدیارە کوردبوون)و بەلووت بەرزییەکەوە لێی پرسیون‌و پێی ووتوون:

((لام وایە لەسایەی خواوە ئێستە ئێوە لەو تورکانەوە کەلەدەوروبەرتانا دەژین فێری هەندێ شت بوون؟ لەوەرامدا گەنجێك پێی دەڵێت:

((بەڵێ جەنابی پاشا, ئێمە بەهۆی ئەوانەوە فێری کوردی بوین...عصمت لەوەرامی ئەمەدا بەگەنجەکە دەڵێت: کوڕم شتێکی زۆر باشە گەر پیاو فێری چەند زمانێك بێت))

ئابدین ئوسمان لەڕاپۆرتەکەیدا داوای لەحکومەت کردوە لەوشوێنانەدا کەکوردی بۆ گوێزراوەتەوە قوتابخانەی تایبەتی بکرێتەوە بۆ فێربوونی زمانی تورکی‌و بەشی داخلی بکرێتەوە بەتایبەتی لەناوچەکانی(کافاشا-لەویلایەتی وان)و لە(بیت الشباب-لەهەکاری)و لە(هێزان-لەبدلیس)و لە(ملازکرد-لە موش)و لە( برناری-لە سیرت)و

له(ئیقڵ شربتی- لەدیاربکر)و لە(دیریك-لە ماردین)و لە(وێرانشهر-لە ئورفە) بۆئەوەی لە ڕێگەی ئەو قوتابخانانەوە بیری کوردایەتی لەمێشکی ئەو مندالأنەدا نەهێڵرێت.

زنار سلۆپی بۆ وەرامی ئەو پێشنیازەی ئابدین ئوسمان وتوویەتی:کاشکی نووسەری ئەو ڕاپۆرتە گەشتەکەی(ئەولیا چلبی)بخوێنیتەوە کەوتوویەتی:

((پلەو ڕادەی زانیاریو خوێندەواری لە شوێنێکی وەکو(بدلیس)دا کەمرکزی ئەمارەتی(ڕۆژەکی)بوە, زۆرباشترو بەرزتر بوە لەهی دانیشتوانی ناوچەکانی تری ناو ئیمپراتۆریتی عوسمانی)).

عابدین ئوسمان لەکۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا دانی بەڕاستیەکدا ناوە کە وتوویەتی:

((لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلایانەی دەدرێت بۆ تواندنەوەی کورد لەناو بۆتەی نەتەوەی تورکدا لەناوچەی ژێر دەسەلأتی حکومەتداو ئەو هەموو هەوڵەی دەدرێت بۆ نەهێشتنی هەستی نەتەوایەتیی کورد لەناو مێشکی ئەوانەدا بەهۆی ئەو کوردانەی ترەوە کە لە شوێنەکانی تردا هەن کەئەو یاسایەیان بەسەردا نەسەپێنراوەو هێشتا هاتو چۆی نێوانیان لەگەڵ یەکتیردا هەرماوەو سەرۆکەکانیان یارمەتیان دەدەن, بەمە دووبارە هەستیان دەبزوێنرێتەوە))

تائێرە بریتی بوو لەباسی ڕاپۆرتەکەی عابدین ئوسمان هەروەکو دوکتور عزیز شمزینیو زنار سلۆپی باسیانکردوەو دەربارەی هەمان ڕاپۆرت(کریس کوچرا)ش لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١کورتەی هەمان ڕاپۆرتی باسیکردوەو وتوویەتی:

((دەوڵەتی تورکیا لەساڵی(١٩٣٢)بەدواوە یاسای پەرەوازەکردنی کوردی دەرکردو لەسەرەتادا بڕیاریدا نابێ هیچ منداڵێك هەرلە منداڵیەوە بەتورکی نەبێت نابێ بەهیچ زمانێکی تر بدوێت و عابدین ئوسمان داوای لەحکومەتەکەی خۆی کردبوو دەستەلاَتێکی تەواو بدرێت بەدادگا تایبەتیەکان بۆئەوەی هەموو عەشیرەتەکانی کورد ناچاربکرێن لەژێر چەتری ئەو یاسایە دا بژین و بۆ سەرگرتنی ئەو مەبەستە هەروەکو(پرۆفیسۆر بیلی)باسی یاسای ساڵی(١٩٣٧)ی کردوە کەچۆن بەپێی ئەم یاسایە هەموو کتێب و چاپەمەنی و بلاَوکراوەیەك بەزمانی تورکی نەبوایە هەمووی قەدەغە کرابوو.

لەو ڕۆژانەدا ڕۆژنامەی(سون تلگراف)کەلە ئەستەمبوڵەوە دەردەچوو ئەگەرچی ئەو ڕۆژنامەیە سەربە حکومەت بوو بەلاَم تەنها لەبەر ئەوەی لەباسێکدا شتێکی بلاَوکردبوەوە کەبەدڵی کاربەدەستانی حکومەت نەبوو ئەو ڕۆژنامەیەش داخرا)).

زنار سلۆپی لەلاپەڕە/١٧٦ی کتێبەکەیدا دەربارەی بارودۆخی ئەو ڕۆژانەو هەڵوێستی حکومەتی تورك بەرامبەر بەکوردو بەجێهێنانی نەخشەی تواندنەوەی کورد لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا وتوویەتی:

((لەگەڵ ئەو هەموو زوڵم و جەورو ستەمو چەوساندنەوەو ناپیاوەتی یەی کاربەدەستانی تورك لەگەڵ کوردا کردبوویان, تورکی واش هەبوە بەویژدان بوەو بەچاوی ڕەگەز پەرستەکانی تورکەوە سەیری کوردی نەکردوەو بۆنمونەی ئەمە ئاماژەی بۆ باسی موفەکیریکی تورك کردوە(بەداخەوە ئاماژەی بۆ ناوەکەی نەکردوە)کەلە ڕۆژنامەی(دوغری یوڵ-ڕێگەی ڕاست)ی

ژمـــاره/٧٤٥ی ڕۆژی(١٧/ئایـــاری/١٩٣٢)دا بلاْوکراوەتـــەوە لـــەژێر ناوی(کوردەکان چی‌یان دەوێ‌و پێویستە چی‌یان بدرێتێ؟)کەوتوویەتی:

((ساڵەمایا تورکیا تووشی سەریەشەو هەڕەشەیەکی گەورە بوە بەهۆی ڕاپەڕینەکانی کوردەوەو لەم دواییەدا ژمارەیەك لەکوردەکانی ناو خاکی ئێران‌و عێراق چەند جارێك ڕاپەڕیون, بەتایبەتی ڕاپەڕینی بارزانیەکان سەرنجێکی تایبەتی ڕاکێشاوە, ئێمەش لەم هەڵوێستەدا پێویستە بیرو بۆچوونی خۆمان دەربارەی کێشەی کورد بۆ میللەتەکەمان ڕوون بکەینەوە کەهەندێ جار ڕۆژنامەکانمان هەواڵ‌و دەنگ‌و باسی لەیەکنەچوو بلاْودەکەنەوە دەربارەی هەریەك لەو ڕاپەڕینانەوبۆ ئەوەی بتوانین ئەو شتانە ڕوون بکەینەوە کەسوودی هەردوشەعبەکەی تیادایە(مەبەست تورك‌و کورد)و چارەسەری کێشەی کوردیش بکرێت بەتایبەتی کوردستانی تورکیاو ئەبێ بەرلە هەموو شتێك ئەوە بخرێتە بەرچاو کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی بە شێوەیەکی گشتی لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی کارێکی تەواوی کردۆتە سەرباری سیاسی‌و کۆمەلاْیەتی‌و ژیانی تایبەتی هەموو میللەتان بەگەورەو بچوکیانەوە ئەگەر بەقوڵی بچینە سەرباسی کورد بۆمان ڕوون دەبێتەوە هەموو بزوتنەوەکانی کورد بۆ دەسگیر بوونی مافی خۆیان بوە, بەلاْم حکومەتی جمهوری تورکیا لەجیاتی ئەوەی دان بەهەڵەکانی ڕابردووی خۆیدا بنێت‌و چارەسەری کێشەکە بکات‌و سیاسەتێکی تازە بگرێتەبەر دەربارەی میللەتی کورد کەچی بەهەڵە وای بۆ حسابکراوە کە جێگەی مەترسی‌یە بۆ تورك ئیتر کاتی ئەوە هاتوە واز لەبۆچوونە پڕ هەلاْنەی پێشوو بهێنرێت چونکە چەندان سەدەیە هەردوو میللەتەکە پێکەوە ژیاون‌و لەگەڵ ئەوەشدا ماوەی نیو سەدەیە کوردەکانی فێری زمانی,

توركی بون‌و ژماره‌یه‌کی زۆر له ڕۆشنبیرانیان له قوتابخانه توركی‌یه‌كانا خوێندوویانه، به‌لاّم له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا دان به‌بوونی میلله‌تی کوردا نه‌نرێت کورد والێ بکرێت هه‌میشه له‌گه‌ڵمانا ناڕێك بێت چونکه هیچ سوودێك له‌وه‌دا نابینرێت که تۆ به‌کوردێك بڵێ یت تۆ تورکی‌و، ئێمه ئه‌گه‌ر ئێمه بڵێین کوردستان نیه‌و شتێك نیه پێی بوترێت کوردستان له ڕاستیدا شتێك له‌و ڕاستیه که‌م ناکه‌ینه‌وه کوردستان هه‌رهه‌یه‌و ده‌مێنێت‌و ڕاسترین هه‌نگاو بریتیه له‌وه‌ی دان به‌شه‌عبی کوردو به‌ولاّتی کوردا بنرێت.

هه‌نگاوی دوهه‌می پێویست ئه‌وه‌یه تورك به برایه‌کی گه‌وره‌ی کورد حساب بکرێت‌و بۆئه‌وه‌ی ئه‌و برایه‌تیه به‌هێز بکرێت پێویسته به‌ده‌نگ داخوازییه‌کانی کورده‌وه‌بچین وه ئه‌گه‌ر ئێمه باری ژیان بۆ خه‌ڵکی تر به‌هێز بکه‌ین بۆ ئه‌وا خۆشمانی پێ به‌هێز ده‌بین که‌له ڕاستیدا ئه‌مه ڕێبازی ژیانه. بانه‌ختێك سه‌یری حکومه‌تی بریتانیای گه‌وره بکه‌ین بۆ ئه‌وه‌وی بزانین چ جۆره سیاسه‌تێك به‌کار ده‌هێنیت به‌رامبه‌ر به‌وانه‌ی ئینگلیز نین‌وبزانین تا چ ڕاده‌یه‌ك ڕێز له دانیشتوانی میصرو استرالیا و کنداو شوێنه‌کانی تر ده‌گریت، له‌ڕاستیدا ئینگلیز له تورك باشتر نین به‌لاّم سوودو به‌رچه‌وه‌ندیی خۆیان وای لێکردون ئه‌و جۆره هه‌ڵوێسته بگرنه به‌ر له‌گه‌ڵ میلله‌تانی تردا.

ئایا دانانی ڕوسیا به‌جمهورییه‌ته‌کانی جورجیاو ئه‌رمه‌نیاو ئه‌وانی تر نموونه‌یه‌کی زۆر باش نین که‌له هه‌ندێکیانا قوتابخانه‌شیان بۆ کورده‌کان کردوته‌وه که ژماره‌ی کورد له‌و شوێنانه‌دا په‌نجا هه‌زار که‌س ده‌بن‌و له‌مۆسکۆ ئه‌کادیمیی زانیاری ڕوس له مۆسکۆ ئه‌بجه‌دیه‌تێکی تایبه‌تی

بۆ کورد داناوە(مەبەستی ئەو ئەلف بایەیە کە ڕۆژنامامەی ڕێ یاتازەی پێ دەرئەچوو لە ئەرمەنیا) پێویستە دەرس و پەندێکی باش لە هەڵوێستی ئینگلیز وەربگرین بەرامبەر بە ئێرلندە....ئایا حکومەتی بریتانیا توانای ئەوەی نیە سزای ئێرلندییەکان بدەن بەرامبەر بەو هەموو داخوازییە زۆرو قورسانەی لە ئینگلیزەکانیان داواکردبوو..

هەروەها هەڵوێستی فرنسە بەرامبەر بەسوریا کە هەندێکەس بە هەڵە وای لێك ئەدەنەوە ئەوشێنەییەی فرنسە لەبەر لاوازییەتی لەکاتێکدا ئەمە مانای لێکدانەوەو دووربینی و بەهێزیی دەستەڵاتێتی.

پێویستە تورکیا لەسەر ڕێبازی ئێران و عراق نەڕوات بەڕێوە بەرامبەر بەکورد چونکە تورکیا دەوڵەتێکی گەورەیەو شوێن و پلەیەکی بەرزی هەیە لەڕووی سیاسەتی دەوڵەتانەوەو پێویستە بچیتە سەر ڕێبازی میللەتانی پێشکەوتووی جیهان لەڕووی ئایدۆلۆجیو ئابوریو کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە. هەرچەند تورکیا لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە بەیەکێك لە پێشکەوتووترین دەوڵەتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەژمێرێت بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەنابێ کوردیش وەکو میللەتانی تری لێ بێت.

ئەگەر تورك ڕێگە بدەن بەکورد وەکو ولاتانی ئەوروپا چۆن دەکەن تورکیش ڕێگا بدات بەکورد زمانی خۆی بەکار بهێنێت و ڕۆژنامەکانیان بەکوردی بلاوبکەنەوەو خوێندن لەقوتابخانەکانیانا بەزمانی کوردی بێت ئەوسا بۆیان دەرئەکەوێ کورد چۆن ڕێبازێکی تازە دەگرێتەبەر کەسوودی بۆهەردوو شەعبی تورك و کورد دەبێت.

لاموایەوبگرە دڵنیاشم لەوەی ساتێك كورد داوای سەربەخۆیی دەكات لەهەمان كاتیشدا ئارەزووی ئەوە دەكات لەچوار چێوەی زمانی نەتەوایەتیی و رەوشت و تەقالیدی خۆیدا بژی و لەسەر توركیش پێویستە وەكو برا گەورەیەكی كورد ئەو داخوازییانەی بەجێ بێنێت و مافی نەتەوایەتیی خۆیان بۆ موسوەگەر بكات و لاموایە تورك توانای ئەوەشی هەیە ئەگەر كورد داوای شتی لەوەش زیاتری كرد پێویستە دەست نەنرێت بە روویانەوە.

ئەو میللەتە زیرەكو سەربەستی پەروەرو ئازایە بكرێت بەدۆست و هاوكاری تورك و خۆی بەكورێكی دڵسۆزی دایكی نیشتمان دابنێت.

بەداخەوە هەندێ لەكوردەكان لەسەر هەندێ داخوازی تۆزێك پەلەدەكەن، بەلام ئەمەش مانای ئەوەنییە ئەو پەلەكردنەیان ببێتە هۆی دوژمنایەتی و ئەبێ راستی یەك هەیە بخرێتەبەر چاوو فەرامۆش نەكرێت ئەویش ئەوەیە: ئەوەی بەنووكی شیرو رم دروست دەكرێت بەنووكی شیرو رمیش دەرووخێنرێت و لەناو دەچێت، بۆیە پێویستە پێوەندی كۆمەلایەتی بناغەكەی لەسەر خۆشەویستی دارێژرێت كەبەمە ئەو پەیوەندییە خۆراگر دەبێت و ئەمە ئەو رێبازەیە كە تورك پێویستە لەگەڵ كوردا بیگرێتەبەر)).

لەراستیدا لەدوای خوێندنەوەی ئەوباسەی لەرۆژنامەی(دوغری یوڵ)ی توركیدا بلاوكراوەتەوە بەپێنووسی توركێكی رۆشنبیرو دووربینی بەویژدان چەند سەرنجێك دێنە پێش چاو:

١- دوورنییە ئەوباسە لەلایەن رۆشنبیرێكی توركی ئەو سەردەمەی وەكو یشار كمال و اسماعیل بێشكچی ئەم سەردەمەوە نوسرابێت كە زۆر دووربینانە ویستوویەتی خزمەتی پاشەرۆژی تورك و دەوڵەتی توركیاش

بکات, بەلأم دوورنیە ئاخۆ ئەو نووسەرە لەدوای ئەوباسەی بیانووی پێگیراوەو زیندان کراوە یانا؟ وەئایا ئەو ڕۆژنامەیە لەدوای بلأوکردنەوەی ئەو باسە داخراوەیانا؟

٢- بەرلەمە باسێکی کریس کوچرامان بلأوکردەوە کەلەو باسەیدا وتوویەتی:

(ڕۆژنامەی سون تلگراف) کەلە ئەستمبوڵ دەردەچوو, لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەکە سەربە حکومەتو لایەنگری حکومەت بوویەلأم تەنها لەبەر ئەوەی شتێکی تیادا بلأوکرابۆبوە وە کەبەدڵی کاربەدەستانی حکومەت نەبوو,ئەو ڕۆژنامەیان داخست, تۆبلێی ڕۆژنامەی(دوغری یۆڵ) پاش بلأوکردنەوەی ئەوباسەی بەناوی موفەکرێکی تورکەوە بلأوکرابوبوە وە هەروا بەئاسانی لەداخستن ڕزگاری بووبێت نووسەر بیرو بۆچوونی خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەکوردو بەمافی کوردو داواکردنی لەحکومەت کە ڕێبازێکی دیموکراتیانە بگرنە بەر لەگەڵ کوردا, کەلام وایەو هیچ گومانیشم لەوەدانیە کە کاربەدەستانی ئەو ڕۆژانەی تورك بەچاوێکی پڕ لە ناڕەزاییو بەدڵێکی پڕ لە خەشمو قینەوە سەیری ئەو باسەیانکردبێت, بەپێویستی دەزانم بۆ چوونێکی تری لەوجۆرەکە (١٩)ساڵ بەرلەوە لەلایەن زاناو ڕۆشنبیرێکی کوردی ناسراوە وە وەلە (٣٠/ی ئۆکتوبەری(١٩١٣)دا لەلایەن(عبداللە جودت)ەوە لەگۆڤاری(ڕۆژی کورد)دا بلأوکراوەتەوە بخەمە بەرچاو(بەرلەوەی باسەکەی بلأوبکەمەوە, حەزمکرد باسی(عبداللە جودت)بکەم:

(ڕۆژی کورد)کە عبداللە جودت ئەم باسەی تیادا بلأوکردۆتەوە ئۆرگانی کۆمەڵی (هێڤی-هیوا بوە تاسالی(١٩١٤) وەلەدوای ئەوە ناوی کراوەبە

(هەتاوی کورد) کەلەبەرگی یەکەمدا لەباسی ئەو گۆڤارەدا وتراوە عبدالله جودت یەکێك بوە لەنووسەرانی ئەو گۆڤارە.

لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم لەشۆڕشی پیرانیشدا هاوکاری شۆڕش بوەو ڕۆژنامەی (ئەقشام)ی تورکی لەمانگی کانونی دوهەمی (١٩٢٥)هێرشێکی توندو تیژی کردۆتە سەر عبدالله جودت بەتاوانی ئەوەی هەوڵی دابوو حکومەتێکی سەربەخۆی کورد دروست بکرێت.

عبدالله جودت لەدوای اعلانی مشروطیە (ساڵی١٩٠٨)گەڕابوەوە بۆ تورکیا و گۆڤاری(اجتهاد)ی دەرکردبوو کەپیرە مێردی شاعری مەزن یەکێك بوە لەهاوکارەکانی لەو گۆڤارەدا.



عبدالله جودت لاپەڕە/٣١٤ی کتێبەکەی زنار سلۆپی

عبدالله جودت لەگۆڤاری(ڕۆژی کورد)کەلە ٣٠/ی‌تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩١٣)دا لەژێر ناوی (ڕێگای یەکگرتن) کەلەو باسەیدا لەوە دوا بوو چۆن کوردو تورک پێکەوە بژین. قدری جمیل بەگ لەلاپەڕە/١٨٠ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧ دەقی ئەو وتارەی بەم جۆرە بلاوکردۆتەوە:

((ساتێك یەکێك لە دۆستە نزیکەکانم گۆڤاری (ڕۆژی کورد)ی چاوپێکەوت لەسەر مێزەکەم بەسەر سوڕمانێکەوە پرسی: ئەم بلاو کراوەیە چی‌یە؟؟ منیش کە تێم گەیاند ئەمە زمانی حاڵی کوردەو بەشێکە لە ڕۆژنامە گەرێتی کە هەوڵئەدات لەباسی ژیانی کۆمەلایەتی و (ئەنتۆگرافی) بکۆڵێتەوەو لەسەری بنوسێت... ساتێك ئەو دۆستەم گۆڤارەکەی کردەوەو سەیری لاپەڕەکانی کرد کە بەزمانی کوردی نوسراوە وتی: لەبەر ئەوەی گۆڤارەکە بەزمانی کوردی نوسراوە, کەواتە ڕۆژنامەکە لایەنگری جیابوونەوەیەو گۆڤارەکەی لەسەر مێزەکەم دانایەوە!! (کەدیارە دۆستەکەی تورك بوە)

بەلای منەوە مەبەستی(عبدالله جودت)خۆیەتی ئەم گفت‌وگۆیەی هەردەکمان شایانی لێکۆڵینەوەیە, چونکە بیرو بۆچونی گشتی بەرامبەر بەم مەسەلەیە جێگەی داخەو زۆر خەفەتبارم کە ئەو فەلسەفەیە لەناو دەوروبەرە کەشمانا جێگەی خۆی کردۆتەوە.

تورکیا لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك لەو وولاتانەی ئەورووپای جاران لەژێر دەستیا بوە لەکیس چوە بەلام هێشتا هەر بەئیمپراتۆرییتێکی گەورە دەژمێرێت و هێشتا گەلێك لە میللەتان هەر لەژێر سایەی ئەو ئیپراتۆریەتە داماون و بەتەمای ئەوەیە ئەو میللەتانە یەك پێ بگرێ یا

هیچ نەبێ لەیەکتریان نزیك بکاتەوەو هەوڵی ئەوە دەدات ڕێگە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە خۆش بکات.

من وەکو تورکێك یا کوردێك نا, بەڵکو وەکو هاو وڵاتیەکی سەربەست کە لایەنگرو ئاواتە خوازی سەرگرتنی سەربەستیم, وائەزانم خوای گەورە خەڵکیبۆ ئەوە دروستکردوە لەناو خۆیانا بەڕێكو پێکی پێکەوە بژین کەهەروەکو لەقورئانیشدا فەرموویەتی(وخلقناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا)کەواتە هەموو میللەتێك بۆی هەیە بەو پەڕی سەربەستیەوە دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی تایبەتی هەڵبژێرێت بەو شێوەیەی لەگەڵ ئارەزوو سروشتی میللەنەکەیدا یەك بگرێت, بۆئەوەی لەڕێگەی ئەمەوە بتوانێت دۆستایەتی خۆی لەگەڵ میللەتانی تردا پەیدابکاو بەهێزی بکات.

ئەوە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کەدەوترێ:ڕێگەی یەککگرتنی ئەو میللەتانەی لەناو ئیمپراتۆریەتێکی چەند میللەتیدا تەنها لەڕێگەی بەکارهێنانی تاقە زمانێکەوە ئەو یەککگرتنە دێتەدیو سەردەگرێت.

دووساڵ لەمەوبەر داوام لێکرا محازەرەیەك پێشکەش بکەم دەربارەی یەکێتی شەعبی(کادیکیۆ)لەیانەی(اتحاد دوترقی)و منیش لەو محازەرەیەدا ووتم:

یەککگرتنی هەموو شەعبێك بەرلە هەموو شتێك بەیەککگرتنی(پەرژەوەندی–مصالح)پێك دێتو ئەمەشم بەڕێگەیەکی ڕاست دانا بۆ ئیمپراتۆرێتی تورکیا کەبیکا بەڕێبازی خۆی.

بۆنمونە:ئەگەر دووکەسمان بەپەت بەستەوە بەیەکترییەوە وەی تریشمان لەملاولای ئەو دووکەسەدا دانا ئایا لەم دووتاقمە چلایەکیان

لەناو خۆیانا لەگەڵ یەکتردا ڕێکوپێك دەبن؟ ئایا ئەو دوانەی بەپەت بەیەکەوە بەسراون(کە بێگومان مەبەستی عبدالله جودت ئەوەبوە بڵێن ئەو دوانەی بەزۆرە ملێ پێکەوە بەسرابوون) یائەوانەی تر؟؟

عبدالله جودت لەباسەکەیدا دەڵێت:

ئەم پرسیارە پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات... لەشوێنێکی وەکو(سویسرە)کەلە(٢٢)کانتونات پێکهاتوەو هەریەکەیان بریتیەلە کانتۆنێکی سەربەخۆ لەڕووی ئیداریو حقوقی دانیشتوانیوە.

بۆ وێنە: نابێ لەکانتۆنی(جنێف)داکەس حکوم بدرێت بە اعدام چونکە یاسای ئەم کانتۆنە ڕێگا بەهەڵواسینی کەس نادات و ئەوەبوو بەرلە دەساڵ کە(لۆکورتی)ی گێرەشێوێنی ئیتالی(ئیلیزابت)ی خاتو ئیمپراتۆری نەمسا لە(جنێف)دا کوشت و حکومەتی نەمسا داوای لە حکومەتی مرکزیی سویسرا کرد لە (برن) سزای لۆکورتی بدات بە اعدامکردن,بەرامبەر بەم داخوازییە حکومەتی کانتۆنی(جنێف) ئەو داخوازیەی پشت گوێ خست و وەرامی حکومەتی نەمسای وادایەوە کە سزای ئەو کوشتنە بەپێی یاسای کارپێکراوی کانتۆنی(جنێف) ئەدرێت چونکە ئەو ڕووداوە لەناو خاکی حکومەتی(جنێف)ڕوویداوە لەبەرئەوە داخوازییەکەی حکومەتی نەمسا سەری نەگرت.

ئەو جمهوریەتە(کانتۆنانە)بچوکانەی لەهەموویان حکومەتی فیدڕاڵی سویسرەیان پێکهێناوە هەریەکێك لەوانە بەقەد یەککێك لەویلایەتەکانی تورکیا دەبێت و هیچیان لەژێر دەسەڵاتی ئەوەی تریانا نیە, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کاروبار هەیە پێکیانەوە دەبەستێتەوە دانیشتوانی سویسرە لەنوێنەرانی سێ ڕەگەزی جیاواز پێکهاتوە...

فرنسی...ئەلمانی... ئیتالی و دیانەتەکانیشیان لەسەر یەك شێوە نیە: پرۆتستانت, کاثولیك, ئەرثوزکس, فالونیست, بەلام لەڕاستیدا جیاوازیی نێوانیان لەڕووی ڕەگەزو ئاینەوە تەنها هەربەناو هەیەو بەهۆی ئەو دەسەلاتە سەربەخۆییە کەهەریەکێك لەو کانتۆنانە هەیەتی.. هیچ بایەخێك نەدراوە بەبوونی ئەو جۆرە جیاوازییەی نێوانیان.

ئەوشارەزاییەی دەسگیرمان بوە بۆمان روون دەکاتەوە ئەم سەردەمە(باسی سالی ۱۹۱۳ی کردوە)بریتیە لەسەردەمی بووژانەوەی نەتەوایەتی و بێدەنگ بکات و لەناوی ببات و بەرهەلستی کردنی و تەقەلای نەهێشتنی لەڕێگەی هێزو بەزۆرە ملی سەرناگرێت و بەپێچەوانەوە پێویستە ڕێگەی ئەوە بدۆزرێتەوە کە بەشێوەیەکی ڕاست وباش ڕەفتاری لەگەلدا بکرێت و پەندێکی کۆن هەیە لەو ڕوەوە کە دەلێت: برا برایە, بەلام هەریەکەیان مافی تایبەتی خۆی هەیە(لەکوردیدا ووتراوە: برایمان برایی وکیسەمان جیایی کە ڕەنگە عبدالله جودت مەبەستی ئەمە بووبێت).

کورد دەیەوێ زمانەکەی خۆی پەرە پێ بدات و هەستی نەتەوایەتیی بگەیەنێتە پلەیەکی بەرزو پێشکەوتوو, حکومەتەکەمان ڕۆژێك دێ لەم داخوازییەی کورد بەباشی تێ بگات.

هاو ولاتیانی کورد شان بەشانی هاو ولاتیانی ئەرمەنی دەژین و لەگوندی ئەرمەنیەکاندا(هاملێت)ی شکسپیر دەخوێننەوەو نووسینەکانی(مونتیسکۆ)و (دانتی)و (داروین)کەبەرلە پەنجا سال بەشێوەیەکی زۆرباش وەرگێڕراون بۆ زمانی ئەرمەنی لە قوتابخانەی (منجتاریت)دا لەشاری(ڤینسیا)....ئایا ئەو جۆرە چالاکیە ڕۆشنبیریە لەناو ئیمپراتۆریەتە کەی ئێمەدا هەرلە خۆیەوە پەیدا بووە؟؟

هیوادارم ئەوکەسەی ڕەشبین و نائومێدە لێم نزیک نەکەوێتەوەو ئەوەش کە دێتەلام بەبێ دڵخۆش بوون لام نەڕوات.

عبدالله جودت
٧/تموزی/١٩١٣

زنار سلۆپی لەدوای بلأوکردنەوەی ئەوباسەی عبدالله جودت کەلەگۆڤارا ڕۆژ کوردا بلأوکرابوەوە وتوویەتی:
ئەو ڕۆژەی ئەو باسەی تیادا بلأوکرابوەوە(ژون تورك)لەو بیرو بۆچوونە ووردەی ئەو نووسەرە ڕۆشنبیرە نەدەگەیشت و بگرە تورکیای ئیمڕۆش هێشتا هەر لێی تێ نەگەیشتوەو ناشیەوێ لێی تێ بگات چونکە ڕەگەز پەرستێتی کوێرانە ڕێگەی ئەوەی لێگرتوە.
(بەڕاستی نەخشەی ئابدین عوسمان بۆ تواندنەوەی کورد نمونەیەکی زەقی ئەو بیرو بۆ چوونە ڕەگەز پەرستی‌یەیە کە ساڵەمایە کاربەدەستانی تورك نەیانتوانیوە بەبست لێی دوور بکەونەوە).

## باسی دووهەمی

# هۆی دەسپێکردنی شۆڕش وبەشداربوانی شۆڕش و سەرکردەکانی شۆڕش

لەباسی پێشوودا بەدورو درێژ باسی هەڵوێستی حکومەتی تورك کرا کە چۆن نەخشەی تایبەتی کێشابوو بۆکۆتایی هێنان بەهەموو جۆرە بزووتنەوەو ڕاپەڕینێکی تر پاش ئەوەی شۆڕشی ئاگریداغی خامۆش کردبوو, خۆشی ئامادە کردبوو بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد لەبۆتەی نەتەوەی تورکداو تەنها مابووەوە سەرناوچەی درسیم کەهەتا ئەوکاتە هێشتا بەتەواوەتی دەست درێژی نەکردبوە سەر دانیشتوانەکانی وهێشتبویەوە بۆدوای لەناو بردنی شۆڕشی ئاگریداغ و وادیاربوو حکومەت لەکاتی شۆڕشی کورد لەناوچەی ئاگریداغدا بۆبێدەنگردنی دانیشتوانی درسیم نەمێنێت بەڵام دوای شۆڕشی ئاگریداغ بەو بڕیارەیدا چوە وە ودەستی کردبوو بەسەندنی باج.

دەربارەی ئەمە پرۆفیسۆر حسرتیان لەلاپەڕە/١٦٥ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤٩باسی کردوە کە حکومەت بڕیارێکی تازەو تایبەتی دەرکرد،

بۆسەندنی باج لەسەردانیشتوانی درسیم و ئەم بڕیارەی حکومەت بوو بەهۆی پشێویو شۆڕشێکی تازە کەلەساڵی ١٩٣٧دا لەوناوچەیەدا دەستی پێکرد.

ئەو بڕیارەی حکومەتو بڕیارێکی تری کەبریتی بوو لەداگیر کردنی زەویو زاریکوردودابەش کردنی بەسەرئەو تورکانەدا کە هێنابویانە ناوچەکە ئەوەندەی تر هەڵوێستی ئاڵۆز کرد.

حسرتیان لە باسەکەیدا ووتوویەتی:

((لەسەرەتادا سەندنی باج بەئاسانی سەری نەگرت چونکە دانیشتوان بەربەرەکانی حکومەتیان دەکردو بەرامبەر بەمە حکومەت دەستیکرد بەهەڕەشەکردن وترساندنو سزادانو کوشتوبڕی خەڵكو لەسەر جادەکانی(العزیز)بۆ ترسلاندنی خەڵك چەند کەسێکی لەسێدارەدا لەوانەی دژی حکومەت وەستابوون لەنەدانی باج بەپێی ئەو بڕیارە تازەیەی دانیشتوان ماوەیەك بوو فێری نەدانی بوبون وئەم ڕەفتارو هەڵوێستە تازەیەی حکومەت بوو بەهۆی ڕاپەڕین وهەڵگیرساندنی شۆڕشێکی تازە کە هەموو ناوچەی درسیم یگرتبۆوەو شۆڕشگێڕان توانیبویان(٣٠ هەزار)چەکدار ئامادە بکەنو پەلاماری فەیلەقێکی تورکیان داوپردەکانیان ڕوخاندو ڕێگەوبانەکانیان تێکداو ڕێگەی هاتو چۆکردنیان بڕی(لام وایە ئەو ٣٠هەزار چەکدارەحسرتیان دەبێ لەدەمی دانیشتوانەوە بیستبێتی کە دوورنیە زیادە ڕۆیی لە ژمارەکەدا کرابێت چونکە لەدوایدادەردەکەوێت ئەگەر شۆڕش خاوەنی ئەو هەموو چەکدارانە بوایە بەئاسانی ئەو شۆڕشە کۆتایی پێ نەدەهێنرا).

حسرتیان دەڵێ: حکومەت بەرامبەر بەو بزووتنەوەوجم وجۆڵەی کورد ئەویش (٢٥هەزار) سەربازی لەساڵی١٩٣٧دا لە(تونجلی) ئامادەکردوبەپاڵپشتی هێزی ئاسمانی بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە توانی شۆڕشەك خامۆش بکات و لەناوی ببات))

بەرلەوەی بەدوورودرێژ بچینەسەر باسی دەسپێکردنی شۆڕشەکەو ئەنجامەکەی بەپێویستم زانی کورتە باسێکی ژیانی ئەو سەرکردەو شۆڕشگێڕانەی کوردبکەم کەلەو شۆڕشەدا بەشدارییان کردبوو.

کریسکوچرا لەلاپەڕە/٢٠٣ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/ ٤١ باسیژیانی (سەید ڕەزا)ی کردوەکەسەرکردەی ئەم شۆڕشە بوەکە ووتوویەتی سەید ڕەزا لەساڵی١٨٦٢دا لەدایك بووەو لەساڵی ١٩٣٧داکۆچی دوایی کردوەکە بەپێی بۆچوونی کریس کوچرا سەید ڕەزا(٧٥)ساڵژیاوەوکەلە سێدارە دراوە لەتەمەنی(٧٥)ساڵیدابوە.

کوچرادەربارەی ژیانی سەید ڕەزا وتوویەتی:

((ساتێك ڕاپەڕینی درسیم دەستی پێکردئەو دپلۆماسی وسیاسییانەیلە ئەنقەرەبوون نەیان دەزانی کێسەرکردەو ڕێبەری شۆڕشەکەیەو لایانوابوو سەید ڕەزا تەنها بریتی بووەلە سەرۆکێکی ئاینی و مەزهەبی لەناوچەکەدا.

کریس کوچرا لەباسەکەیدا ئامازەیبۆ کتێبەکەی (نوری درسیمی)کردوەبەتورکی لەژێرناوی (درسیم کردستان تاریخندە)کەلەدوایدا لەساڵی١٩٥٢دابەزمانی تورکی لەلایەن (ئالپ)ەوەچاپکراوە کەلەو کتێبەدا بەدوورودرێژ باسی سەید ڕەزاو مێژووی ژیانی کردوە کە نوری درسیمی خۆی ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ سەید ڕەزا دا ژیاوە وپێکەوە خەباتیان

کـردوه(لەبـەرگی دوهەمـدا وێنـەی نـوری درسیمی هەیـە)بـەپیێ کتێبەکـەی نـوری درسـیمی سـەید ڕەزا کـوڕی سـەید ئیـبراهیم بـوە کەسـەرۆکی عەشیرەتی(حەسەنان)بوە کەلەڕۆژئاوای درسیمدابوە کەئەم عەشیرەتە یـەکێك بووەلە عەشیرەتە بەناوبانگەکانی ئەوناوچەیە.

(بـەڵام حەسـەن عرفـە لەکتێبەکەیـدا سەرچاوە/٥٢وتوویـەتی:سەید ڕەزا لەخێڵی (عباس ئوشاقی)بوەکە ڕەنگە ئەو خێڵـی عباس ئوشاقی‌یەی حسن عرفە باسیکردوە هەریەکێك بوە لەخێڵەکانی عەشیرەتی حەسـەنان کـە نـوری درسیمی باسیکردوەو کریس کوچرا ئامـاژەی بۆ کردوە).

بەپیێ کتێبەکەی نـوری درسیمی لـەناو شیعەکانی درسیمدا کەکریس کوچـرائاماژەی بـۆکردوە(کەمەبەسـتی علوی‌یـە)شـێخەکانی درسـیم بـە (سـەید)نـاودەبران وسـەید ئیـبراهیم چـوار کـوڕی بوەکـە (سـەید ڕەزا)کـوڕی بچوکی بوەو لای باوکی زۆر خۆشەویست بوە.

سـەیدڕەزا دەرسـی(زانـین-علـم)ومەلایـەتیی لای(محمدعلی‌ئەفەنـدی) خوێندوەکەیـەکێك بوەلـەزانایانی ئەوسـەردەمەومرۆڤێکی‌ئاینی‌ومەزهەبیی بـەناوبانگی ناوچـەکەبوەو ڕۆڵێکـی زۆر گـەورەی بینیـوە لەچەسـپاندنی بیروبـاوەڕی نەتوایـەتی لەمێشـك ودڵـی سـەید ڕزاداو سـەید ڕەزا بـەهۆی ئەوەوەو بەهاندانی ئەو مامۆستایەوە مێشکی پڕبوە لەهەستی نەتەوایەتی. بەپیێ وەسیەتی سـەید ئیـبراهیم، سـەید ڕەزا جێگـەی بـاوکی گرتۆتـەوەو لەگوندی )ئاغداد)دانیشتەجیێ بووە کە گوندێکە لەداوێنی کێوی (توژیك).

هەڵوێت ورەفتاری سەید ڕەزا ڕوونی کردۆتەوە کە ڕێبازێکی کوردایەتیی گرتبوەبـەرو مرۆڤێکـی خـاوەن ڕەوشـت وخوویەکی بـەرز بـوەو خزمـەتێکی زۆری میللەتەکـەی خـۆی کـردوە.لـەدوای شۆڕشـەکەی شـێخ سـعید

لەساڵی١٩٢٥داسەید ڕەزا خزمەتێکی زۆری ئاوارەکانی کردوەو خەڵکی لاواندۆتەوەو پەنای داون(کاشکی ئەو خزمەتە زۆرو گەورەیەی سەید ڕەزا دوای شۆڕشەکەی پیران لەکاتی شۆڕشەکەدا بوایەولەکاتی دەست درێژی کردنی تورك بۆسەر شۆڕشگێڕانی پیران بیَلایەن نەبوایەو بێدەنگ دانەنیشتایەو ئەو کۆنە قینەی بەهۆی سوارەی حمیدیەو ڕەفتاری سوڵتانەکانی عوسمانیەوە لەناو سونیو علویدانەبوایە بەهۆی کەمتەرخەمی بەدەنگ یەکەوە نەچوونی ڕێبەرانی ئەو دوومەزهەبە,کەلە شوێنی خۆیدا لەباسی هەڵسەنگاندنی ئەم شۆڕشەو شۆڕشەکانی تریباکووربەشێوەیەکی گشتی دەچینەوەسەرئەم باسە).

کریس کوچرالەلاپەڕە/٢٠٤ی کتێبەکەیدا باسی دوکیومینتیکی ناوئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیای کردوە ژمارە (F0.361-A.F.20864)کەلەو دوکیومینتەدا باسی نیشتیمان پەروەریتی وڕووناکبیریتی سەید ڕەزای تیادا کراوە کەوتوویەتی:

((سەید ڕەزا لەگەڵ چەند هاوکاریکیدا نامیلکەیەکی بە فرنسزی لەژێر ناوی (درسیم-کوردستان)داچاپکردوەو ناردویتی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا(بێگومان نوری درسیمی کەشارەزای زمانی فرنسی بوە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لەنوسین ولەهاندانی سەید ڕەزا بۆناردنی ئەو نامەیە). بەپیَی کتێبەکەی کریس کوچرا(وەرگێرانی محمدریانی بۆکوردی) پوختەی ئەو نامیلکەیە بەم شێوەیەبوو:

((زۆر لەمێژە,واتە بەدرێژایی ساڵەهای ساڵ تورکەکان لەناو وڵاتی کوردستاندا کارێکیوایان کردوە کەکوردێك نەتوانێت ڕۆژنامەیەك بخوێنیتەوە بەزمانی زگماکی خۆی بنوسێت یاخود پەرتوکێك چاپ

بکات وبلأوی بکاتەوە وەیابەزمانی خۆی ووت و وێژبکاتو حکومەتی کوردی دوور خستۆتەوە بۆناوچەی (ئەناتولیا)کە بریتی یەلەشوێنێکی ووشك وبیٚ ئاو,زەوی‌وزارە کانیشی بەکەڵکی هیچ نایەت ولەئەنجامی ئەمەدا ژمارەیەکی زۆری کورد لەناوچوە وحکومەت شان بەشانی ئەمەش ئەوپەڕی جەوروستەمی بەکار هێناوە لەگەڵ دانیشتوانی درسیمدا وخەڵك هەمووی تووشی نائارامی بون وئاوارەکراوی ودوورخراونەتەوەلەخاکی ولأتی خۆیان واەئەنجامدا ئەوانیش ناچاربوون دەست بدەنە چەك بۆ ئەوەی ولأتەکەیان ومافی خۆیان بپارێزن کەنمونوی ئەمە لە ڕاپەڕینی ئاراراتی ساڵی١٩٣٠دا لەناوچەکانی (زیلان)و (بایزید)دا دەرکەوتوە.

هەرچەندە ئەوا ماوەی سیٚمانگ تێپەڕی کردوە بەسەر ئەو شەڕە بیٚ ئەمان وئەو شەڕە نابەرامبەرییە لەیەکنەچوەی نێوان هێزی دوولادا(مەبەستی حکومەت‌ودانیشتوانی درسیمە)دەستی پێکردوە لەم ناوچەیەدا وحکومەت بەبۆمبای ناپاڵم وژەهراوی ولأتی کوردستان بۆردومان دەکەن کەلەئەنجامیا ژن ومنداڵێکی زۆری بیٚ تاوان دەکوژرێت بەبیٚ ئەوەی بەزەییان بەهیچ کەسێکدا بێتەوە, لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت هێشتا نەیتوانیوە سەربکەوێتو بگرە تووشی زیان وشکستیش بووەو بەرامبەر بەو خۆڕاگرتن ووەستانەی ئێمە, فڕۆکەکانی حکومەت ئاواییەکانن بۆردومان دەکەن‌و دانیشتوان لەلایەن حکومەتەوە ئاوارەدەکرێن ولەماڵ وشوێنی خۆیان دوور دەخرێنەوەو ناوبەندیخانەکان پڕو سیخناخن لەگیراوەکان کەدەستە دەستەش ڕۆشنبیرانی کورد لەناو بەندیخانەکانا تیرباران دەکرێن ودەکوژرێن.

سێ ملیۆن کورد کەلەگەڵ میللەتی تورکدا دەژین دەیانەوێ بەزمانی خۆیان بخوێنن و بنوسن و بەئاشتی و بەهێمنی و بەئازادی لەناو خاکی خۆیانا بژین وداب ونەریت وفەرهەنگ ورەگەزی خۆیان بپارێزن...

ئایا میللەتی کوردکەبەوشێوەیەداوایمافی خۆیدەکات بەلای ئێوەوە شایانی ئەوەیە بەوجۆرە ڕەفتاری لەگەڵابکرێت و بەوجۆرە تاوانی بەرامبەربکرێت؟!

ئایاپێویست نیە لەسەرحکومەتی تورك واز لەوهەڵوێست و کردارانەی بێنێت و چارەسەری کێشەکەبکات؟ئاغای وەزیر(مەبەستی وەزیری دەرەوەی بریتانیایە)منلەناخی دەروون و دڵمەوەئەم قسانە دەکەم و هیوادارم لەڕێگەی ئەم نامیلکەیەوە توانیبیتم هەستی دەروونم بەرامبەر بەڕووداوەکان لەلای ئێوەکاری خۆی بکات.

امزا

ژینرال–ئیسمی درسیم سەید ڕەزا



**وێنەیەکی سەید ڕەزا**

دكتۆر عبدالجبار قادر وەرگێڕی سەرچاوە/٧لەتورکیەوە بۆ کوردی وتوویەتی کاربەدەستانی حکومەتی بریتانیا هیچ وەرامێکی ئەو نامەیەی سەید ڕەزایان نەداوەتەوە.

بێجگەلەونامەیەی سەید ڕەزا کە بۆوەزیری دەرەوەی بریتانیای ناردبوو,حسن عرفە لەکتێبەکەیدا- سەرچاوە/٥٢(کوردستان ازبیرون)ئاماژەی بۆنامەیەکی ترکردوە کەلەلایەن(امام قاسم/و(ئیسماعیل حقی)یەوە کەلەڕۆژی ١٩٣٧/٨/١١داداویانەبە حکومەتی عراق و بەنوێنەرانی دەوڵەتە بێگانەکانی عێراقدا ولەونامەیەدا داوایانکردوە ڕەخنە لەو ڕەفتارە دڕندانەیەی تورك بگرن و داوای وەستانی ئەو شەڕە خوێناویە بکەن و کۆمیسیۆنێك پێك بێت بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژانەی ناوچەی درسیم.

حسن عرفە جگە لەباسی ئەو نامەیە باسی عەشیرەتەکانی (حیدران)و(رمان)و(ئوشاق)ی کردوە کەبەشداریانکردبوو لەشۆڕشی درسیمدا وقدری جمیل بەگ(زنار سلوپی)لەلاپەڕە/٢٠١ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧, باسی کۆبوونەوەی چەند عەشیرەتێکی کردوە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی هێزەکانی حکومەت ببنەوە کە عبداللە ئاڵب دوغان کرابوو بەسەرکردەی هێزەکانی حکومەت بۆ لێدانی ناوچەکەو ناوی (درسیم)ی بەشێوەیەکی ڕەسمی گۆڕیبوو بۆ (تونجلی)و عەشیرەتەکان لەو کۆبوونەوەیەدا هەوڵیاندابوو یەك بگرن و بەشێوەیەکی یەککگرتوو ڕووبەڕووی نەخشەکەی حکومەت ببنەوە, بەلام بەداخەوە لەو کۆبوونەوەیەدا نەگەیشتنە ئەنجامێکی بەسوودو نەیانتوانی ئەوانیش بەرامبەر بەنەخشەکەی حکومەت نەخشەیەك بۆ خۆیان ئامادەبکەن

کەلووت بەرزی‌وهەڵوێستی تاکەکەسی یەکێك بوو لەهۆکانی سەرنەگرتنی ئەوکارەگرنگە لەو ڕۆژە ناسکەدا, لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لەو عەشیرەتانەی پێوەندی‌و خزمایەتی یان لەگەڵ یەکتردا بەهێز بوو وەبۆ چوونەکانیان دەربارەی هەڵوێست لەیەکەوە نزیك بوو جۆرە ڕێکەوتنێکیان لەنێوان خۆیانا سازکردبوو, پەیمانێکیان بەست کەبەپێی ئەو پەیمانە بەڵێنیان دا ڕووبەڕووی هێزەکانی حکومەت ببنەوەو(سەید ڕەزا)توانیبووی جۆرە هاوکاری‌و تەباییەك لەنێوان هەندێکیانا پێك بێنێت وەکو عەشیرەتی (ئەباسیات, فرهادان, کارابالینان, بەختیار, یوسفیان, دومومان, حسن عرفە بەعەشیرەتی دمان ناوی هێناوە, لەگەڵ عەشیرەتی حیدران), بەلام عەشیرەتی(کالان)بەنیوەچڵی لەگەڵ عەشیرەتەکانی تیهەڵ‌بوە.

زنار سلوپی لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوەووتوویەتی:

عبدالله ئالپ دوغان هەوڵی دا لەڕێگەی(خضر) ناوێکەوە کەکۆنە قائمقامێکی خەڵکی درسیم بوو چاوی بەسەید ڕەزا بکەوێت لە(العزین)و خضر گەرەنتی دا بەسەید ڕەزا کەلەوچوونەیدا دەیانپارێزێت بەلام سەید ڕەزا لەنیوەی ڕێگایا لەمەبەستە ناپاکەکانی ئالپ دوغان گەیشتبوو بۆیە گەڕایەوەو چاوی بەئالپ دوغان نەکەوت.

دوای ماوەیەك دووبارە ئالپ دوغان(رائد شوکت)کەلێپرسراوی حکومەت بوولەکاروباری هات‌وچۆیا ناردی بۆ درسیم بۆئەوەی لەوێ چاوی بەسەرۆکەکانی کورد بکەوێت‌و بۆ ئەو مەبەستە رائد شوکت چوە(ئوفا جیك)ودووسێ‌سەرۆك عەشیرەتی کوردیشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆئەوەی بەهەموویان سەید ڕەزا قایل بکەن چاوی پێیان بکەوێت بەلام

سـەید ڕەزا نەچـوو بـەپیر رائـد شـوکتەوەوبەرامبەر بەمـە رائـد شـوکت بڕیـــاریدا ڕووبکاتـــە لای (ڕێبـــەر)ی بـــرازای ســـەید ڕەزا کەلـــە گوندی(حاجلی) دادەنیشێت.

ساتێك سەید ڕەزا بەو چوونەی رائد شوکتی زانیبۆلای ڕێبەری، سەید ڕەزا(علیشیر–علی شیرۆ)دەنێرێت بۆلای ڕێبەرو،ماوەیەك بوو سەید ڕەزاو ڕێبەری برازای لەسەر زەوی وزار لەگەڵ یەکتردا لەکێشەکە دا بوون وناڕێك بوون وسـەید ڕەزا علیشـیر ڕادەسـپێرێت لەڕێبـەر بگەیـەنێت کەتورکـەکان جێگەی باوەڕنین بۆیە نابێ باوەڕ بە درۆودەلەسەکانیان بکرێت، بەڵام ڕێبەر گوێنەداتـە قسەونەسـیحەتەکانی سـەید ڕەزاو بەقسـەکانی رائـد شـوکت هەڵدەخەڵەتێت و لەگەڵیا دەچێت بۆ(العزین)بۆئەوەی چاوی بە عبداللە دوغان بکـەوێت و لـەوێ بـە عبـداللە پاشا دوغـان پـارەو دیـاریو بـەرتیلێکی دەدات بەڕێبەرو هانی دەدات سەید ڕەزای مامی بەهیچ نەزانێت بەوجۆرە ڕێبەری لەسەید ڕەزا هەڵگێڕایەوە))

(سـەیر ئەوەیـە کـورد بـەهیچ شـێوەیەك دەرس و پەنـدی لەبەسـەرهاتەو ڕووداوەکـانی نـاوخۆی وەرنـەگرتوە وەئـەم هەڵوێسـتەی ڕێبـەر لەگـەڵ سـەید ڕەزای مامیدا ئـەو ناکۆکیـەمان بیردەخاتـەوە لەنێوان بەدرخان پاشـاو یـزدان شیری برازایـدا کەلەبەرگی یەکەمدا بەدوورودرێژ باسـی ئـەو ناکۆکیـەو هـۆی ئـەو ناکۆکیـەمان کـردوە کەچـۆن لەئەنجامـدا بـو بووبـەهۆی لـەناوبردنی ئـەو نیمچە حکومەتـەی بدرخان پاشا پێکـی هێنـابوو وەتورکەکـەکان توانیبویـان یزدان شیری برازای بدرخان لـەمامی هەڵگێڕنـەوە کەبەمـە هـەلو دەرفـەتێکی ئێجگار گرنگ لەکیس نەتەوەی کورد چوو).

## باسی سێهەمی

## سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕش و ڕووبەڕووبونەوەی هەردولا

لەدوای ئەوەی عبدالله ئالپ دوغان توانیبوی(ڕێبەر)ی برازای سەید ڕەزا قایلبکات ودژی مامی و شۆڕشگێڕەکانی تر بوەستێت ئیتر دەستی کرد بەبەجێهێنانی ئەو نەخشەیەی بۆ لێدانی ناوچەی درسیم تەرخانکرابوو، لەپێشدا فەرمانێکی دەرکرد بۆ دانیشتوانی درسیم کەپێویستە(٢٠٠) چەك بدەن بەحکومەت و بەرامبەر بەو داخوازییەی حکومەت درسیمیەکانیش کەوتنە خۆیان بۆ پارێزگاری کردن لەخۆیان و لەناوچەکەیان و رائدشوکتیش بەناوچەکانی عەشایری(خوزات-هوزات) دادەستیکرد بەگەڕان بۆ ئەوەی تۆوی ناکۆکی لەنێوان درسیمیەکان بچێن و بڵاوی کردەوە هەرعەشیرەتێك چەکەکانی خۆی بدات بەحکومەت بەرامبەر بەوە دەتوانێت لەشوێنی خۆیدا بمێنێتەوە.

بۆ وەرامی ئەوجم وجۆڵەی رائدشوکت عەشیرەتی(دومانین) وهەندێك لەعەشیرەتی(ناظمیة)ئەو کۆسپ و دەزگا و ڕێگرانەی کرابوون بەهێڵی سنووری جیاکردنەوەی ئەوعەشایرانەی بەرلەمە کۆچیان پێکرابوو هەموویان ڕووخان، لەسەرەتادا سەید ڕەزا داوای لەعبدالله پاشا ئالپ

دۆغان کرد واز لەو هەڵوێستە بێنێت بۆ فشار خستنە سەر دەرسیمیەکان و لەبریتی ئەوە حکومەت دەزگایەك دامەزرێنێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە بەمەرجێك ڕێز لەهەستی نەتەوایەتی دانیشتوانی درسیم بگرێت، وەرامی عبداللە پاشا بۆ ئەو داخوازییەی سەید ڕەزا بریتی بوو لە دامەزراندن و بلاوکردنەوەی هێزەکانی حکومەت لەسەر سنورەکانی ناوچەی درسیم و فڕۆکەکانی حکومەت بۆ هەڕەشە کردن و چاوترساندنی خەڵك هەموو ڕۆژێك سەر لەبەیانیان لەدیاربەکرەوە دەهاتن و بەسەر ناوچەی درسیمدا دەفڕین.

زنار سلۆپی لەلاپەڕە/٢٠٤ی کتێبەکەیدا باسی چۆنیەتی دەستپێکردنی شەڕی کردوە کەلەبەهاری١٩٣٧داحکومەت هێزی ناردە سەر عەشیرەتی(یوسفیان)بەبیانووی لێ سەندن و کۆکۆدنەوەی چەك و سەربازێکی تورك لەکاتی پشکنیندا کچێکی کوردی فڕاندو لەئەنجامی ئەو دەسدرێژییەدا کوڕێکی سەرکردەی عەشیرەتی(فیندیك)تاقمێك چەکداری ناردە سەر ئەو هێزەی حکومەت کەچوبوە ناوچەکەو هێزەکەی حکومەت ناچار کرا ئەو ناوچەیە بەجێ بێڵێت.

ساتێك سەید ڕەزا ئیبراهیمی کوڕی نارد بۆ(العزیز) بۆئەوەی لەوێ باسی ئەوتاوانەی تورك بگەیەنێت بە عبداللە پاشا، لەگەڕانەوەیدا لەگوندی(دەشت) کە لەناوچەی عەشیرەتی (کیرغان) بوو، چەکدارەکانی رائد شوکت لەکاتی نوستندا پەلاماری ئیبراهیمیان داو کوشتیان.

(ئەوەی شایانی باسە کریس کوچرا لەلاپەڕە/٢٠٧یکتێبەکەیدا باسی کوشتنی ئیبراهیمی بەجۆرێکی تر کردوە کەووتوویەتی ساتێك ئیبراهیم

لەشاری(هـۆزات) گـەڕابوەوە سـەربازەکانی تـورك و چـەند چـەکدارێکی عەشیرەتی(گورگان)پەلاماریان دابوو کوشتبوویان.

لەئـەنجامی ئـەو کوشـتنەدا سـەید ڕەزا داوا لەحکومـەت دەکـات ئـەوی ئیبراهیمـی کـوڕی کوشـتبوو پێویسـتە بیدرێتـە دەسـتی بـەڵام رائـد شـوکت داخوازییەکـەی پشـتگوێ خسـت و بەوەشـەوە نەوەسـتا بـەڵکو فەیلـەقێکی لەدیاربەکرەوە نـارد بـۆ دەرسیم و ئـەو هێـزە هێرشـی کـردە سـەر عەشـیرەتی یوسفیان و سەرکردەی هێزەکەی حکومەت لـە(العزین) کە ئیسماعیلی حقـی ناوێـك بـوو,چـەکدارە خەڵـەتێنراوەکانی عەشـیرەتی(کیرغـان)ی بـەکار هێناوپـەلاماری ئەوناوچـەیەدرا کەسـەید ڕەزای لێبـوو(کـریس کوچـرا لەکتێبەکەیدا وتوویەتی لەم پەلاماردانەی تورکدا بۆسەر سەید ڕەزا, ڕێبەری برازای سەید ڕەزاش لەگەڵ هێزەکەی حکومەتدابووەو هـەوڵی گرتنی مـامی دابـوو). بـەوجۆرە هێزەکـەی سـەید ڕەزاو هـەموو هاوکارەکـانی پـەلاماری هێزەکـەی حکومـەتیان دالـە(خـوزات-هـۆزات)لەئـەنجامی ئـەو هێرشـەدا هێزەکەی حکومەت ناوچەی خوزاتی بەجێ هێشت.

پاش ئەو شکان وپاشەکشەیەی حکومـەت, هێـزی تـازەی یارمەتیـدەری حکومـەت لەدەرنجان وئەرزومـەوە بـەکێش کـراو فڕۆکـە دەسـتیکرد بـە بۆمبارانی هێزەکەی سەید ڕەزا.

لەگەرمەی ئەو شەڕەدا سەید ڕەزا ناوبژیکەرێکی ناردەلای عبداللە ئالْپ دوغـان وپـێی ڕاگەیانـد ئەگـەر دان بـەمافی کـوردا بنرێـت و ئەوکەسـەی ئیبراهیمی کوڕی کوشتبوو بدرێتە دەستی بەرامبەربەمانە ئامادەیە ئەو چەك وجبەخانـە و ئەودیلانـەی گیرابـوون هـەمووی بدرێتـەوە و بەریان بـدات بـەڵام عبداللە پاشا پێی لەسەر ئەوە داگرت کە پێویستە ئەو شتانە بەبێ مەرج

بدرێنەوە بەحکومەت و بێجگە لەمەش پێویستە هەشت هەزار تفەنگی ماوزەریش بدرێت بە حکومەت.

ئەمداخوازییە تازەیەی عبداللە دوغان لەسەیدڕەزا بوو بەهۆی تازەکردنەوەی شەڕو حکومەت سەرلەنوێ دەستی پێکرد بەئاگرباران و بۆردومانکردنی دانیشتوان بەبێ جیاوازی لەنێوان چەکدارو نێوان ژن و منداڵ و پیری بێتاواندا.

زنار سلۆپی لەکتێبەکەیدا چۆتەوە سەرباسی(ڕێبەر)ی برازای سەید ڕەزا کەلەگوندی(بیامە)دا دەژیا لەنزیك شاری(خوزات) کەئیعلانی بێلایەنی خۆی کرد, بەڵام لەڕاستیدا لەژێرەوە هەرلەگەڵ حکومەتدا بوو, بەپێی نەخشەی حکومەت دەچووبەڕێوەو حکومەت بەدرۆو بۆچاوبەست بڵاویان کردەوە کەوا(ڕێبەر)لەبێ لایەنیەوە بۆلایەنگری یاخی بوەکان.

ڕێبەرو تاقمەکەی چونەلای عەشیرەتی(بەختیار)ولای ئەوانەوە نامەیەکی نارد بۆ سەید ڕەزای مامی و داوای لێبوردنی لێکردو پاکانەی ئەوەی کردبوو کەتائەوکاتی پەشیمان بوونەوەیەی لەمەبەستە ناپاکەکانی حکومەت بەباشی نەگەیشتبوو.

ئەوسەرۆك عەشیرەتانەی هاوکاری سەید ڕەزا بوون بەپاکانەو بەقسەکانی(ڕێبەر)خەڵەتابوون و باوەڕیان پێکردبوو هەرچەند سەید ڕەزا لەو هەڵوێستەیان ناڕازی بوو پەسەندی نەکردبوو.

بەو جۆرە(ڕێبەر)و تاقمەکەی بەو فرۆفێڵە چوونە پاڵ هێزەکەی(علی شیر-علی‌شیرۆ) کەیەکیك بوو لەسەرکردەکانی هۆزەکەی سەید ڕەزاوڕێبەرلای ئەوان واخۆی پیشاندابوو نیشتمانپەروەرو هاوکاری ڕاپەڕیوەکان بەڵام زۆری پێنەچوو ڕوون بوەوە ئەمەش هەریەکێك بوە

لەنەخشەو فرۆفێڵەکانی عبداللە ئاڵپ دوغان بۆئەوەی لەڕێگەی(ڕێبەر)ەوە بەهەر نرخێك بێت علی شیروی ئازاو نیشتمانپەروەر لەناو ببات کەیەکێك بوو لەهاوکارە پاك‌و دڵسۆزەکانی سەید ڕەزاو شۆڕشگێڕێکی ئازاو نەبەردی کورد بوو.

بەرلەوەی بچینەسەر باسی چۆنیەتی سەرگرتنی ئەو نەخشەیەی عبداللە ئاڵپ دوغان‌و کوشتنی علی شیرۆ.

بەپێویستم زانی کورتە باسێکی علی شیرۆ بخەمە پێش چاو بەپێ‌ی ئەو سەرچاوانەی لێی دواون.

کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١دەربارەی علی شیرۆ وتوویەتی:

((علی شیرۆ لەناوچەی(کوجگیری)لەدایك بوەوهەروەکو سەیدا ڕەزا لەعەشیرەتی (حەسەنان)بوەو سەرەتا لەقوتابخانەی(سیواس)دا خوێندویەتی‌ولەزەمانی سوڵتان عبدالحمیددا وەکو شاعیرێکی کورد هەستی نەتەوایەتیی خۆی بەشیعردەربڕیوەو مرۆڤێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیرو ئەدیب بوەو بوەبە(مرزا-کاتب)وموستەشاری مصطفی بەگی سەرۆکی عەشیرەتی کوجگیری‌و پاش ئەوەی مصطفی بەگ لەلایەن حاکمی درسیمەوە لەسێدارە درا کوڕەکەی مصطفی بەگ بووبەجێگری باوکی‌و علی شیرۆش هەروەکو ڕابەرێك‌و سەرپەرشتیکەرێکی دڵسۆز چاودێریی کوڕەکەی مصطفی بەگی کرد.

علی شیرۆ لەناو عەشیرەتی کوجگیریدا دەستەلاتێکی زۆری هەبوەو هەمیشە هەوڵێکی زۆری داوە لەناو کوردا یەکێتی‌و تەبایی هەبێت‌و لەساڵی١٩٢٠دا یەکێك بوە لەئەندامانی جمعیتی(کوردستان تعالی

جمعيتــی)و هــەوڵی داوە لقێکــی ئــەو کۆمەڵــە لەدرســیمدا دامــەزرێنرێت و لەشۆڕشــی کوجگیریــدا هاوکــاری شۆڕشــگێڕەکان بــوەو لەســەرئەوە لەلایــەن حکومەتی تورکەوە بڕیاری لەسێدارەدانی دەرچوە.

دەربارەی شاعیریتی علی شیرۆ کەکریس کوچرا باسیکروە,قدری جمیل بەگیش لە کتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٧باسی شعرێکی علی شیرۆی کردوە کە وەکو مەلحەمەیەك بەو شعرە باسی شۆڕشی کوجگیری کردوە دەربارەی کوڕەکەی مصطفی پاشا کەکریس کوچرا باسی کردوە کەبوە بەجێگری باوکی و لەکتێبەکەیدا ناوی نەهێناوە هەروەکو لەباسی سێهەمی بەشی نۆهەمی بەرگی دوهەمدا (زنار سلۆپی) وتوویەتی ئەوکوڕەی مصطفی پاشا-یامصطفی بەگی درسیمی ناوی (علی شان)بوەو لەوبەرگەدا لەباسی دووهەم و سێهەمی بەشینۆهەمدا باسی ڕاپەڕینی یەکەمی درسیم و شۆڕشی کوجگیری کرا وەلەساڵانی(١٩٢٠و١٩٢١)دا هەروەکو کریس کوچرا باسیکروە علی شیرۆ لەشۆڕشی درسیمی دوهەمدا (١٩٣٦-١٩٣٨ ) تەنها هەرخەریکی کاروباری شۆڕش و پێشمەرگایەتی نەبوە بەڵکو خەریکی نوسین و بڵاوکراوەش بوە بەشیعرو بەووتار بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەی کوردو بزواندنی هەستی نەتەوایەتی لەناو هاوڵاتیاندا.

دەربارەی چۆنییتی کوشتنی علی شیرۆ و لەلایەن ڕێبەرەوە بۆ بەجێهێنانی نەخشەکەی ئالپ دوغان هەروەکو زنار سلۆپی باسیکردوە, ساتێك سەید ڕەزا بڕیار دەدات علی شیرۆ بنێرێت بۆلای نوێنەرانی دەوڵەتە گەورەکان بۆئەوەی جەورو ستەم و تاوانەکانی تورك بەرامبەر کوردیان بۆ ڕوون بکاتەوە (وەکو وتمان بەر لەمە نامەیەکی بەفرنسزی

ناردبوو بۆ وزیری دەرەوەی بریتانیاو نامەکەیان بلاوکردەوە,بەلام دیارە هیچ وەرامێکی لەو ڕووەوەپێ نەگەیشبوو بۆیە علی شیرۆی ناردبوو).

ساتێك ڕێبەر کەبەناو لەحکومەت جیا بوبووەوەو چوبوە لای عەشیرەتی(بەختیار)ی سەر بەسەید ڕەزا, ڕێبەر خۆی دەگەیەنێتە لای علی شیرۆ کەخەریکی خۆ ئامادەکردن دەبێت بۆ ڕۆیشتن و پێی ڕادەگەیەنێت کەماوەیەکە زۆر ماندوەو حەزدەکات سەری لێ بدات و لەکاتی خۆ ئامادەکردندا بۆ ڕۆیشتن کەخەریکی ئامادەکردنی خواردن دەبن, ڕێبەر بەدەمانچەکەیەوە پەلاماری علی شیرۆ دەواو دەیکوژێ, هەرچەندە ژنەکەی علی شیرۆ کەناوی (ظریفة) بوە دەست ئەداتە دەمانچەو چەند گوللەیەك بە ڕێبەرروە دەنێت بەلام گوللەکانی بەر ڕێبەر ناکەوێت بەلکو بەر پیاوێکی ڕێبەر دەکەوێت کە لەگەلیا هاتبوو بۆلای علی شیرۆ, ڕێبەر ژنەکەشی دەکوژێت و سەری هەردوکیان دەبڕێت و دەیان بات بۆلای تورکەکان و بەمە بۆ ئێجگاری خیانەتی ڕێبەر ئاشکرا دەبێت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە دەربارەی چۆنیەتی کوشتنی علی شیرۆ بەو شێوەیەی زنار سلۆپی باسیکردوە کەپرسیارەکەشی بریتیەلەوەی تۆ بڵێی علی شیرۆ سەرکردەوئازاونەبەردی کورد,خیانەتەکەی پێشوو ڕێبەری لەبیر چووبێتەوەو هەروا بەئاسانی تەنها خۆی‌و ژنەکەی لەوکاتەدا لەگەڵیابوونبن وهیچ چەکدارێك لەوکاتەدا لەوێ نەبووبێت کە ڕێبەرو پیاوەکەی بەئاسانی توانی بوویان خۆی‌و ژنەکەی بکوژن‌و سەریان ببڕن‌و سووك‌وباریك پاش ئەوتەقەی دەمانچانە بەئاسانی ڕزگاریان بووبێت کەئەمە شتێکە جێگەی گومانەو کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا باسی کوشتنی علی شیرۆی بەشێوەیەکی تر کردوە کە وتوویەتی:

((لەمانگی تموزی/١٩٣٧سەید ڕەزا داوای لەعلی شیرۆ کرد بچێتە ئێران وەیا عراق بۆئەوەی لەوێوە پیوەندی بە ئینگلیزو فرنسیەکانەوە بکات‌و داوایان لیٚ بکات ببن بەناو بژیکەر بۆ دۆزینەوەی چارەسەری کێشەی نێوان کوردو تورك‌و بۆئەوەی ئەو دەوڵەتانە کارێکی وابکەن لەوەزیاتر تورکەکان کوردستان کاول نەکەن‌و هەرئەوشەوەی بەتامابوو بکەوێتەڕێ، بەپێی پیلانی عبداللە ئاڵپ دۆغان لەناوبردنی علی شیرۆپێسیرا بەرێبەرو ساتێك علی شیرۆ لەئەشکەوتی(ئاغداد)دەبێت بەدەستی ڕێبەر دەکوژرێت‌و بەکوشتنی ئەو شۆڕشی کورد زیانێکی زۆری لیٚ کەوت‌و شۆڕشگێڕێکی ئازاو نەبەردی لەکیس چوو.

زنار سلۆپی لەلاپەڕە/٢٠٧ی کتێبەکەیدا بێجگە لەو خیانەتەی ڕێبەر کردبووی باسی خیانتێکی تری کردوە کە(خضر ئەحمەد)ناوێك بەرامبەر(شاهێن ئاغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی بەختیاری کوشتبوو کەباسی کوشتنەکەی بەم جۆرە کردوە:

((لەگەرمەی شەڕدا لەناوچەکانی عەشیرەتی بەختیار. سەرۆکی ئەو عەشیرەتەکە(شاهێن ئاغا) بوو ساتێك ویستی ماندوویەتی خۆی دەربکات‌و نەختێك بحەسێتەوە (خضر ئەحمەد) کەئەویش سەرکۆك عەشیرەتی ناسراو بووە ڕایسپارد لەماوەی پێشوودانیا لەجیاتی ئەو کاروبار ببات بەڕێوە، بەلاّم (خضر ئەحمەد) هەمان ڕێبازی خیانەتی ڕێبەری گرتەبەرو لەکاتی نوستندا شاهێن ئاغای کوشت‌و کەللەسەرەکەی کرد بەدیاری دەستی خۆی‌و بردی بۆ تورکەکان کەلە (خوزات)بون تەنها بۆئەوەی حکومەت لیٚی خۆشبێت، بەلاّم برایەکی شاهێن ئاغا بەهاوکاری هەندێك لەخزمەکانی

ئابلوقـەی(خـوزات)یانـداو توانیبویـان خضـر ئەحمـەدیخانن و ئەوانـەش کەلەگەڵیابون بیانکوژێت.

عەشیرەتی بەختیار هەرچەند شاهێن ئاغای سەرۆکیان کوژرابوو بەڵام هـەتا ماوەیـەك دژی حکومـەت ڕاوەسـتان و خۆیـان گـرت هـەتا لەدواییـدا حکومەت بەپیلان و بەناردنی هێزێکی گەورە توانی ناوچەی ئەم عەشیرەتە بگرێت و بیخاتەوە ژێر دەستەڵاتیخۆی.

هەروەکو زنار سلۆپی باسیکردوە, پاش ئەوەی حکومـەت لـە ئەرزنجان و ئەرزڕوم ودیاربکرەوە هێزێکی زۆری بەکێش کردو ژمارەی خۆفرشو خائنان ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لەپەرەسـەندندابوو ئیتر سـەید ڕەزا ناچاربوو ناوچـەکەی خـۆی بـەجیٚ بێڵێـت و ڕووبکاتـە ناوچـەی عەشـایرە بیٚلایەنـەکان بەئومێـدی ئـەوەی بتوانێـت بیانکـات بەلایـەنگرو بـەهاوکاری شـۆڕش دژی تـورك,بـەڵام سـوپای تـورك دەمـی ئەشـکەوتێك کەلـەلاپاڵی چـیای(توریکـداغ)و دۆڵـی(دیسـکور)دابـوو کەبـە هـەزاران ژن ومنـداڵی ئـاوارەو دەربەدەرووبرسـی لـەتاو بۆردومـانی فڕۆکـەو تۆپـەکانی سـوپای تـورك خۆیـان تیـا حەشـاردابوو,حکومـەت ئـاگرێکی گـەورەی لـەدەرگای حەوشـەکەدا کـردەوەو ئەوانـەی لـەناویابوون بـەئاگرو دوکـەڵ سـووتان و خنکـان و هەروەکوگێڕاویانەتەوە هەندێك بەو ژن وکچانەی لەناو ئەو ئەشکەوتەدا بوون لەترسـی دەسـدرێژیکردنی سـەربازەکانی تـورك لەبەرزاییەکانـەوە خۆیـان هەڵدێرابوە خوارەوەو ئەو مردنەیان لاباشتر بوە وەك لـەوەی بکەونـە دەست ئەو تورکە دڕندانەی بەو بیٚشەرمیەوە ڕەفتاریان لەگەڵا کردبوون.

کریس کوچرا لەلاپـەڕە/٢٠٥ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١جگـە لەوباسـەی دەربارەی علی شیرۆ باسیکردوەو بەرلەمـە خستوومانەتە پێش چاو, باسی

هەنــدێ شــتی تــری تۆمــار كــردوه كەهەنــدێكی لەكتێبەكــەی نــوری درسیمی یەوە(درسیم كوردستان تاریخندە)وە وەرگرتوه كە هەندێ بۆچوونی لەگەڵ سەرچاوەكانی تردا یەكناگرێتەوە, بۆنمونە..وتوویەتی: عبدالله ئاڵپ دۆغان كەفەرماندەی هێزەكانی حكومەت بوو لەناوچەی(العزیـن)هەوڵیدا چاوی بەسەید ڕەزا بكەوێت و چاویان بەیەكتری كەوت و داوای لەسەیدڕەزا كرد كەپێویستە دووسەد هەزار تفەنگ بدات بەحكومەت كەلام وایە ئەمە دەبێ هەڵەیەكی چاپەمەنی بێت, چونكە نەك سەید ڕەزا بەڵكە حكومەتی توركیش بەهەموو سوپاكانی(٢٠٠هەزار چەكی نەبوە كەداوای ژمارەیەكی وا لەســــەید ڕەزا بكــــات و سەرچــــاوەكان تــــەنها باســــی داواكردنــی(٢٠٠)چـەكیانكردوەو لـەوەش نـەدواون كەسـەید ڕەزا چـاوی بەعبدالله ئاڵپ دۆغان كەوتبێت چونكە وەكو زنار سلوپی باسیكردوە سەید ڕەزا لـەنیوەی ڕێگایـدا بـۆلای عبـدالله ئاڵـپ دۆغـان هەسـتی بەفروفێڵی ئـەو كردبوو بۆیە گەڕابوەوەو چاویان بەیەكتری نەكەوتبوو.

بێجگـە لەمـە كـریس كوچـرا وتوویـەتی سـەید ڕەزا هـەوڵی دابـوو نـوری درسـیمی بنێرێـت بـۆ ئـەوروپا بـۆ ڕونكردنـەوەی كێشـەی كـورد لای ئـەو دەوڵەتانە.

كریس كوچرا دەربارەی دەسپێكردنی شۆڕش وتوویەتی:

ئەگـەر شۆڕشـەكەی درسـیم لەسـاڵی١٩٣٦دا دەسـتی پێكـرد بـوو بـەلام لەزسـتانی سـاڵی١٩٣٦-١٩٣٧دا هـیچ پێكـادان و ڕووبـەڕوو بونەوەیـەكی ئـەوتۆ ڕووی نـەدابوو, بـەلام كاتێـك بـەفری زسـتان توایـەوە توركـەكان دەستیانكرد بەجم وجۆڵ و بەبیانووی پشكنین و چەك داماڵین دەستیانكرد بەپشكنینی ناوچەی(مازگێر)

کریس کوچراش باسی کوشتنی ئیبراهیمی کوڕی سەید ڕەزای کردوە لەلایەن حکەمەت و چەکدارەکانی عەشیرەتی(گورگان)ەوە کەئەم کوشتنە ئەوەندەی تر بارودۆخی ناوچەکەی ئاڵۆز کرد.

دوای ئەوەی حکومەت هێزێکی زۆری تازەی تری نارد, شۆڕشگێڕانی کورد ناچار بوون بەرەو باشوور پاشەکشە بکەن و لەوشەڕەدا شێخ عبدالرحیمی برای شێخ سعیدی پیران کەبوبووبە هاوکاری شۆڕشگێڕانی درسیم کوژرا(حسن عرفە لەکتێبەکەیدا سەرچاوە/٥٢وتوویەتی لەوشەڕەدا کوڕێکی(جمیل شەیدا)ش لەگەڵ سیدعبدالرحیمدا شەهید کراوە).

دکتۆر عزیز شمزینی لەلاپەڕە/١٠٢ی کتێبەکەیدا سەرچاوە/٤١ دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی شۆڕشی دوهەمی درسیم وتوویەتی:سەر ڕای ئەو هەموو هەڕەشەو چاوترسانن و تیرۆرکارییەی تورکەکان بەرامبەر کورد نواندبوویان, لەساڵی١٩٣٧دا لەناوچەی درسیم دا دەستکرا بەڕاپەڕین.

دکتۆر شمزینی لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەم ڕۆژنامانە کردوە کەباسی شۆڕشەکەی درسیمیانکردوە, هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو ڕۆژنامانەی ئەو باسی کردون بخەینە پێش چاو کە هەندێکیان بریتی بون لە ڕۆژنامە تورکیەکانی سەربە حکومەت و هەندێکیشیان پەیوەندیان بەحکومەتی تورکەوە نەبوە.

دکتۆر شمزینی بەرلەوەی بچێتە سەربڵاوکراوەکانی ئەو ڕۆژنامانە کەدەربارەی شۆڕشی درسیم دواون ئاماژەی بۆ کتێبەکەی(ڕامبۆ)کردوە کەلەپاریس بەزمانی فرنسی لەساڵی١٩٤٧دا چاپیکردوە لەژێر ناوی(کورد و یاسا)ولەوکتێبەدا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی(تان)ی تورکی کردوە کە وتوویەتی:سەبارەت بەکوردە یاخی بوەکان پێویستە بەو پەڕی

توندوتیژییەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت و هەموویان لەناو ببرێن و پێویستە ڕاپەڕینی درسیم بۆ ئێجگاری خامۆش بکرێت و دانیشتوەکانی یالەناو ببرێن. یا ئاوارە بکرێن و دووربخرێنەوە بۆناوچە جیاجیاکانی شوێنە تورك نشینەکان بۆ ئەوەی دانیشتوانی درسیم بەتەواوەتی بکرێن بەتورکی ڕەسەن و لەشوێنی ئەوان تورك نیشتەجێ بکرێت))

ڕۆژنامەی جمهوریتی تورکیش بەرلەوەلە١٩٣٧/٠٤/١٦دا بڵاوی کردبووەوەکە ژمارەی چەکدارەکانی کورد لە پێنج هەزار چەکدار پێکهاتوە.

بەرلەوەی شۆڕشەکە دەست پێ بکات وەکو دکتۆر شمزینی ئاماژەی بۆ کردوە. دانیشتوانی درسیم داوایان لەکاربەدەستانی حکومەت کردبوو سوپا و جەندرمەکانی حکومەت لەناو چەکەیان بکێشرێنەوەو دووربخرێنەوەو واز لە پرۆژەی هێڵی شمندو فەڕ بێنن بەنیازی ڕێگا خۆ شکردن بۆ گواستنەوەی سەربازو واز لەسەندنی ئەوباج و سەرانە تازانە بێنن کەلەو دواییەدا بڕیاریان لەسەر دابوو, لەگەڵ چاکردنی باری دەرامەدی دانیشتوانی ناوچەکەو دامەزراندنی دام ودەزگایەکی تازە کە بەپێی ئەوە ئۆتۆنۆمی بسەلمێنرێت بۆ کورد, بەلأم کەمالیەکان بە پێچەوانەوە سووربوون لەسەر بەجیهێنانی نەخشەکەی خۆیان بۆ لەناو بردنی کوردو بۆ ئەو مەبەستە(٣٠هەزار) چەکدارو سەربازیان ئامادە کردو ناردیان بۆ ناوچەکە.

ڕۆژنامەی(العمل القومی) کەلە سوریا دەردەچوو ووتارێکی بلأوکردەوە دەربارەی ئەو پەیمانەی لەنێوان(ئێران و عێراق و تورکیا)دا مۆر کرابوو(کەمەبەستی پەیمانی سعداباد بوە کەلەساڵی١٩٣٧ دا مۆر کرابوو کەناوەڕۆکەکەی بێجگەلە مەبەستی ڕێگەگرتن لەبلأو بوونەوەی بیروباوەڕی

مارکس و دەستەلآتی سۆڤیەت, پەیمانەکە دژی هەموو بزووتنەوەیەکی کورد ئاڕاستە کرابوو کەلەو ڕۆژانەدا حکومەتی بریتانیا لەهەموو کاتێك توندو تیژ تربوە بەرامبەر هەر بزووتنەوەیەکی کورد لەو ڕۆژانەدا ڕوویدات).

ڕۆژنامەکە باسی ئەوەی کردوە کە ساتێك شۆڕشی درسیم دەستی پێکردمندالآن و کچان و ژنانی کورد هەموو بەپەرۆشەوە هەریەکەیان بەشێوەی خۆی بەشداریی تیادا کردوە و هەموویان ئازایانە بڕیاریاندا سەنگەری نەبەردیی خۆیان چۆڵ نەکەن.

ڕۆژنامەی(الاخبار)یش کەلەو ڕۆژانەدا هە لەسوریا دەرچوە نوسیویتی.

((سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان ڕایدەگەیەنن کەوا شۆڕشەکەی درسیم هەتا بێت زۆرتر کلّپە دەسێنێت و بەهێزتر دەبێت و شۆڕشگێڕانی کورد سوپای تورك ناچار دەکەن هێزەکەیان بکێشنە دواوە و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵیشیان لێ کەوتوەو لەسەرانسەری کوردستان بلأوکراوەی شۆڕشگێڕانە بلأوکراوەتەوە کەباسی ئەوەی تیادا بلأوکراوەتەوە کەکورد ئەو شۆڕشەی بۆ ڕزگار کردنی کوردستان بەرپاکردوە دژی جەوروستەمی تورکی داگیرکەر دەربارەی چۆنیەتی دەسپێکردنی شۆڕشی درسیم, هەرلەو ڕۆژانەدا ڕۆژنامەی(الشرق)کە لەبێروت دەرچوە نوسیویتی:

((سیازدە ساڵە میللەتی کورد(مەبەستی لە شۆڕشی پیرانەوەیە) بۆ ڕزگار بوون و بۆوەدەسهێنانی مافەڕەواکانی خۆی دەستی داوەتە چەك و

له پێدەشتەکانی(موش)و چیاکانی ئاراراتیشدا خەباتێکی چەکدارانەی سەخت دەکەن و دلێرانە دژی تورکە داگیرکەرەکان تێدەکۆشن)).

دوکتور شمزینی لەکتێبەکەیدا باسی درۆو دەلەسەی تورکەکانی کردوە دەربارەی ئەو شۆڕشە وتوویەتی:

(( ئەگەر چی کەمالیستەکان بەتەواوەتی دەیانزانی و دڵنیابوون لەوەی شۆڕشگێڕەکانی درسیم لەشۆڕشەکەیان تەنها هەرپشتیان بەخۆیان بەستبوو, هیچ لایەکی بێگانە یارمەتی کوردی نەدابوو, کەچی تەنها بۆ پینە کردنی تاوانەکانی خۆیان و بۆپاکانەکردن لەو درندەیەتی و خوێنڕێژییەی بەرامبەر کورد دەیانکرد بڵاویان دەکردەوە سۆڤیتەکان یارمەتی کوردی درسیم دەدەن)).

ئەوەی سەرنج ڕاکێشەرە لەو بڵاوکراوە پڕ درۆو دەلەسانەی تورك ئەوەیە, تورکەکان لەگەڵ ئەوەشدا کاتی خۆی پەیمانێکی دۆستانەیان لەگەڵ سۆڤێتدا بەستووکە ناوەڕۆکەکەی بەئاشکرا دژی هەموو بزووتنەوەیەکی کوردبن وەکو لە زۆر شوێندا دەربارەی ئەمە دواوین, بەلاّم زۆری پێنەچوو کەمالیەکان گێڕیان گۆڕی و بەئاشکرابوون بەوابەستەی دەوڵەتە ئیمپریالزمەکان و مۆرکردنی پەیمانی سعداباد شان بەشانی ئێران و عراق کەبەپێی نەخشەیەکی تایبەتی ئەو دەوڵەتانە بەتایبەتی هی حکومەتی بریتانیا, ئیتر تورکەکان لەوە نەدەسڵمینەوە گەلێکی درۆو دەلەسەی وا دژی سۆڤێتی دۆستی کۆنیان و نەیاری تازەیان بڵاوبکەنەوە)

دکتۆر شمزینی لەباسەکەیدا دەچێتەوە سەرباسی کتێسبەکەی(ڕامبۆ)کە باسی هەڵوێستی تورکی کردوە لەو شەڕەدا,

وتوویەتی سوپای تورك تەنها بەکوشتنی چل هەزار کەس تێریان نەخوارد بەڵکو دەرگای ئەشکەوتەکانیشیان بەتاشە بەرد هەڵچنی کەلەناویانا هەزاران لەو سەرماو سۆڵەدا بەناچاری خۆیان تیادا شاردبوەوەو بەهەزاران ژن و مندالی بێ تاوانیان لەناوبرد... ئەمە هەرچۆنێکی ناو ببرێت بەلام لەلای تورکەکان کەخۆیان بەپێشکەوتوو تردا دەنێن ئەو ڕەفتارەی خۆیان بەشێکی ڕەوا زانیوە.

شمزینی ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی(ئەقشام)ی تورکی کردوەکە دەربارەی شۆڕشی درسیم نوسیوویەتی:((کوردەکانی درسیم دوبارە لەساڵی١٩٣٨دا ڕاپەڕین و دەستیانکردەوە بەداواکردنی ئەو داخوازییانەی بەمافی خۆیان دەزانی و بەرامبەر بەم هەڵوێستەیان سوپای حکومەت هەموو ناوچەکەی پاککردەوەو هەمووگرووپە یاخیبوەکانی ڕاماڵی.

لەدوای شکستی شۆڕشەکەی درسیم لەساڵی١٩٣٨دا وەزیری کاروباری ناوخۆی تورکیا لەووتارێکیا بەشانازی و بەلووت بەرزییەوە وتبووی:

((ئیتر لەمەودوا لەتورکیادا شتێك نەماوە پێی بوترێت مەسەلەی کورد))

بەلام بەرامبەر بەو بۆچوونەی ئەو وەزیرە، ڕۆژنامەی(ئیکۆنۆمیست)ی ڕۆژی ١٦/ی ئایاری/١٩٤٦(یەعنی دوای هەشت ساڵ شکستی شۆرششەکەی درسیم) وتوویەتی:

((لەوساڵەوەکە تورکەکان بەڕەسمی بلاویان کردبۆوە کە ئیتر شتێك نیە پێی بوترێ مەسەلەی کورد، ئەم قسەیە مەگەر دوا ڕۆژ ساغی بکاتەوەو بزانرێت ئایا گەلی کورد لەتورکیادا وەکو هێزێك ماوە یانەماوە)).

هەرچەند تورکەکان لەساڵی١٩٣٨دا بلاویانکردبوەوە شۆڕشی درسیم لەناوبراوە، بەلام هەر خۆیان لەساڵی١٩٣٩دا خۆیان بەدرۆ خستەوە پاش

ئـەوەی ڕۆژنامــەی(ئولــوس)ی تــورکی بــڵاوی کــردوە کــەوەزیری نــاوخۆ لەپەرلمانـدا ڕایگەیانـد ئیمـڕۆ یـاخی بوونەکـەی(تـونجلی)لـەناوبرا. دەربارەی چۆنیەتی دەسپێکردنی شـۆڕش لـەکۆتایی ئـەم بەشـی سـیٚهەمەی درسیم باسێکی دورودرێژ ئەخەینە پێش چاو کەکاتی خۆی لـەگۆڤاری(NOKTA-نۆکتـا)ی تورکیـدا لـەڕۆژی٢٨/٠٦/١٩٧٨دا بڵاوکراوەتـەوە یـەعنی نزیکـی پـاش پـەنجا سـاڵ بەسـەر شۆرششـەکەی درسیمدا ئەوباسـە لەلایـەن(دکتـۆر جبـار قـادر غفـور)ەوە لەتورکیـەوە کـراوە بـەکوردیو بـەپیتی لاتینـی لـــەگۆڤاری(پێشـــەنگ)ی ژمـــارەی١٥/یسـَـــالی١٩٨٨لـــە ســـتۆکهۆڵم بڵاوکراوەتـەوەو(حسـن کـوفی)ش کردویـەتی بەشـێوەی کرمـانجی ژوررو، لەپاشـکۆکەیدا ووشـەگرانەکانی ئەوباسـەی کـردوە بەعربی بـۆ ئاسـانکردنی تێگەیشتنو لەگۆڤاری(ڕۆشنبیری نوێ)ژمارە/١٢٦ی ساڵی١٩٩٠داکەلەبغداد دەردەچێت ئەمەی حسن کوفی بڵاوکراوەتەوە, بەپیٚی نوسینەکەی گۆڤاری نۆکتا ووتراوە:

((شـاری درسـیم کـە ئیمـڕۆ ناوەکـەی کراوەبـە (تـونجلی), دەکەوێتـە خوارووی ڕۆژهەلاٚتی تورکیاو لەساڵی١٩٣٧دا ڕاپەڕینێکی تیـادا بەرپاکراوە کەهەتا نزیکی ساڵی١٩٣٨ درێژەی کێشاوە بەسـەر کردایەتی(سەید ڕەزا)ی سەرۆکی عەشیرەتی(عباسـیە)یکورد(بەرلەمـە لەباسـی ژیـانی سـەید ڕەزا دا هەندیٚ سەرچاوە وەکو باسمـان کـردوە بـەجۆرێکی تـر باسـیانکردوە, نوری درسـیمی وتوویـەتی سـەید ئیبراهیمـی بـاوکی سـەید ڕەزا لەعەشـیرەتی حەسەنانو حسن عرفەش وتوویەتی لەخێڵی عباس ئوشاقی بوە).

گۆڤاری(نوکتا)لەسەری دەڕواو دەڵێت:

هەروەکو چۆن شەڕی یەکەمی جیهانی بەهۆی کوشتنی وەلی عەهدی نمساوە دەستی پێکردو هەروەها ڕاپەڕینی شۆڕشی درسیمیش لەسەر شتێکی وا دەستی پێکرد کە ساتێك لەبەهاری ساڵی(١٩٣٧)دا ئەو پردە لەتەختە دروستکراوەی لەسەر ڕوبارێك دروستکرابوو لەلایەن چەند کەسێکی نەناسراوە سووتێنرا, سووتاندنی ئەو پردە بووبەهۆی ڕووبە ڕوو بوونەوەی کوردو تورك‌و لەئەنجامی ئەم شەڕەدا سەید ڕەزاو هاوکارەکانی کە (١٣کەس)بوون بەفرۆفێڵ‌و بەپێی نەخشەیەکی تایبەتی گیران‌و لەڕۆژی(١٩٣٧/١١/١٨)دا هەڵواسران.

لە ڕاستیدا شۆڕشەکە بەهەڵواسینی ئەوانە کۆتایی پێ نەهات چونکە لەساڵی(١٩٣٨)دا لەناوچەی(KALANقالان)داگەلێك ڕووداوی تر ڕوویدا وەو سەرەك وەزیرانی تورکیای تازەی ئەو ڕۆژانە کە (جلال بایار)بوو بەدەمی خۆی باسی کێشەکەی بەم جۆرە کردوە:

هەرچی کراوەو ڕوویداوە پێویستە لەسەرمان کێشەی درسیم کۆتایی پێ بهێنین‌ولەم ساڵەدا(مەبەست لەساڵی١٩٣٨)نەخشەی سەرەکیی ئێمە بریتیە لە ئابڵوقە دانی‌درسیم لەهەموولایەکەوە.

گۆڤارەکە دەڵێت: ئەو شۆڕشەی تاساڵی(١٩٣٨)درێژەی کێشابوو لەئەنجامیا حکومەت زیانێکی زۆری گیانی‌و ماڵی لێکەوت‌و هەرەسهێنانی نەفسی زۆر زیاتر بوو لەو زیانانەی لەشەڕی یۆناندا لەتورکەکان کەوتبوو))

نوسەری گۆڤارەکە نوکتا بەدووروودرێژی باسی ڕەفتارو دڕەندە یەتیی تورکەکانی کردوە لەو شەڕەداو وتوویەتی:(هەندێ نوسەرەو ڕۆژنامەنوس هەروەکو سەرباز لەو شەڕەدا بەشداریانکردبو بۆ دامرکانەوەی ئەو شۆڕشەو هەروەکو(محسن باتۆر)کەنووسەرێکی تورك بوە, لەکتێبەکەیدا کەبەناوی

(بیرەوەریـــەکانی خـــۆم)ەوەبـــڵاوی کردۆتـــەوەو(ناشـــد ئولـــوغ)یـــش لـــە کتێبەکەیدا(تونجەلی لەشارستانێتی چۆتە دەر)لەگەڵ هەندێك باسی تر کەلـەدەمی خـەڵکی درسـیمەوە وەرگـیراوە وەکـو(ولی جلیـك)و (شـوکری بایکـەر)و (محمـد کانگوتـان)و ئافرەتێـك کـەناوی(منـز ئاقایـان)بـوە کـە ئـەو ڕۆژانە بەدەمی خۆی باسیکردوە کە وتوویەتی لەو ڕۆژانەدا ژنێکی جوان‌و شـۆخ‌و شـەنگ بـووم کـە سـەربازە چـەکدارەکانی کمالیـەکان هاتنـە نـاو گوندەکـەمان‌و لەسـەرەتادا ئـەو سـەربازانە هیچیان لەکـەس نەکردو ئێمەش ئێمەش لەنیازو مەبەستی هاتنیان نەگەیشتبووین‌و ئەوانە لەناو خۆیان بەزمانی تورکی لەگەڵ یەکتردا ئەدوان‌و ئێمە لـێ یان تێ‌نەدە گەیشتین‌و کـە هاتنـەناو گوندەکـەمان هـەموو دانیشـتوانی گوندەکـەیان کـۆکردەوەو بـەژن‌و منـداڵ‌و پـیرو گەنجـەوە کـەژمارەمان (٢٠٠–٣٠٠) کـەس دەبـوو هەموومانیان بردە ئەو بەری ڕووباری(ڕیزە مەنتاش)و لـەوێ پـێ‌ی ووتین ئێمـە بـۆ ئـەوە هـاتوین چـەکەکانتان لێ بستێنین‌و دوای ئـەوە هـەمووتان بەرئەدەین, بەڵام هێشتا لەڕووبارەکە نەپەڕیبووینەوە هەموومانیان دایە بەر گوللـەو مێردەکـەی مـن کـوژراو لەهـەموو (٢٠٠–٣٠٠)کەسـە تـەنها سـێ‌کەسمان ڕزگارمـان بـوو, هەرسـێکمان بۆمـاوەی سـێ ڕۆژ بێ‌نـان‌و خـۆراك لـە نـاو لاشـەی کوژراوەکانـا دەسـوڕاینەوەو هـۆی ئـەو ڕزگـار بوونـەشمان ئـەوەبوو خۆمـان هەڵواسـیبوو بـە لقێکـی ئـەو دارەوە کەلەناوەڕاستی ئاوەکـەدابوو, بـەخۆ هەڵواسـراوی خۆمـان مـاتـداو بـەوە ڕزگارمان بوو.

دوای ئەمـە گۆڤـاری نوکتـا دەچـێتە سـەر باسـی یاداشـتی(شـوکری بایکەر)کەباسی خۆی کردوەو وتوویەتی:

لەساڵی(١٩٣٧)دا ڕێگەیەکی سوپایی دروستکرا کەمن لەو ڕۆانەدا تەمەنم(١٩-٢٠)ساڵ بوو,لەماوەی سێ ڕۆژدا ئەو ڕێگایە دروستکراو سوپای تورك لەکردنەوەی ئەو ڕێگەیەدا هەرچیەکی هاتە بەردەم هەمووی کاولکردو لە پێشدا دوو فڕۆکە لەمانگی گولانی(١٩٣٧)دا بەیاننامەیەکی بلاو کردوە بۆ ئەوانەی بەیاخی بوو ناو بردبوون, بۆئەوەی هەموو خۆیان بدەن بە دەستەوەو بە پێچەوانەوە هەموو شوێنو ناوچەکانیان بۆردومان دەکرێت.

لەیاداشتەکەی(محمد کانگوتان)یشدا کەخەڵکی ناوچەی درسیم بوو وتوویەتی:

لەساڵی(١٩٣٧)دا تەمەنم یازدەساڵ بوە,عبداللە پاشا ئاڵپ دوغان لەلایەن حکومەتەوە دەستەلاتێکی زۆری پێدرابوو, بۆی هەبوو بڕیاری کوشتنی هەرکەسێك بدات کەبە پێویستی بزانیایەو بەیانێکی بلاوکردەوە بۆ هەموو دانیشتوان کە پێویستە چەکەکانیان بدەن بەحکومەت.

گۆڤاری نوکتا ئاماژەی بۆ دوکیو مینتیکی سەرکردەی سوپا کردوە کەناوی(جمال بەگ)ی والیی دیار بکرێن کە بەپێ ی ئەو دوکیو مینتە جمال بەگ ڕاپۆرتێکی ناردوە بۆ وەزیری ناوخۆی تورکیا کە تیایا ووتراوە:

((خەڵك لەناوچەی درسیمدا زۆر نائارامنو زۆربەیان لەترسدا خۆیان چەکدار کردوە, لەبەرئەوە بڕیاردرا دەبێ تونجلی بخرێتە ژێر کونترۆڵەوە بۆ سەرگرتنی ئەم مەبەستە لەناوچەکانی(کاهموت,سن,قەرە ئوغلان,ئاموتکا,داترك,حیدران) بنکەی سوپایی دامەزرێنرا لەگەڵ

دامەزراندنی قەزایەك لە (Qulan)کەئەمانە ترسێکی زۆری خستۆتە دڵی ئاغاو سەرۆکی عەشیرەتەکانەوە.

سەرۆك عەشیرەتی(ئەباس-عباس)ی ژوورو لەگەڵ عەشیرەتی(هیدران-حیدران)و(دەمان)و قراشیان), ئەمانە هەموویان لەناو خۆیانا کۆبوونەتەوەو پەیمانێکیان دژی حکومەت دەرکردوە, هەروەها ئەویاسایەی بەناوی (یاسای دارستان)ەوە دەرچوە لەناوچە دارستانەکاندا ترسێکی زۆری خستۆتە دڵی ئەوانەی مەڕو ماڵاتیان هەیە چونکە لەوە دەترسن بەپێی ئەو یاسایە مەڕو ماڵاتەکانیان لەبەر بێ لەوەڕی لەناو بچێت))

گۆڤاری نوکتا دوای ئەمە دەچێتە سەرباسێکی تر بەناوی(بەهارێکی خوێناوی)کەلەوباسەدا وتراوە:

((لەبەهاری ساڵی(١٩٣٧)دا لەدرسیم لەچیاکاندا لافاوی خوێناو هەستاوژمارەی چەکدارانی حکومەت لەوناوچانەدا تادەهات زۆر دەبوو, سەرکردایەتی سوپا بەیانی ژمارە(٣٨٢)ی دەرکرد کەلەوبەیانەدا ووترابوو:

هەواڵی چەتەکان هەموو ڕۆژێك وا دەگەیەنێت پەلامار ئەدەنەسەر هێزەکانی حکومەت و بەرامبەربەمە حکومەتیش بەفڕۆکەکانی چەند جارێك ناوچەکانی ئەوانی بۆردومانکردوە, بە تایبەتی ناوچەکەی(سەید ڕەزا)و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ شەڕ گەرمتر دەبێت و ڕۆژی(١٩٣٧/٠٤/٢٦)هێزێکی کورد(کەبەقەرەقول ناوی بردوە)لەناوچەکانی(سن)ێ(هۆزات)کە ژمارەیان(٣٦)چەکداربوو سەعات هەشتی شەو لەلایەن چەکدارەکانمانەوە گیران و بەپێی هەواڵێکی تر

نزیکی(٨٠)چەکداری تری چەتەکان شەوی(٢٦-٢٧ی نیسانی١٩٣٧)
هێرشیان هێنایە سەر تابووری ژمارە(٩)کەلەنێوان(قارجك)و
(بەهە)دابوونو شەڕ هەتا بەیانی درێژەی کێشا.

بۆردومانی فڕۆکە لەلایەن(صبیحە گوکچە- کەحسرتیان
لەلاپەرە/١٦٦ی کتێبەکەیدا دەربارەی ئەو ژنە فڕۆکەوانە بە صبیحە
نمکچی ناوی بردوەو لەهەندێ سەرچاوەدا ووتراوە صبیحە ئەو کچە
بوەکە مصطفی کمال کردبووی بەکچی خۆیو گەورەی کردبوو، بوبووبە
فڕۆکەوانو لەباسی داهاتوودا دەچینەوە سەرباسی چۆنیەتی
بۆردومانکردنی فڕۆکەکەی صبیحە)، بەیانەکەی حکومەت وتوویەتی
ئەو بۆمبایانەی دەهاوێژران نەیانتوانیبوو بەتەواوەتی دانیشتوانی
ناوچەکە تەمێ بکات، بەلام لەئەرشیفی سەرکردایەتی لەشکردا بە
پێچەوانەوە ووتراوە ئەو بۆمبا پەنجا کیلۆییەی فڕۆکەکەی صبیحە
فڕێی دەدایە خوارەوە زیانێکی زۆر گەورەیان گەیاندبوو بەچەتەکان
لەباکوری گوندی(کەچزەکین)دا.

هەمان گۆڤاری نوکتا ئاماژەی بۆ بیرەوەرییەکانی(محمد کانگوتان)کردوە
کەچۆن خۆیو براکەی لە گوندەکەی خۆیانا لەبەر بۆمبارانو گوللەی مەترە
لیوز ڕایانکردوەو بەچاوی خۆیان کۆشکە گەورەکەی ماڵی خۆیان دیوە چۆن
ئاگری تێ بەردراوسووتێنراو ئەوی لەگوندەکە نەیتوانیبوو ڕابکاتو خۆی
دەرباز بکات هیچیان بەساغی نەمابوونەوە.

گۆڤاری نوکتا باسی ڕاپۆرتەکانی کردوە کە لەزۆربەیانا ناوی سەید
ڕەزای تیادا کراوەو لەیەکێکیانا لەمانگی حزیرانی(١٩٣٧)دا وتوویەتی:

هـەموو ناوچـەکانی چـەتەکان پـاك کراونەتـەوە بـەڵام هێشـتا سـەید ڕەزاو داروەستەکەی نەگیراون.

بەرلەمە باسی دوهەمدا باسی نامەیەکی سـەید ڕەزامانکردو دەقەکەیمان بڵاوکردەوە کەناردبووی بۆ وزیری دەرەوەی بریتانیا و, ووترابوو ئەو نامەیە بـێ وەرام مـابوەوە, بـەڵام لەوباسـەی گۆڤـاری (نوکتـا) بـڵاوی کردۆتـەوەو دەردەکـەوێ کـەوا وزیـری دەرەوەی بریتانیا لـە(١٩٣٧/١٠/٢٥)دا نامەیـەکی نـاردوە بـۆ باڵیوزخانەکـەی خۆیـان لـە ئەسـتمبوڵ و لـەو نامەیـەدا داوای لـە باڵیوز کردوە کە بەشێوەیەکی غـەیری ڕەسمـی ئاگاداری حکومـەتی تورکیا بکـات کـە حکومـەتی بریتانیـا هـیچ جـۆرە نامەیـەکی نـەناردوە بـۆ سـەید ڕەزا(ئـەوەی شـایانی باسـە ئەوەیـە ئـەو نامەیـەی وزیـری دەرەوە کـە بـۆ باڵیوزەکەی خۆیـانی نـاردوە لـە ئەسـتمبول دوای گرتنـی سـەید ڕەزا بـوە لـە ڕۆژی(١٩٣٧/٠٩/١٠) دا وەکـو لەباسـی داهـاتوودا ڕوون دەبێتـەوە ولام وایـە حکومـەتی بریتانیـا دوورنیـە حسـابی ئـەوەی کردبێـت ڕەنگـە سـەید ڕەزا لـەدوای گرتنی و دادگا کردنی دوورنیـە باسـی ئـەو نامەیـەی خـۆی کردبێت کەکاتی خۆی ناردبووی بۆ وزیری دەرەوەی بریتانیا.

لەباسی داهاتوودا, بەپـێی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی شۆڕشی درسیم‌و سەید ڕەزاشیان نوسیوە کورتەیەکی ئەو سەرچاوانەی پێشکەش دەکەین.

## باسی چوارەمی

# شکاندنی شۆڕش و سەرەنجامەکەی و سزادان و ئاوارەکردنی دانیشتوان

لەباسی پێشودا ئاماژەمان بۆئەو سەرچاوانە کرد کە هەریەکەیان بەشێوەیەك باسی هۆی دەسپێکردنی شۆڕەکەو شۆنێتی دەسپێکردنی شۆڕشەکەیان کردوە بەداخەوە ئەم شۆڕشەش هەروەکو شۆڕشەکانی تری کورد ئەنجامەکەی بەوە گەیشت شۆڕشگێڕەکان بەو چرکە کەم و نەشارەزاییەی سەرکردەکانی شۆڕش هەیانبوە نەیانتوانیبوو بەرگری ئەو هێزە پرچەکە زۆرەی حکومەت بگرن کەڕوو بەرویان بوبونەوەو لەباسی داهاتوودا باسی هەڵسەنگاندنی شۆڕشەکەو کەموکورییەکانی و ئەو رەخنانەی لێی گیرابوو باسی دەکەین و دەتوانین لێرەشدا ئەوە دوبارەبکەینەوە کە جگە لەوەی هێزی شۆڕگێڕان ژمارەکەیان بەرامبەر بە هێزەکانی حکومەت ئەوەندە نەبوو کە بتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ شۆڕشێکی پارتیزانانەی درێژ نەفەس خوی رابگرێت و حکومەتی تورك هەرجارەی بەشێوەیەك و بەجۆرە فروفێڵێك دەچوە پێشەوەو بێجگە لە

فریودانی هەندێ لە شۆڕگێڕان و خیانەتی هەندێکیان کە خیانەتی (ریبەر)ی برازای سەید رەزا نمونەیەکی ئاشکرای سەرکەوتووی تورکەکان بوە کە چۆن توانیبویان برازا لەمامی خۆیان بکەن و بێجگە لەمە سەید رەزاش کەوا دیارە لە شۆڕشەکەیدا نەیتوانیبوو دەزگایەکی سەرکردایەتی بۆ شۆڕشکەی داین بکات و لەپاش کوشتنی عەلی شیرو کەسێکی لێهاتووی تر نەیتوانیبوو جێگەی بگرێتەوە بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ سەید رەزاداو سەید رەزا خۆشی تووشی هەڵەیەکی زۆر گەورەبوو لەوەدا کەبەدڵنیاییەوە چوبوە لای تورکەکان بۆ گفتوگۆکردن و لەوێ وەکو کەوی ناو داو بەئاسانی گیراو خۆی دابەدەستەوەو بەداخەوە هەروەکو چۆن سمکۆی شکاك لەساڵی ١٩٣٠دا هەمان هەڵەی کردبوو، سەید رەزاش بەپێی خۆی چوبوە لای تورکەکان بۆگفتوگۆکردن بەبێ ئەوەی هیچ بارمیتەیەکی دوژمنەکەی خۆی لای شۆرشگێڕەکانی خۆی دانابێت و سەید رەزاش بەوشێوەیە خۆی توشکرد.

کریس کوچرا لەلاپەڕە ٢١ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٤١ئاماژەی بۆ دوکیومێنتێکی ژمارە (Fo.371-35012)ی رۆژی ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٣کردوە کەلەو دکیومێنتەدا وتراوە:

(کاتی خۆی لەمانگی خریرانی ١٩٣٧دا لەئەنکەرە وابلاوکرابوەوە کە راپەڕینی دەرسیم لە ٢٤/ی حزیرندا بەتەواوەتی تێکشکابوو، هەرچەند زەرەوزیانی ئەو شەڕە نەزانرابوو بەلام سیاسی و دبلۆماسیە ئەوروپاییەکان وایان راگەیاندبوو هێزی ئاسمانی و جندرمری زیانێکی زۆری لێکەوتبوو ئەو کاربەدەستانەی حکومەتی تورك کەلەشەڕەکە گەڕابونەوە بۆئەنقەرە، رامیارییەکانی ئینگلیز گفتوگۆیان لەگەڵاکردبوون وتبویان جنرال عبدللە

ئالب دوغان بەتەماى ئەوەنەبووبتوانرێت لەساڵی ١٩٣٧دا شۆڕەکە دامرکێنێتەوەو لەناو ببرێ، بەڵکو داینابوو لەساڵی ١٩٣٨دا تەواوی بکات).

لەگۆڤاری (NOKTA) سەرچاوە٧ ئاماژەی بۆ راپۆرتێکی سەرکردایەتی هێزەکانی حکومەت کردوە کەلەوەدا ژمارەی شەهیدەکانی کورد لەو شۆڕشەدا بریتی بوە لەچوارهەزار بەلاّم گۆڤارەکە ئەم ژمارەیەی بەراست نەزانیوە و بۆ بەڵگەی ئەم بۆچونەی نمونەی گوندێکی خستۆتە پێش چاو کەوتویەتی لەفلاّن گوندا (ناوی گوندەکەی نەبردووە) (٧٩٥٤) کوژارو و بریندار هەبووە، جگەلەمە ئاخۆ بۆ هێرشبردنی هێزێکی حکومەتی کە ژمارەکەی ٥٠-٦٠ هەزار بوبێت بۆسەرکورد ئاخۆ چەند کوردی تیادا کوژرابێت؟ کریس کوچرا لەکتێبەکەیدا وتویەتی: (لەدوای کوشتنی عەلی شیرو) ئیتر بنکەی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕەکان گوێزرایەوە بۆناوچەی (بەختیار) و تورکەکان لەو ناوچانەدا بەوپەڕی دڕندەییەتی و خوێنڕێژییەوە رەفتاریان لەگەڵ دانیشتوانی بێ چەکدا کردووەو دارستانەکاناین سوتاندووە و سەرۆکی دانیشتوانی ناوچەکە کە (شاهیم ئاغا) بوو حکومەت کوشتی (بەرلەمە باسمانکرد کە شاهین ئاغا لەلایەن (خفر ئەحمەد) ناوێکەوە کوژرابوو) تورکەکان لەدۆڵی (دیکسور) هەزاران ژن و منداڵ و پیری بێ تاوانیان کوشتبو کە پەنایان بردبوە بەر ئەشکەوتەکان و دەرگای ئەشکەوتەکانیان دەبەست و ئاگریان تیادا دەکردەوەو خەڵکێکی زۆریان کوشت و سوتاند کە یەکێك لەوانە (حسین رەسیك)ی کوڕی سەید رەزابوو کە دایکی بەبرینداری دابووە دەست ئەفەسەرێکی تورك بۆئەوەی ببرێت بۆ (العزیز) و لەوێ تیماربکرێت (ئەمە وەکو ئەوە وایە بەرخێك بدەی بەگورگێك) بەلاّم لەجیاتی تیمارکردن لەژێر سزادانا کوشتبویان.

کریس کوچرا وتویەتی: حکومەت تەنها بەکوشتنی و سزادانی شۆڕشگێڕەکان وازی نەدەهێنا بەڵکو عەشیرەتەکانی (قورەیشان) و (کورگان) کەبەهیچ شێوەیەك بەشداریان نەکردبوو لە شۆڕشەکەدا، بەماڵ و منداڵ'وە هەموویان گرتن و خانوو بەرەکانیان سوتاندو دەیان کەسیان لێکوشتن.

لەو هێرش بردنەی حکومەت بۆسەر شۆڕشگێڕان چەند جارێك فڕۆکەکان بۆردومانی شۆوێنەکەی سەید ڕەزیان دەکرد، بەڵام سەید ڕەزا خۆی دەربازکردو خۆی گەیاندە (ئوناسێك).

کریس کوچرا لەلاپەڕە ٢١١ی کتێبەکەیدا باسی چۆنێتی سەید ڕەزای بەم جۆرە کردوە:

(حاکمی ئەزربایجان لەمانگی سپتمبەری ١٩٣٧دا بلاوی کردەوە حکومەتی تورك دەیەوێ دان بەداخوازیەکانی کوردا بنێ و شەڕو کوشتار بوەستێنێت و هەرزەرەرو زیانێك لەخەڵك کەوتبێت بۆیان ببژێرێت.

سەید ڕەزا بۆ تاقیکردنەوەی نیازی حکومەت دەچێتە ئەزربایجان و لەوێ لەدوای گفتوگۆکردن دەیەوێ بچێتە دەرەوە بەلام دەمو دەست لەسەر پلیکانەکانی کۆشکی ئوستانداری ئەزربایجان دەسبەستی دەکەن و دەیگرن و ئەویش هاوار ئەکات: ئەی حکومەتی تورکی درۆزن و بێ شەرەف ئاوا بەم جۆرە و بەم شێوە ناپیاوەتیە دەمگرن؟

لەدوای ئەو گرتنە دەدرێت بەدادگای (العزیز) لەکاتی دادگایکردندا حکومەت بەوە تاوانباری دەکات کە پێوەندی بەشورەویەوە هەبوە و چەك و یارمەتی لێ وەرگرتووە و ئەفسەرەانی سۆڤێت لەنار

چەکدارەکانیان بوون, بەلام سەید رەزا ئەو درۆو دەلەسانە هەمووی بەدرۆ دەخاتەوەو بەدادگاکە دەڵێت: (پشتیوانی من لەشۆڕشدا تەنهای هەر میللەتی کورد بوەو بەدرێژایی سالانی ژیانم خەباتم تەنها لەپێناوی میللەتەکەی خۆمدا کردووە و هەولم نەداوە یارمەتی لەهیچ لایەك وەربگرم) لەدوای چوار رۆژ دادگایکردن لە ١٤/ی نۆڤەمبەری ١٩٣٧دا سەید رەزاو دە کەسی تری هاوکاری حوکمی ئیعدام دەدرێن و لە ١٨ی ئەو مانگەدا هەموویان لەسێدارە دران.

کریس کۆچرا ئاماژەی بۆ دۆکیمنتی ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا کردوە ژمارە (Fo.371-35012)ی رۆژی ١٩٤٣/١٠/٩ یەعنی دوای پتر لەشەش سال هەلواسینی سەید رەزا لەو دکیۆمنتەدا راپۆرتێکی کورنوالیسی تیادایە (کورنوالیس ماوەیەك موستەشاری وەزارەتی ناوخۆی عراق بوە, کەتا ماوەیەکی زۆر ئینگلیزەکان لە وەزارەتەکانی حکومەتی عراقدا موستەشاری خۆیان بەناوی کاربەدەستێکی حکومەتی عراقەوە دائەنا بۆ ئەوە لەرێگەی ئەو موستەشارانەوە ئاگاداری هەموو کاروبارێکی عراق بن) لەو راپۆرتەدا باسی چۆنێتی لەسێدارەدانی سەید رەزای کردوە کەلەدوای بریاری لەسێدارەدانی لەبەردەمی دادگادا سەید رەزا وتویەتی:

(من تەمەنم گەیشتوەتە ٧٥ سال و ساتێکی تر دەچمەلای شەهیدانی تری کوردستان, هەروەکو ئاگادارن بزوتنەوەکەی دەرسیم تێك شکا بەلام کوردو کوردستان هەروەکو خۆیان دەمێنێتەوەو هەرگیز لەناوناچن و لاوانی کورد بەهیچ شێوەیەك نایەلن ئەم بزوتنەوەیەی کورد بکوژێنرێتەوەو خامۆش بکرێت و ئەوان تۆلەی من دەسێننەوە... ئیتر هەربژی کوردو

کوردستان و بروخێت دام ودەزگای زۆرداران و ستەمکاران و نەفرینی خوا لەهەمووی بێت).

لەهەمووی سەیروسەمەرەترو نیشانەی ئەوپەڕی بێ عەدالەتی و بێ رەوشتی کاربەدەستانی حکومەتی تورك و دادگاکانی، هەروەکو دکتۆر عبدالرحمان قاسملو لەلاپەرە ٧٩ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ١٦ وتویەتی: (جگەلەوەی سەید رەزا بەوە تاوانبارکرابوو کە پێوەندی بە سۆڤیەتەوە هەبوەو یارمەتی لەوان وەرگرتووە، سەید رەزایان بەشتێکی تر تاوانبار کردبوو کە ئێجگار دووربووە لە رەوشت و کردەوەی ئەو ساتێك دادگا خۆی و هاوکارەکانی بەوەش تاوانبار کردبوو کە دزیان کردبو.

بەرامبەر بەو درۆو دەلەسە بێ سەروبەرەی دادگای حکومەتی تورك (A.Romanette) لە کتێبەکەیدا بەناوی (Lekurdistan ET laqestion kurds) لەلاپەرە ٦٢یدا چاپی پاریس ساڵی ١٩٣٧ گاڵتەی بەکاربەدەستانی تورك کردوە کە تاوانی دزینی دابوە پاڵ سەرکردایەتی شۆڕش لەکاتێکدا هەموو تاوانی ئەو سەرکردایەتیە بریتی بوە لە خەبات و تێکۆشان بۆ رزگارکردنی وڵاتەکەیان، درۆیەکی تری نوسەرانی تورك بەرامبەر بە شۆڕشی کورد هەروەکو قاسملو باسیکردوەو ئاماژەی بۆ نوسەرێکی تورك کردوە کەناوی (عوسمان میتە) بوە لەرۆژنامەی (sun post)دا لەساڵی ١٩٤٨دا یەعنی دوای دە ساڵ تێپەڕبوون بەسەر دامرکانەوەی شۆڕشەکەی دەرسیمدا لەو رۆژنامەیەدا بەشان و باهوی کارەبدەستانی حکومەتی تورکدا هەڵیداوەو وتویەتی حکومەت خزمەتێکی زۆری ناوچەکەی کردوە بۆ پێشکەوتنی شارستانێتی کەچی هەروەکو نوری درسیمی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە ئەو نوسەرە هەرخۆی دانی بەوەدا ناوە کە ساتێك چۆتە ناوشارەکە

لەکاربەدەستی باج کۆکردنەوە بۆ حکومەت و لەسەربازو جندرمە بەولاوە کەسێکی تری وای لێ نەبوە خزمەتی پێشکەوتنی شارستانێتی بکات.

هەمان نوسەر (عوسمان میتە) لەباسەکەیدا وتویەتی: زۆرم هەوڵدا بگەمە ناخی دەرونی دانیشتوانەوەو شتێکیان لێ تێ بگەم، بەڵام بۆم دەرکەوت کە ئێمە (مەبەست حکومەتی تورك) هیچمان بۆ نەکردبوون و هیچ جۆرە پیشەسازی و بازرگانیەك شوێنەواریان دیار نەبوو، لەوشارەدا تاقە دکتۆرێکی تیادانەبوو، خەڵك مانای دەرمانیان نەدەزانی و رێگەوبان نەکرابوەوە بۆ ئاسانکردنی هاتوچۆکردن لەنێوان دانیشتوانی گوندەکانا (لەباشی هۆی دەسپێکردنی شۆڕشی دەرسیمدا باسی ئەوەکرابوو کە تەنها حکومەت بایەخی دابوو بە چاکردن و کردنەوەی ئەو رێگاو بانانەی سودیان هەبوە بۆ گواستنەوەی هێزەکانی سوپا بۆلێدانی حکومەت کە کردنەوەی رێگای شەمەندەفەرو لەناوچەی دەرسیمدا یەکێك بوە لەو کارە بێ سودانەی حکومەت کە دانیشتوانی دەرسیم گلەییان لێ کردووە و لێی بێزار بوون).

دەربارەی چوونی سەید رەزا بۆلای کاربەدەستانی حکومەت و گرتنی سەید رەزا وەکو بەرلەمە کریس کۆچرا باسیکردوە، قدری جمیل بەگیش/ زنارسلوپی لەلاپڕە ٢٠٨ی کتێبەکەیدا سەرچاوە ٥٧ بەم شێوەیە باسی چوون و گرتنی سەید رەزای کروە کە ئەم بەشێوەیەکی فراوانتر لە باسەکە دواوەو وتویەتی:

(بەنزیکبونەوەی وەرزی زستان و سەرماو سۆڵە باری شۆڕشگێڕەکان ئێجگار گران و ئاڵۆزبوو لەناوچە شاخاوییەکانی دەرسیمدا لەبەرئەوەی بۆماویەکی کەم شەڕ راوەستا، سوپای تورك بەرلەمە زیانێکی زۆری لێ

کەوتبوو, سەرکردایەتی سوپای حکومەت لەرێگەی والیی ئەزربایجانەوە نامەیەکی ناردبوو بۆسەید رەزا کەلەو کاتەدا لەبەرئەو بۆردومانەی فرۆکەکانی حکومەت کردبویانە سەر سەید رەزا بنکەکەی خۆی گواستبوەوە بۆ (ئوئاستیك), لەو نامەیەدا کەبۆ سەید رەزا نێررابوو بەڵێنی ئەوەدرابوو حکومەت ئامادەیە داخوازییەکانی دانیشتنی دەرسیم بەجێ بێنێت و داوا لە سەید رەزا کرابوو بۆئەو مەبەستە بچیتە ئەزربایجان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتدا.

سەید رەزا باوەڕی بەناوەڕۆکی ئەو نامەیە دەکات و دەچێتە ئەزربایجان و لەوێ دەسبەجێ خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەگیرێن و دەنێرین بۆ (العزیز) لەپاش دادگایکردنێکی هەرەمەیی سەید رەزا و کوڕەکانی لە سێدارەدران لەگەڵ (قمرئاغا)ی سەرۆکی عەشیرەتی (یوسفیان) و (سەید حسین) ی سەرۆکی عەشیرەتی (قریشان) و علی ئاغا زنارسلوپیش هەروەکو کریس کوچرا باسی قسەکانی سەید رەزای کردوە لەبەردەمی سێدارەدا بۆیە پێویست ناکات ئەو قسانە دوبارەبکەینەوە.

قدری جمیل بەگ زنارسلوپی باسی ئەوەی کردوە لەدوای لەسێدارەدانی سەید رەزا ئەوسا نۆرەش هاتەسەر (رێبەر)ی برازای سەید رەزا کە خیانەتی لەکوردو لەمامی خۆی کردبوو, قارەمانێکی ئازاو دلاوەری کوردی کوشتبوو کە (علی شیرو) بوو.

(ریبەر) لای وابوو بەو خیانەتەی کردبووی ئیتر تورکەکان وازی لێ ئەهێنن و جێگەی مامی دەگرێتەوە لەسەرکردایەتیداو نەیدەزانی لەدوای سەید رەزای مامی نۆرەش دێتەسەر خۆی و تورکەکان لەشوێنێکدا کە پێی دەوتری (تیشان) رێبەرو کوڕەکەی ئەدەنەبەر گوللە و هەردوکیان دەکوژن و

خانوەکەشیان کەلە (بیامە)دابوو داگیری دەکەن و لەراستیدا بەندێکی پێشینان هەیە دەڵێ بۆ (ریبەر) و خائینانی تری لەونیەی ئەو وتراوەکە دەڵێت: هەزار ساڵ بکەیت بێگانە پەرستی، لەئەنجامدا هەردەهێنیت نوشوستی.

لەگۆڤاری نوکتادا، سەرچاوە/٧ لەباسی گرتنی سەیدرەزادا لە (ئەرزنجان) وتویەتی لەدوای دادگاکردنی، خۆی و (رەشك حسین)ی کوڕە بچوکی و برازایەکی (یوسف خان قمیر) کە سەرۆك عەشیرەت بوو لەگەڵ (سید حسین) سەرۆکی قریشان لەگەڵ دە کەسی تردا لەرۆژی (١٩٣٧/١١/١٨) دا لەسێدارە دران.

(دەربارەی ئەو (رەشك حسین)ەی گۆڤارەکە باسیکردووە کریس کوچرا ناوەکەی بە (حسین رسیلك) ناوبردووەو کریس کوچرا نەیوتووە لەگەڵ باوکیا لەسێدارە درابوو بەڵکو وەکو بەرلەمە کریس کوچرا باسیکردووە وتوویەتی لەو ئەشکەوتەی تورکەکان ئاگریان تێبەردابوو کورێکی سەید رەزا کەناوی (حسین رەسیك) بوو بەبرینداری دایکی دایە دەست ئەفسەرێکی تورك بۆ ئەوەی لە (العزیز) تیماربکرێت بەڵام بەپێچەوانەو لەژێر ئەشکەنجەو ئازاردا کوشتبویان).

گۆڤاری نوکتا سەرچاوە (٧) دەربارەی هەڵوێستی دوای لەسێدارەدانی سەید رەزا وتوویەتی:

((بەلەسێدارەدانی سەید رەزا شۆرشەکەی درسیم کۆتایی پێ نەهاتو لەساڵی (١٩٣٨)دا دوبارە راپەڕین و بزوتنەوە سەری هەڵدایەوەو لەو روەوە (ناشد ئولوغ) کە رۆژنامەنوسێکی تورك بووە لەباسێکیدا وتویەتی: ئەوا دوبارە نائارامی لە•قالان) دەستی پێکردەوەو هۆی ئەمەش ئەوەیە

حکومەت پەرەی بەڕۆشنبیرکردنی خەڵك نەداوە, لەبەرئەوە کە هەوا خۆش بوو هێرش کرایە سەر (قایان)و دەبێ بەهەموو شێوەیەك کۆتایی بەم کێشەیە بهێنرێت و پێویستە بەپێی مادەی (٦)ی ئەو پرۆژەیەی حکومەت ئامادەی کردووە گوندی (کوتفنکا) پاك بکرێتەوەو ناوچەکە بسوتێنرێت.

هەمان گۆڤار ئاماژەی بۆ باسێکی (شوکری بایکار) کردوە کە لەو باسەیدا وتوویەتی: ئەو شەڕەی لە (٢١ی تیرمەهی ساڵی ١٩٣٨)دا ڕویدا, هەموو چەتەکان ڕایانکرد بۆناو ئەشکەوتەکان و سوپا دەورەی دان و بەتۆپ و مەترەلۆز بەربوونە دانیشتوانی ئەو ناوچانەو لەئەشکەوتێکدا کە (٢١٦) کەسی تیابوو هەموویان کوژران و لەناوچەی (مونزر Munzir)یشدا لاشەی (١٢) کەسی‌تر دۆزرانەوەو بەفڕۆکەش (٤٠) کەسی تر کوژراو لەچیای (مامك Mamek) هێزەکانی حکومەت هێرشیان کردە سەر گوندی (جات)و لەو (٧٠) چەتەی لەو گوندەدا بوو بیست کەسیان لێکوژرا.

بەرلەوەی بچینە سەر باسی هەڵسەنگاندنی شۆڕشی درسیم و کەم‌وکوورییەکانی و ئەو ڕەخنانەی لێی گیراوە بەپێویستم زانی ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی تورك بخەمە پێش چاو کەلەلایەکەوە هەر دانیان بەبوونی کوردا نەناوەو ئەو کوردەی کە هەبوون بەپێی ئەو درۆو دەلەسانەی کاربەدەستانی حکومەتی تورك و ڕۆژنامە تورکیەکان بلاویان دەکردەوە, لەلایەکی تریشەوە هەوڵیان داوە لەو سەرژمێری‌یە ڕەسمیانە حکومەتی تورکیا جاربەجار کردویێتی هەموو جارێك ژمارەی کورد لەسەرژمێریەکەدا کەم بکاتەوە, بۆ ڕونکردنەوەی ئەو تەقەلایانەی حکومەت باسی هەندێ سەرچاوە دەخەینە پێش چاو کە دەربارەی سەرژمێری هەموو دانیشتوانی تورکیاو کوردو کەمە

نەتەوەکان دواون پرۆفیسۆر حسرتیان لەو کتێبەیدا دەربارەی ئەو باسە دواوە

لەکتێبی یەکەمیان، سەرچاوە (٤٩) لەلاپەڕە (١٦٩)دا ئاماژەی بۆ باسێکی (istatistic yilligi) کردوە کەلەساڵی (١٩٥١)دا بلاوکراوەتەوە، لەلاپەڕە (٧٢-٧٣)یدا لیستەیەکی کردووە بۆ دانیشتوانی زۆربەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات (ناوچە کورد نشینەکان)و بەراوردی دانیشتوانی ئەو ساڵەی کردووە لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ویلایەتانەدا کەلەساڵی (١٩٣٥، ١٩٤٠، ١٩٤٥)و لەبەراوردکردنی سەرژمێری ساڵی (١٩٣٥) لەگەڵ سەرژمێری (١٩٤٠)دا دەرکەوتووە سەرژمێری ساڵی (١٩٤٠) بریتی بووە لە (٢٩٨٨٦٥) کەس کەمتر لەوەی لەساڵی (١٩٣٥)دا بوە.

حسرتیان لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو کەمبوونەی نێوانی ساڵی (١٩٣٥) لەگەڵ سەرژمێری ساڵی (١٩٤٠)دا، لەگەڵ ئەوەشدا لەو ماوەیەدا هیچ جۆرە نەخۆشیەکی کوشندەی وا بلاونەبوبوەوە کە ئەو نەخۆشیە بووبێت بەهۆی ئەو ژمارە زۆرە، کەواتە هۆی کەمبونەوەکە تەنها بەهۆی ئەو کوشتارانەوە پەیدا بووبوو کە لەشۆڕشەکانی کوردا لەو دەوروبەرەدا لێیان کرابوو لەگەڵ ئەوانەی لەشوێنەکانی خۆیان هەڵکەنرابوون و ئاوارەکرابوون بۆ ناوچە تورک نشینەکان (کەبێگومان ئەمانەی گوێزرابوونەوە لەسەرژمێریەکانا بەتورک تۆمارکرابوون کە حسرتیان ژمارەی کوردە ئاوارەکانی ئەو سەردەمە بەچوارسەد هەزار کەسی داناوە).

پروفیسۆر حسرتیان لەلاپەڕە (٦٩)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە (٤٥) (القومیە فی ترکیا)، لەو باسەیدا لەوە دواوە چۆن تورکەکان تەقەلایان داوە بۆ شاردنەوەی ژمارەی ئەوانەی لەراستیدا بەڕەگەز تورک نەبوون و دەڵێت:

(دوای ئەوەی توركیا بوو بەجمهوریەت, حەوت جار حكومەت سەرژمێری دانیشتوانی كردوه بەڵام هیچ جارێكیش لەدوای تەواوكردنی سەرژمێری بەهیچ شێوەیەك بەرەسمی ئەنجامی سەرژمێریەكەی بڵاونەكردۆتەوەو لەڕاستیدا ئەگەر بڵاویشی بكردایەتەوە هیچ شتێكی بەشێوەیەكی ڕاستو دروست نیشان نەدەدا چونكە لەو سجلاتو لیستانەی حكومەت ئامادەی كردبوو بۆ تۆماركردن سەرژمێری تیایانا بەهیچ شێوەیەك خانەیەكی لەوسجلاتو لیستانەدا تەرخان نەكردبوو بۆ ئەوانەی بەڕەگەز تورك نەبوونو هیچ گومان لەوەدا نیە كاربەدەستانی تورك بۆیە شوێنێكی وایان لەسجلاتو لیستەكانا تەرخان نەكردبوو بۆ غەیری تورك چونكە نەیان ویستبوو ژمارەی نەتەوەكانی تری غەیری تورك بزانرێت چەند بووە.

لەسەرژمێری ساڵی (١٩٢٧)دا حكومەتی توركیا لەگەڵ ئەو هەموو تەقەلاو درۆو دەلەسەو ئەو هەموو فروفێڵانەی كردبووی نەیتوانیبوو ئەوە بشارێتەوە لەشوێنێكی وەكو ئەستەمبولدا كە ژمارەی كەمە نەتەوەكان لەو شارەدا (٢٧,٤٥٪) بوە لەگەڵ ئەوەشدا لەساڵی (١٩٢٧)دا نسبەتی كورد ی بە (٣٤,٤٪) داناوە لەناوچەكانی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵدا, كە لەویلایەتی (وان) نیسبەتی كورد لە(٢٧٪)و لە بدلیسو موشو سیرت (٧٥٪) بوەو لەدیاربەكرو هەكاریدا (٦٩٪) بوەو لەماردیندا (٦١٪)و لە العزیز دا (٥٣٪) بوە.

هەروەكو سجلاتی حكومەت پیشانی داوە سەرژمێری كورد كورد لەساڵانی بیستەكانا لەتوركیادا (٩,١٥٪) بوە بەڵام لەساڵی (١٩٤٠)دا بە(٧,٨٦٪)و لەساڵی (١٩٥٠)دا بە(٦,٢٤٪) دەسنیشانكراوە.

دەربارەی ئەو سەرژمێرییەی پرۆفیسۆر حسرتیان لەو دوو كتێبەیدا باسیكردووە كە سریا بەدرخان لەكتێبەكەیدا سەرچاوە (٧٩) دەربارەی

ئەو سەرژمێرییەی حکومەت لەساڵی (١٩٢٧)دا کردبووی، ژمارەی هەموو دانیشتوانی تورکیای بە (١٣)ملیۆن کەس داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا تورکەکان خۆیان زۆرباش دەیانزانی ژمارەی تورك لەو ساڵی سەرژمێرییەدا تەنها (٥,٥) ملیۆن بوە بەهەموو دانیشتوەکانیەوە کە تەنها لەوەش (٣,٥)ملیۆنی تورك بووە.

سریا بدرخان لەپەراوێزی لاپەرە (٥٨)ی کتێبەکەیدا لەباسی ئەو سەرژمێرییەی حکومەتی تورك ژمارەی دانیشتوانی تورکیای بە (١٣,٦٤٩,٩٤٥) داناوە بەهەموو نەتەوەکانی تریشەوە وتوویەتی ئەو ژمارەیە لەکاتی خۆیدا سەرنجی (یوشن نادی) ڕاکێشاوە کە نوسەری ڕۆژنامەی (جمهوری) رەسمی حکومەت بوە، وتوویەتی لەساڵی (١٩١٤)دا (یەعنی پێش شەڕی جیهانیو ئەو هەموو کوشتارانەی بەهۆی ئەو شەڕەوە کرابوو) هەموو دانیشتوانی خەلافەتی عوسمانی لەو ساڵەدا هەمووی بریتی بوە لە (٢٠,٩٧٣,٩٠٠) کەسو ئەگەر دانیشتوانی ئەو سەردەمەی سوریاو میسوبوتامیاو فەلەستینو عەرەبستانی لێ دەربکرایە - کە لەشوێنێکی وەکو سوریادا فەرەنسیەکان کە سوریایان لەژێردەستدا بێ لەساڵی (١٩٢١)دا لەم ساڵەدا تەنها ژمارەی دانیشتوانی سوریا بریتی بوە لە(٢,٩٢٨,٢١٨) کەس و لەساڵی (١٩٢٣)دا ئەو سەرژمێرییەی سوریا (٢,٩٨١,٨٦٣) بوە ئەگەر ئەمەی سوریاو دانیشتوانی فەلەستینو عەرەبستانو کوردو یونانو ئەرمەنیو ئەوانەش کە لەشەڕی جیهانیدا کوژرابوون دەردەکەیت ئەوەی کە مابوەوەو تورك بوە تەنها لە پێنج ملیۆن تێپەڕی نەکردووە.

***باسی پێنجەمی***

## هەڵسەنگاندنی شۆڕشی درسیم و کەم و کوڕییەکانی

شۆڕشی درسیمو ڕاپەڕینی دانیشتوانی لەدوای دامرکانەوەی شۆڕشی ئاگریداغ شتێکی ناچاری بوو دەبوایە هەر ڕووی بدایەو تورك بۆ تەواو کردنی ئەو تاوانەی کاتی خۆی لە شۆڕشەکانی تری کوردا تەواوی نەکردبوو, هەروەکو تکتیکی کمالیەکان بۆ لەناوبردنی کورد قۆناغ بەقۆناغ ناوچەی درسیمیان هێشتبووەوە بۆماوەیەك بۆ ئەوەی دانیشتوانی ناوچەکە نەووژێنو بەشداری نەکەن لەشۆڕشی پیرانو ئاگریداغدا وازیان لەسەرکردەکانی ناوچەی درسیم هێنابوو,باجیان لێ نەدەسەندنو لە ڕاستیشدا ئەگەرچی هەندێ سەرچاوە وتوویانە سەید ڕەزا لەدوای شۆڕشی پیران یارمەتیی هەندێ لەئاوارەکانی دابوو بەلاّم تەنها ئەوە بەس نەبوو وەکو کوردێکی بەتواناو دەستەلاّتداو لەکاتی شۆڕشەکانی تردا کەمتەرخەمی بکاتو لام وایە وای زانیبوو بەو بێدەنگ بوونەی ئیتر تورکەکان وازی لێ دەهێننو حسابێکی تایبەتیی بۆ دەکەن لەمانەوەیدا لەناوچەکەی خۆیدا, بەلاّم تورکەکان دەمێك بوو نەخشەی خۆیان کێشابوو, پێشنیازەکانی(عابدین ئوسمان)وازی لێ نەهێنرابوو تەنها بەرامبەر بەدرسیم

دواخرابوو, ساتێك كاتی خۆی هات توركەكان خۆیان پێ نەگیراو ئەوەو باج نەسەندنەیان لەدانیشتوانی ناوچەكە شتێكی كاتی بوو, لەدوای شۆڕشی ئاگریداغ دەستیانكرد بە دەستدرێژیكردن بۆسەر درسیم‌و ساتێك دانیشتوانی ناوچەكە بەسەركردایەتی سەید ڕەزا بەناچاری كەوتنەخۆیان‌و دەستیان دایە چەك تازە كارلەكارترازابوو كوردی ناوچەی درسیم بەو چەكە كۆن‌و ژەنگاویانەی هەیانبوو نەیانتوانی بۆماوەیەكی درێژخایەن بەرگەی دوژمن بگرن‌و لەڕاستیدا ڕاپەڕین‌و شۆڕشەكەیان لەچاو شۆڕشەكانی پیران‌و ئاگریداغدا لەپلەیەكی زۆر نزمدابوو ئەگەر چی شۆڕشگێڕەكان بەوپەڕی فیداكاریەوە خۆیان بەخت كردبوو بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی دوژمن‌و بەو چەكەی هەیان بوو بەبێ بوونی نەخشەیەكی تایبەتی بۆ شۆڕش‌و بێ سەركردایەتەكی لێ هاتوو بەهەڕەمەیی دەستیانكرد بە شۆڕش‌و ڕێكخراوێكی سیاسی ئەو تۆی نەبوو بتوانێت كاروباری شۆڕش‌و لەشكركێش بەباشی ببات بەڕێوەو لەماوەیەكی كەمدا لەلایەكەوە خیانەتی هەندێكیان وەكو(ڕێبەر)ی برازای سەید ڕەزا كە (علی شیرۆ) شۆڕشگێڕی كوشت‌و خیانەتی لەكوردو لەشۆڕشی كوردو لەسەید ڕەزای مامی كردو(خضر ئەحمەد)یش(شاهێن ئاغا)ی كوشت كە ئەویش كوردێكی نیشتیمانپەروەرێكی لێ هاتووبوو, جگە لەوە سەید ڕەزا خۆشی دەرس‌وپەندی لەڕووداوو بەسەرهاتەكانی تر وەرنەگرتبوو, بەوپەڕی ساویلكەیەتیەوە بەپێی خۆی چوبوە بەردەستی دوژمنەكانی‌و ئەوانیش دەم‌ودەست لەناویان بردو گوێیان نەدایە هیچ ڕەوشت‌و بەڵێن‌و پەیمانێك كەدابوویان بەسەید ڕەزا كەبەنیازی گفت‌وگۆ كردن داوایانكردبوو چاوی پێ یان بكەوێت‌و لەوڕووەوە زنارسلۆپی لەكتێبەكەیدا باسی لووت بەرزیی

هەندێ لەسەرکردەکانی درسیمی کردوە کەلام وایە مەبەستی سەید ڕەزا خۆی بوە کەبەلای ئەوەوە وابوە لووت بەرزی سەید ڕەزا بو بەهۆی ئەوەی لەهەموو ڕاپەڕینو شۆڕشانەی بەرلە شۆڕشی درسیمی ساڵی(١٩٣٦)دەستی پێکردبوو وەکو ڕاپەڕینەکانی ملاطیەو درسیمو کۆچگیری کەلەبەرگی دوهەمدا باسی هەمووی کراوەو دەرکەوتوە سەید ڕەزا بەلای هیچیانا نەچوە ئەگەرچی وتراوە یارمەتی هەندێ لەئاوارەکانی داوە.

لەبەرگی دوهەمدا باسی ڕاپەڕینی یەکەمی دانیشتوانی ناوچەی درسیم کرا کەلەساڵی(١٩٢٠)دا دەستی پێکردبوو, لەوڕۆژانەدا هێشتا کمالیەکان خۆیان بەهێز نەکردبوو, دوژمنیان زۆربوو,شەڕی یۆنان لەلایەکەوەو بوونی پاشماوەی خلافەت لە ئەستمبول لەلایەکەوە کارێکی وای کردبوو ئەگەر لەشۆڕشی یەکەمی درسیمو کۆچگیریدا لەهەمان کاتدا دەستەلأتێکی وەکو سەید ڕەزا هاوکاری بکردایە لەگەڵ شۆرششەکانی تردا تورکەکان هەروا بەئاسانی ئەو ڕاپەڕینەی ساڵی(١٩٢٠)یان پیێ لەناو نەدەبراو ئەوەی ساڵی(١٩٢٠)لەدرسیمدا ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ شۆڕشەکەی درسیم دا لەساڵانی(١٩٣٦-١٩٣٨)دا دەردەکەوێت کەئەوەی ساڵی (١٩٢٠) پێشکەوتوو تربوە لەڕووی چالاکیی سیاسیەوەو سەرکردەکانی ئەو ڕۆژە توانیبویان لە شۆڕشێکی یەکگرتوویانداو بەتلگراف داوایان لە حکومەتی ئەنقەرە کردبوو دەمو دەست بڕیارەکانی سیڤەر پەسەند بکاتو ئالأی کوردستان هەڵکراو حکومەتی ئەنقەرە ئەگەرچی بەدرۆش بووبێت ناچارکرا دان بەوەدا بنێت کە ئامادەیە داخوازییەکانی کورد سەیر بکاتو ساتێك حکومەتی تورك هەولیدا بۆ خاو کردنەوەی بارودۆخی ناوچەکە ئامادەیی خۆی پیشان بدات کە ئامادەیە(علی‌شان)بکات بە متصرفی(سیواس)و

براکەی بکات بە جێگری متصرفی ناوچەی درسیم بەڵام لەوەی شۆڕشی درسیمی ساڵی(١٩٣٦-١٩٣٨)دا هەرلەسەرەتاوە ساردو سڕی و کەمتەرخەمی تیادا بەدیکراوەو سەید ڕەزا کە سەرکردایەتی ئەو شۆڕشەی گرتە دەست وەکو سەرکردەیەکی نەتەوەیی نەیتوانی کاروباری جەماوەری ناوچەکەی ببات بەڕێوەو نەیتوانیبوو جەماوەری خاوەنی مافی ڕاست دڵنیا بکات کەئەوەی لەگەڵ دوژمندا دەکرێت بریتیە لە تاقیکردنەوەیەکی زۆر تاڵ و ئەگەر هەموویان نەکەونە خۆیان و سەرکردایەتیەك کەلەناوجەرگەی جەماوەری ناوچەکەوە هەڵقوڵابێت سازنەکرێت ئەوا شۆڕشەکەیان بەزووترین کات لەناو دەچێت و سەید ڕەزا لەو کاتە گرنگ و ناسکەدا نەیتوانیبوو لەناو ئەو جەماوەرەدا لە دەرەبەگێکی دەسڕۆیەوەببێت بەنوێنەری ڕاستی ئەم جەماوەرەی کە هەندێ لەسەرچاوەکان لەباسی سەید ڕەزادا هەندێ شتیان تۆمارکردوە بەپێی ئەو یاسانەو بەپێی ئەو هەڵوێستتانەی سەید ڕەزا لەگەڵ خەڵکدا هەیبوەلە ڕابردوودا نەیانتوانیبوو بەئاسانی لاپەڕەیەکی تازەیان لەگەلا بکاتەوە.

دەربارەی ئەمە هەروەکو پرۆفیسۆر حسرتیان باسیکردوە سەید ڕەزا توانیبووی بەزۆرە ملێ دەستەڵاتی خۆی بەسەر دانیشتوانی(٢٣٠) گوندی ناوچەی درسیمدا بسەپێنێت و دانیشتوانی ئەو گوندانە ناچار بوون سەرانەیەکی هەمیشەیی بدەن بەسەید ڕەزا کە ساڵی واهەبوە دووجار ئەو سەرانەیان لێ سەندراوە کەپێی وتراوە(دوما).

بێجگە لەوە سەید ڕەزای سەرکردەی شۆڕش لەبەر ئەو ناکۆکیەی لەگەڵ(ڕێبەر)ی برازایدا پەیدا بوبوو لەسەر موڵك بووبەهۆی ئەو خیانەتەی ڕێبەر لە شۆڕشەکەی کردو سەید ڕەزا کە نەیتوانیبێت

کێشەیەك لەگەڵ برازاکەی خۆیدا چارەسەر بکات بەهیچ جۆرێکیش قایل نەبوە کێشە لەگەڵ هیچ کەسێکی تر بەخۆشی چارەسەربکات ولاشم وایە هەرئەمەشە کە زنار سلۆپی وتوویەتی لەبەر لووت بەرزیی هەندێك نەتوانرا ئەو کۆبوونەوەیەی لە نێوان سەرکردەو سەرۆکی عەشیرەتەکانا کرا سەربگرێت لە کاتێکدا لەساڵی (١٩٢٠)دا لەهەمان ناوچەدا توانرابوو کۆبوونەوەیەکی یەکگرتوو پێك بێت..

دەربارەی ئەو پڕوپاگەندانەی تورکەکان بلأویانکردبوە وەکە حکومەتی سۆڤیت هاندەری شۆرششەکەی درسیم بوەو لەدادگادا سەید ڕەزا بەوەتاوانبارکرابوو کە ئەفسەری سۆڤیتی لابوەو یارمەتیی لەوانەوە وەرگرتوە, ئەمە شتێك نەبوە کە تورك بۆ پینە کردنی تاوانەکانی خۆی دەس بەبلأوکردنەوەی درۆو دەلەسەی وانەکات ولام وایە سەید ڕەزاو داروو دەستەکەیشی ڕێکخراوێکی ئەوتۆیان نەبوە کە بیر لەپەیدا کردنی جۆرە پەیوەندییەك بکاتەوە لەگەڵ سۆڤێتداو سۆڤیتیش وەنەبێ ئاگای لەبۆ چوون و هەڵوێستی سەید ڕەزا نەبووبێت ولەوەنەگەیشتبێت کەسەید ڕەزا ئەو سەرکردەنەبوە کە جەماوەری کورد لەسەر بناغەیەکی پتەوی بیروباوەڕ لەخۆی کۆکاتەوە.

دەربارەی ئەو درۆو دەلەسانەی تورکەکان لەو ڕووەوە بلأویانکردۆتەوە دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ لە کتێبەکەیدا سەرچاوە(١٦)ئامارەی بۆ کتێبەکەی(م.بوغوریلون)کردوەبەناوی (المساله الکردیه) ئەو نووسەرەلە لاپەڕە(٨٠)ی کتێبەکەیدا ووتوویەتی:

(( لەڕاپەڕینی ساڵی (١٩٣٧)دا حکومەتی تورك و دەوڵەتە ئیمپریالستیەکان گەلێك درۆو دەلەسەیان دەربارەی شۆڕشی درسیم

بلاوكردۆتـەوە گوايـا سـۆڤێت دەسـتی تیـادا هـەبوە, تورکـەکان لـەو درۆو دەلەسـەیەیاندا بـۆ بیانوویـەك دەگـەڕان لـەکورد بـدەن لەلایـەکی تریشـەوە لـەژێرەوە دەیـان ویسـت لەنازیـەکان نزیـك ببنـەوە بۆیـە دروشمـی دژی سۆڤێتیان بەرزکردبوەوە, ساتێك ئەم تەقەلایەیان سەری نەگرت چوونە پاڵ ئەوانەی دەیانویست پەیمانێکی ناوچەیی دروست ببێت کەلە دواییدا ئەو پەیمانە بەسراو ناوی نرا پەیمانی(سعداباد)کە بریتی بوو لـەئێران و عراقی دراوسێشی بەمۆر کردنی ئەم پەیمانە ویستی ئەوە موسوەگەر بکات کەئەو دوو حکومەتەی تریش وەکو خۆی دژی هەموو بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی کوردبن کەلەیەکێك لەمادەکانیا ووتراوە:

((هەرلایەك لەوانەی پەیمانی سعدابادیان مۆرکردوە بەڵێن بەلاکانی تر دەدات کە دەبێ ڕێگە لەجم وجۆڵ و بزوتنەوەی تاقمێکی چەکدا بگرێت کە ئەو تاقمە بەچەك یا لەڕێگەی کۆمەڵ و ڕێکخراوی سیاسیەوە هەوڵ بدات دژی لاکانی ئەو پەیمانە جم وجۆڵ بکات(کە بێگومان مەبەستی تورك بەتایبەتی لەمەدا بزوتنەوەی کوردبن)).

لەدوای مۆرکردنی ئەو پەیمانە بارە هاتورکەکان بلاویانکردەوە کە ئیتر شتێك لەئارادا نەماوە پێی بوترێت کوردو ڕۆژنامەی(SUN POST)ی تورکی لەساڵی (١٩٤٦)دا هەمان قەوانی کۆنی پێشووی لێدابوەوە کەوتبووی: تازە ئیتر لەتورکیادا ناتوانرێت بوترێت هیچ کەمایەتیەك هەیە لەتورکیادا بەناوی کوردەوە.

## بەشی سێهەم

لە کۆتایی ئەم بەرگەدا بە پێویستم زانی لەم بەشەدا ئەم باسانە خوارەوە بەکورتی بخەمە پێش چاو:

باسی یەکەم: ئەو ڕەخنانەی لە شۆڕشەکانی کورد گیراوە بەشێوەیەکی گشتیو لەشۆڕشەکانی باکوری کوردستان بەتایبەتی.

باسی دوهەم: ئەو دەرسو پەندانەی پێویستە کورد لە شۆڕشەکانی کورد بەشێوەیەکی گشتیو لەشۆڕشەکانی باکوری کوردستان بەتایبەتی وەربگیرێت.

باسی سێهەم: هەڵوێستی حکومەتی تورك بەرامبەر بەکورد بەشێوەیەکی گشتیو ئەو یاساو بڕیارانەی دژی کوردو مافی کورد دەری کردبوو.

## باسی یەکەمی

# ئەو ڕەخنانەی لە شۆڕشەکانی کورد گیراون بەشێوەیەکی گشتی و لەشۆڕشەکانی باکوری کوردستان بەتایبەتی

لە هەرسێ بەرگەکانی ئەم کتێبەدا, ئەو ڕەخنانەی بەشێوەیەکی تایبەتی لە هەرشۆڕشێك گیرابێت بەپێی سەرچاوەکان خراونەتە بەرچاوو لەم باسەدا هەوڵئەدەین ئەو ڕەخنانەی بەشێوەیەکی گشتی لە تێکڕای شۆڕشەکان گیراون باس بکەین و ئاماژە بەکورتە باسێکی ئەو سەرچاوانە بکەین کە لێیان دواون.

ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکان باسیان کردوە بریتین لە چەند خاڵێکی زۆر گرنگ کە زۆربەیان سوورن لەسەر ئەوەی ئەو هۆیانە هۆیەکی سەرەکی بوون لەسەر نەگرتنی شۆڕشەکانی یەك لەدوای یەکی باکووری کوردستان کە لێرەدا هەوڵئەدەین کورتەیەکی ئەو هۆ گرنگانە بخەینە پێش چاو و لەدواییدا ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوانەش دەکەین کەلەو باسە دواون:

١- بەرلەوەی حکومەتی عوسمانی پێك بێت و ببێت بە حکومەتێکی بەهێزی دەستەلأتدار لەناوچەیەکی فراواندا, کورد لەو سەردەمەدا لەباکوری کوردستانا خاوەنی چەند ئەمارەتێکی نیمچە سەربەخۆی پچڕ پچڕو لێك

دابڕاوی خۆی بوەو هەرئەمارەتە میرێك یا سەرکردەیەك بردوێتی بەڕێوە کە بەداخەوە ئەو میرە زۆر جار لەگەڵ سەرۆك و میرەکانی تردا ناڕێك بوەو هەوڵی لاوازکردنی داوەو ئامادە بوە وەکو ڕەوشتێکی عەشایریی زۆر کورتبینانە سەیری دواڕۆژی خۆیان و ئەمارەتەکەیان بکەن و ئامادەبوون بۆمانەوەی خۆیان و بۆ لەناو بردن و لاواز کردنی ئەمارەتێکی تری کورد لەگەڵ دوژمنێکی بێگانەدا هاوکاری بکەن.

ئالەو بارو دۆخەدا بوە کە شەرفخانی بدلیسی بەپێی چەند مەرجێك لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا ڕێك کەوت کەلەبەرگی یەکەمدا باسی ئەو ڕێکەوتن و مەرجانە کراوەو بەپێیی ئەو ڕێکەوتنە قەواڵەی طاپۆی ئەمارەتەکەی خۆی و هی ئەمارەتەکانی تر کە توانیبووی ئەمیرەکانیان قایل بکات کە هەموویان ببن بەوابەستەی دەوڵەتی عوسمانی(کە دوورنیە ئەمەی لەترسی صفویەکان کردبێت)هەمووی پێشکەش بکات بە خەلیفەی عوسمانی کەبەدرۆ ناوی خۆی نابوو خلیفەی ئیسلام کەلەبەرگی یەکەمدا بەدوورو درێژی لەباسی ئەمارەتەکانی کوردا لەو کارەساتە مێژووییە دواوین، ڕەخنەی زۆربەی ڕەخنەگران لەم ڕووەوە ئاراستەی شرفخان کراوە بەرادەی یەکەم و بۆ ئەو میرانەی تری کورد کە بەو پەڕی کورت بینی و ساویلکەیەتیەوە ئەو پێشنیازەی شرفخانیان پەسەند کردبوو.

بەداخەوە لەو ڕۆژانەدا هەروەکو چۆن تورکەکانی عوسمانی توانیبویان لەپاشەبەرەی مەغۆلیەکان و ئەو تورکانەی بەکۆچ وبار لەکاتی خۆیدا لە ڕۆژئاوای چینەوە گەیشتبونە ئەو ناوچەیەی ئیمڕۆ پێیی دەوترێت تورکیا حکومەتێکیان دروست کردو ئەگەرچی ئەو حکومەتی عوسمانیە لەسەرەتای دروستبوونیا و هەتا ماوەیەکی زۆریش تووشی دەیان گێرەو

کێشەی ناوخۆ بو بوو، برالەسەر کورسی ی سوڵتانی و لەسەر دەسەڵات برای خۆی دەکوشت و بگرە لەهەندێ جاردا باوکیش کوڕی خۆی لەناو بردە بەڵام لەئەنجامدا بۆ ماوەی چەند سەدەیەکی زۆر مایەوەو بەرگەی گرت و بووبەو ئیمپراتۆریەتەی ڕۆژئاوای ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو باکووری ئەفەریقای گرتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەمیرەکانی کورد بەلای ئەوەدا نەچوبون و هەوڵی ئەوەیان نەدابوو ئەوەی عوسمانیەکان بۆی چوبون تاقی بکەنەوە کە بێگومان قایل نەبوونی هیچ ئەمیرێکی کورد بەدەستەڵاتی ئەمیرێکی تر هۆی سەرەکی بوە بۆ بیرکردنەوە لەو تاقیکردنەوەیەو بێگومان شەرفخانی بدلیسیش ئەوەی لەخۆیدا بەدی نەکردوە کە بتوانێت ئەو ئەمارەتە کوردانە لەژێر دەستەڵاتی خۆیدا یا لەژێر دەسەڵاتی ئەمیرێکی ترا بکات بەیەك.

پاش ئەوەی عوسمانیەکان بەتەواوەتی بەسەر صفوییەکانا سەرکەوتن و وردە وردە توانیبویان ئەمارەتەکانی کورد لاواز بکەن و بیانکەن بەدوژمنی یەکتر ئیتر لەبەڵێنو پەیمانەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە کە دابوویان بەکوردو یەکە یەکە ئەمارەتەکانی کوردیان هەڵوەشانەوە.

٢-بێجگە لەکێشەی نێوان میرو سەرۆکەکانی ئەمارەتەکانی کوردو کێشەیەکیماڵوێرانکەری تر پەیدا بوو کە بریتی بوو لە کێشەی نێوان کوردی سوننی مەزهەب و کوردی علوی کەلەباسی سوارەی حمیدیەدا لەبەرگی یەکەمدا بەدوورودرێژ باسی ئەو دەردە کوشندەیەمانکرد کە چۆن تورکەکانی عوسمانی بۆ سوودی خۆیان لەکوردە سونیەکان ڕێکخراوێکی عەشایریی چەکدارنەیان دروستکردبوو لە شێوەی(قۆزاق)ەکانی ڕوسی قیصری و تورکەکان ئەم ڕێکخراوەیان بۆ دوو مەبەستی سەرەکی و بۆ سوودی خۆیان پێکهێنابوو یەکەم بۆ بەکار هێنانی ئەو هێزە بۆ پاراستنی

سنوورەكانی خۆیان دوهەم حكومەت ویستی لە رێگەی ئەو هێزەوە كورد بكات بە دووبەشەوەو رێگەی ئەوە بگرێت لە دوا رۆژدا یەك بگرێت كە لەراستیدا توركەكان لە هەردوو مەبەستەكەیانا سەركەوتنو بەكاریان هێنا بۆ سنورەكانی خۆیانو كردیشیان بەداردەستی خۆیان بۆ بەكار هێنانی دژی هەرلایەك بەرامبەر حكومەت بوەستایەو كوردە علوییەكان تووشی زیانێكی زۆربوون بەهۆی ئەو هێزە وە وەكو لەباسی سوارەی حمیدیە دا لێی دواینو ئەنجام بەوە گەیشت لەدوا رۆژدا هەر راپەرینو شۆرشێك سەركردەكانی بریتی بوونایە لە كوردی سوننی مەزهەب, علویەكان بەلایا نە دەچوونو هاوكارییان لەگەلاّ نە دەكردنو لە زۆر هەڵوێستدا دەبوون بەلایەنگری حكومەت دژی شۆرشی كورد كە نمونەی ئەمە لە شۆرشی پیرانو ئاگریداغدا بەئاشكرا روون بۆتەوەو كاتێكیش كوردە علوییەكان دژی جەورو ستەمی كاربەدەستانی توورك راپەرین, لەو راپەرینو شۆرشەی علوییدا كوردە سوننیەكان بەشدار نەدەبوون وەكو هەڵوێستی سوننیەكان لەكاتی شۆرشەكەی درسیمدا بەسەركردایەتی(سەید رەزا).

پرۆفیسۆر حسرتیان لەلاپەرە(٩٣)ی كتێبەكەیدا سەرچاوە(٤٥)باسی ئەوەی كردوە چۆن توركەكان سودێكی زۆریان وەرگرتبوو لەناكۆكیی نێوان سوننیەكانو علویەكان لەشۆرشەكانی باكوری كوردستاندا.

بەئاشكرا روون بۆتەوە كەلەگەڵ ئەوەشدا شێخ سعید بەناو چەند عەشیرەتێكی كوردی بیٚلایەنو هەندێك لەعەشیرەتە علویەكان گەرابوو بەلاٌم نەیتوانیبوو هیچیان بكات بە دۆستی خۆیو بەهاوكاری شۆرششەكەیو بگرە لەكاتی شۆرشەكەیدا هەندیٚ لەو عەشیرەتانەی هانای بۆ بردبوونو

داوای هاوکـاریکردنی لێکردبـوون لەناسـکترین کاتـدا بوبـون بەلایـەنگری حکومەت دژی شۆرشـی پیران.

جگە لەو تەقەلا بیّ سوودانەی درابوون بۆ پەیدا کردنی دۆستی ناوخۆ، سـەرکردەکانی شـۆڕش نـەیانتوانیبوو کـارێکی وابکـەن باسـی کێشـەی میللەتەکەی خۆیان بۆ میللـەتان ڕوون بکەنـەوەو ئـەو هـەوڵو تەقەلایانـەی سریا بدرخان دابووی بۆ موسوەگەر کردنی لایەنگریتی و یارمەتیدانی کورد لەوچوونەیدا بۆ ئەمـەریکا بـەهاوکاریی ئەرمەنیـەکان،ئـەوەی توانیبـووی بیکات بەشی ئەوەی نەکردبوو بتوانێت یارمەتیـەکی تـەواوی پـارەو چەك بۆ شۆرشەکەی ئارارات وە دەس بنێت.

لەڕاستیدا کـورد لەکۆنـەوە لـە سیاسـەتدا کـۆڵ بـوەو نـەیتوانیوە وەکـو میللەتان دۆستو دوژمنی خۆی لێك جیا بکاتەوە.

لـەو ڕووەوە دوکتـۆر عبـدالرحمن قـاسملو لەلاپـەڕە (٦٩)ی کتێبەکەیـدا سەرچاوە(١٦)ڕەخنەیەکی توندو تیژی لەکورد گرتوە دەربارەی ئەوەی کورد نەیتوانیوە دۆستو دوژمنـەکانی خۆی بەباشی لێك جیـا بکاتـەوەو بۆئەمـە دۆسـتایەتی کردنـی کـوردی لەگـەڵ(تاشـناق)ەکـانی هێناوەتـە بـە نموونـە کەلەمەدا قاسملۆ ئەگەرچی لە بۆ چوونەکەیدا نیوەی بۆ چوونەکەی ڕاست بوە بـەڵام لەهەندێکیشیا بەباشـی نیشـانی نـەپێکاوە , بـۆ ئەمـە لای وابـوە سۆڤیەتی ئەو ڕۆژانە تاقە جێگەیەك بوە کـە هیـوای کوردی تیـادا بەدی کـرا بـەڵام کـورد بـەلای ئـەوەدا نەچـوەو بـە پێچـەوانەوە ڕوویکردۆتـە دەوڵەتـە ئیمپریالیزمەکانو بەتەمای ئەوەبوە لە ڕێگەی ئەوانـەوە کورد بەمافی خۆی بگاتو لەو ڕووەوە وتوویەتی:

((لەبەر تەسکی بینینی سەرکردەکانی کورد, بەلای ئەوەدا نەچووبوون داوای یارمەتی لەدۆستە ڕاستەکانی کورد بکەن بەڵکو پشتیان بەستوە بە دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان لەوانەی تەنها بۆیە بوبون بەلایەنگری کورد کە تورکەکانی پێ لاواز بکەن))

قاسملۆ لەلاپەڕە(٧١)دا هێرشی بردۆتەبەر هاوکاریکردنی نێوان کوردو ئەرمەنیە تاشناقەکان پاش ئەوەی ئەو ئەرمەنیيانە هیوای ئەوەیان نەمابوو بەتەنها خۆیان بتوانن دژی تورکەکان بوەستن و بگەن بەمەبەستی خۆیان.

دەربارەی بەشی دوهەمی ئەم ڕەخنەیەی کەوتوویەتی تاشناقەکان دژی سۆڤیەت بون و وابەستەی دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان بوون بۆ چوونێکی ڕاستەو ئەو ئەرمەنیانەش لە قۆناغێکدا بەهاندانی وڵاتانی ڕۆژئاوای دەسبڕ بە شێوەیەکی دۆستانە نەچوبوونە پێشەوە لەگەڵ کورد داو چاویان بڕیبوە ئەوەی بەشێکی زۆری ناوچە کوردییەکان بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە بەنیازی پێکهاتنی ئەرمەنیای گەورە کەباسی ئەمەمان لە پەیمانی سیڤەردا بەدورو درێژ کردوەو پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە, بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕووداوە مێژووییەکان ئەوەیان سەلماندوە کەلە سیاسەتدا نە دۆستی هەمیشەیی هەیەو نە دوژمنی هەمیشەیی چونکە هەردوکیان بەندن بەوەی کەلە ڕووداوێکدا بەرژەوەندییان لەگەڵ یەکتردا یەك دەگرێتەوە یانا؟ لەڕاستیدا سۆڤێت لەسیاسەتیا هەر ئەم ڕێبازەی گرتبوەبەر.

لێرەدا ئەگەرچی ئەرمەنیەکان لەهەندێ هەڵوێستیانا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کوردا نەبوون بەڵام لەدواییدا کە هەڵەی خۆیان بۆ دەرکەوت ئیتر ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ یارمەتیدان و هاوکاریکردن لەگەڵ کوردا کە نموونەی ئەمە لەباسەکەی سریا بدرخاندا ڕوون بۆتەوە کە

چۆن ئەرمەنیەکان لە ئەمەریکا ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوە لە ڕونکردنەوەی تاوانەکانی تورك بەرامبەر بەکوردو لە شۆڕششەکەی ئاگریداغدا نوێنەری ئەرمەنیەکان لەکۆڕی شەڕەکانا لای احسان نوری پاشای سەرکردەی شۆڕششەکە بوون, ئایا بەپێی بۆچوونەکەی قاسملو, دەبوایە کورد ئەو یارمەتیانەو ئەو هاوکاری کردنەی ئەرمەنیەکانی پەسەند نەکردایە کەلەو ڕۆژانەدا بەئاشکرا تورکەکان دەستیان خستبوە بینەقاقای کورد بۆلە ناوبردنی؟... وەکو لە شۆڕشەکەی ئاراراتدا ڕوون بۆتەوە لەو ڕۆژە ناسکەدا ئەرمەنیەکان تاقە دەروازەیەك بوون کە لە ڕێگەیانا بگەنە ئەو شوێنانەی توانیبویان دەنگی بێزاریی خۆیان بەرز بکەنەوە.

ئایا ئەگەر کوردەکان ئەو پەیوەندییەی کە قاسملو ڕەخنەی لێگرتوە کورد لەگەڵ ئەرمەنیدا نەیبوایە تۆ بڵێی ئەوسا سۆڤیت لەبەر خاتری کورد وازی لەو پەیمانی دۆستایەتیە بهێنایە کەلەگەڵ تورکە کمالیەکان بەستبووی کە لە شوێنی خۆیدا باسمانکردوە کە بەئاشکرا یەکێك لەمادەکانی ئەو پەیمانە دژایەتیەکی تەواوی تیادا بەدی دەکرێت بەرامبەر کوردو بەڵگەی ئەمەش نموونەیەکی لەوباسەی دکتۆر عزیز شمزینیدا دەردەکەوێت کەلە لاپەڕە(٨٨)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٢)کەلەوەدا ئاماژەی بۆ ئەو نامەیەی حکومەتی ئارارات کردوە کەنێردرابوو بۆ قونسوڵخانەی سۆڤیت لە (ماکۆ) لەساڵی (١٩٢٨)دا کەلەونامەیەدا وترابوو:

((لەمەوبەر حکومەتی کورد لەئارارات نامەیەکی بۆناردبون بەڵام تائێستە هیچ وەرامێکی پێنەگەیشتوە. شیکردنەوەی بارودۆخی سیاسەتی ئیمڕۆ ئێمەی هێناوەتەسەر ئەوەی کەباوەڕی کورد وایە

بەبێ یارمەتی و پشتیوانی سۆڤیت ڕزگاری نابێت و مافی نەتەوایەتی خۆی دەسگیر نابێت و, بۆیە دەمانەوێ مەسەلەی خەباتی نەتەوەیی ڕزگاریخوازیمان لە (انتر ناسیونالی)دا باس بکرێت و چالاکی ی خۆمان لەگەڵ سیاسەتی سۆڤیتدا هاوجووت بکەین, هەلومەرجی ئیمرۆ بۆ گەیشتن بەو مەبەستەزۆر لەبارەو هەرکاتێك ئەم داخوازییەی ئێمەتان پەسەند کرد حکومەتی ئارارات ئامادەیە نوێنەرانی خۆی بۆ شوێنی دیاریکراو بنێرێت بۆ گفت وگۆ کردن بۆ ئەو مەبەستە)).

لەڕاستیدا,ئاخۆ داواکردنی یارمەتی لەدۆستێکی وەکو سۆڤیت لەوڕۆژەدا دەبوایە بەچ شێوەیەکی تربوایە بۆ ئەوەی سۆڤیت لای ئە کورد بکردایەتەوە؟؟

لام وایە دکتور قاسلو ئەگەر ئەم ڕاستی یانەی بزانیایە, بواری ئەوەی نەدەبوو لە کتێبێکی دکتۆراکەیدا کە لەولآتێکی سەربە سۆڤێتی ئەو ڕۆژانە دا دکتۆراکەی وەرگرتبوو باسی بکردایە.

بێجگە لەو ڕەخنەیەی قاسملو کەلە پەیوەندیکردنی کوردبە ئەرمەنیە تاشناقەکان و بەدەوڵەتە ئیمپریالیزمەکانەوە هەیبوە وەکو ئەو باسیکردوە, دوورنیە قاسملو ڕەخنەکەی لەوەوە دەست پێکردوە کە بەهۆی تاشناقەکانەوە کورد هەوڵی داوە پێوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتە ئیمپرلیزمەکانا پەیدا بکات لام وایە پێویستە بچینە سەر باسی دوو هەڵویستی جیاوازی دەوڵەتان بەرامبەر بەکورد کە دکتۆر قاسملۆ لای وابوە دۆستی کورد تەنها بریتی بوە لە یەکێتی سۆڤیت و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی, ئەو دەوڵەتانەی دژی سۆڤێت بون نەدەبوو کورد لێیان نزیك ببێتەوە...

له ڕاستیدا کورد هەوڵی دابوو تەنها لە سۆڤیت نزیك ببێتەوە کەلەهەموو تەقەلاکانیا لەو ڕووەوە کورد هیچی دەستگیر نەبوە, دەوڵەتانی تر, بەتایبەتی ئەوانەی لە (ئومەمیەتی دوهەمدا) بەشداریان کردبوو بەپێ پێوانەکەی قاسملۆ ئەوانە لەخانەی دوژمنانی کوردابوون بەلاّم ئەگەر بەووردی بچینە بنج و بناوانی باسەکە بۆمان دەردەکەوێت کە ئومەمیەتی یەکەم و سێهەم کەبەسەرکردایەتی سۆڤیت و دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی بەسرابوو, ئەگەرچی لە هەردووکیانا باسی چەوساندنەوەی میللەتانی ژێر دەستی ئیمپریالیزمیانکردوە و دروشمی مافی چارەنووسی گەلانیان بەرزکردبوەوە, بەلاّم لەهیچ کۆبونەوەو باسێکیانا باسی چەوساندنەوەی میللەتی کوردیان نەکردبوو لەهەموو بەشە داگیر کراوەکانیا, بەپێچەوانەوە ئومەمیەتی دوهەم کە حزبە ئیشتراکیەکان بەستبوویان لەکۆبوونەوەی مانگی ئابی(١٩٣٠)دا هەروەکو دکتۆر عزیز شمزینی لە کتێبەکەیدا سەرچاوە(٤٢)باسیکردوە لەو کۆبونەوەیەدا کەلەشاری (زوریخ)بەستبوویان بڕیارەکانیان ئەوانەی میلەتی کوردیان گرتبوەوە زۆر ڕونترو ئاشکرا تربون بەرامبەر بەمافی کوردو دەربڕینی هەستی ئەو اشتراکی یانە دژی هەڵوێستی حکومەتی فاشستی تورك بەرامبەر کورد بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا شتێك نەبوە کە بەنەهێنی بووبێت.

لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو تاشناقانەی کە قاسملۆ ڕەخنەی لە دۆستایەتی کردنیان گرتوە یاداشتێکیان دابوو بەبەشداربوانی کۆنگرەی حزبە اشتراکیەکان دەربارەی مافی کوردو ئەو تاوانەی تورکەکان لەکوردەکان کردبوویان کە یاداشتەکە بەم شێوەیەبوە:

((مەسەلەی کورد باسێکی زۆر گرنگە بۆ ئەم کۆنگرەیەو ئەگەر ئەو کێشەیە چارەسەر نەکرێت ئەمە دەبێتە هۆی نەبوونی ئاشتی و نائارامی لەناوچەکەداو دەبێتەهۆی ئەوەی تورکەکان لە ئومەمیەتی سێهەمدا کێشەی کورد بقۆزنەوە، لەبەر ئەوە لایەنگرێتی ئومەمیەتی دوهەم بۆ کورد دەبێتە وەرامدانەوەیەك بۆ ئەوانەی لایەنگری هەڵوێستی سۆڤێت دەبن))

بلەچ شێرکوە لە لاپەرە(١١٧)ی کتێبەکەیدا سەرچاوە(٦٠)باسی ئەوبریارە تایبەتیەی لێژنەی تنفیذی مکتبی کرێکارانی اشتراکیەتی دولی کردوە کەلە(١٩٣٠/٠٨/٣٠)دا دەربارەی کورد دەریانکردبوو هەروەکو دەقەکەی لە رۆژنامەی (الاهرام)ی رۆژی(١٩٣٠/٠٩/٠٩)دا وەکو خوارەوە بلآوکراوەتەوە:

((لێژنەی تنفیذی مکتبی کرێکارانیاشتراکیەتی دولی(مەبەستی لەئومەمیەتی دوهەمە کە حزبە اشتراکیەکان نەك کۆمۆنیستەکانی تیایا بەشداربوون) ئەو کوشتارانەی حکومەتی تورك دەیکات لەو کوردانەی بۆ ئازادیو سەربەستی خۆیان تێدەکۆشنو ئەوانەش کە بەشداریان نەکردوە لە خەباتی کوردا تورکەکان دەیانەوێ چی یان بەسەر ئەرمەنیەکانا هێنابوو کوردیش بەو دەردە ببەن بەبێ ئەوەی رایی گشتی جیهانی ناڕەزاییو بیبێزاری خۆی دەرببڕێت بەرامبەر بەم دڕەندەیەتیەی تورکو دوورنیە دەسدرێژیش بکەنە سەر وڵاتی فارسو ئەمە روونی دەکاتەوە کۆمەڵی گەلان(مەبەستی عصبە الامم) توانای ئەوەی نیە میللەتە بێ هێزو بێ دەسەلآتەکان لە دەسدرێژیکردنی دەوڵەتەکان بپارێزێت.

لەبەر ئەمە هەیئەتی تنفیذی داوا لەهەموو جیهان دەکات بێزاری خۆیان دەربڕن بەرامبەربەو کارەساتە خوێناویەی بەرامبەر بەکورد دەکرێت))

بله چ شێرکوه لەهەمان کتێبیا ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەی(میلیت)ی تورك کردوه کەلەو ڕۆژنامەیەدا وتراوە: لەدوای شکانی شۆڕشی ئاگریداغ: ئەمە گۆڕی خەیاڵی کوردستانە.

(بله چشێرکوه بۆ وەرامی ئەوباسە ڕۆژنامەی میلیت وتوویەتی:دەبوایە بی نووسیایە: گۆڕی سەربازی نەناسراو لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا...)




**كۆڕی خەباتی كوردستان/ڕۆژنامەی میلیت**

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە:

ڕاستە ئەو دەوڵەتانەی حزبە اشتراکیەکانیان لە ئومەمیەتی دوهەمدا بەشداریانکردبوو وەنەبووبێ ئەو حکومەتانەیان لەوەی سۆڤیت پاکترو ڕاستربووبن بەرامبەر بە ئازادیو بەرامبەر بەمافی میللەتانو ئەوەش کەلە ئومەمیەتی دوهەمدا ناوی کوردی تیادا باسکراوە تەنها بریتی بوەلە دەربڕینی بێزاریی ئەو حزبە اشتراکی یانە نەك هی دەوڵەتەکانیان, بەڵام ئایا نەدەبوو لە ئومەمیەتی سێهەمدا کەیەکێتی سۆڤێت جڵەوی گرتبوە دەستو بڕیارەکانی ئومەمیەتی دوهەمی ڕیسوا کردبوو, ئایا نەدەبوو بەقسەش بوایە شتێکی دەربارەی کورد دەربکردایە بەرامبەر بەوتاوانە زۆرەی تورکەکان لەکوردیان کردبوو؟؟!!

لام وایە قاسملۆ دەبوایە ڕووی دەمی ڕەخنەکەش بکردایەتە سۆڤێت کە بەهیچ شێوەیەك باسی کوردی نەکردوەو بێگومان تائەو ساش هێشتا سۆڤێت هەر ئومێدی لەوە نەبڕابوو کە هەوڵبدات تورکیا بەلای خۆیدا دابشکێنێتو ڕێگەی پێ نەدات بچێتە باوەشی وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە کە لەدواییدا لەپەیمانی(سعداباد)دا کەلەساڵی (١٩٣٧)دا مۆرکرا بەئاشکرا بووبە کوتەکی دەستی ئەو دەوڵەتانەو لەژێر سێبەری مادەکانی ئەو پەیمانەدا ئەوەندەی تر کورد بچەوسێنێتەوەو هەوڵی توانەوەی کورد بدات لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا..

لێرەدا شتێکی مێژوویش هەیە نابێ لێی نەدوێن ئەویش ئەوەیە جیاوازیی سۆڤیتو دەوڵەتە ئیمپریالیزەکان ئەوەبوە سۆڤێت ئەگەرچی بەڵێنی بەکورد نەدابوو, بەڵام دەستیشی نەبڕیبوو بە بەڵێنی درۆ ئەگەرچی لەوەی کۆماری کوردستاندا لە مەهاباد پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکرێت کە

یەکێك لەو هۆ گرنگانەی سۆڤێت دەسبەرداری ئەو کۆمارە بو بوە, بریتی بوەلەو گفتوگۆ نهێنیانەی لەگەڵ (توام السلطنة)دا کرابو کە بەدرۆ بەڵێنی دابوو بە سۆڤێت کەنەوتی باکوری ئێران بخاتە ژێر دەسەلاتی سۆڤێتەوە.

بە کورتی بۆ وەرامی ڕەخنەکەی دوکتۆر قاسملۆ, هەرچەند لەبەرگی دوهەمدا, لەباسی پەیمانی سیڤەردا باسی هەندێ هەڵوێستی سۆڤێتمان کردوە, بەلام لێرەشدا جێی خۆیەتی ئامارە بۆ هەندێ لەو سەرچاوانە بکەین کە بەڵگەی ئەوەیان داوە بەدەستەوە کە کورد جگە لەو داخوازییەی لەلایەن شۆڕشگێڕانی ئاگریداغەوە بۆ سۆڤێت نێرابوو جارەها داوای یارمەتیی لەسۆڤێت کردوە بەلام بەداخەوە سۆڤێت بەدەنگ ئەو داخوازییانەوە نەچوە کە ئەمانە نمونەیەکن لەو ڕاستی یە:

١- کورد هەرلە تەقەلا بێ سوودەکەی شێخ مەحمودەوە کە ساتێك ملیکی کوردستان بوەو ئیمپریالیزمی بریتانیا گەڕی لە شێخ مەحموسو حکومەتەکەی ئالأندبوو بۆ ئەوەی لەناوی ببات, هەروەکو لەلاپەڕە(٤١٩)ی بەرگی دوهەمی کتێبەکەی شێخ مەحمود دا سەرچاوە(٨٠)نامەکەی شێخ مەحمودمان بلأوکردۆتەوە کە بۆ سۆڤێتی ناردبوو, بەلام لەلایەن حکومەتی سۆڤێتەوە وەرامی نەدرابوەوە.

بێجگە لەو تەقەلا دانەی شێخ مەحمود سمکۆ شکاکیش هەوڵێکی لە هەمان جۆری دابوو لەگەڵ سۆڤێتداو(ئەحمەد تەقی)ی کردبوو بەنوێنەری خۆی بۆ ئەوەی ئەو داخوازییەی بگەیەنێتە کاربەدەستانی سۆڤێت هەروەکو لەکتێبی(سمکۆو بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد)چاپی سوید ساڵی (١٩٩٥) بەدورو درێژی باسمکردوە ئەو هەوڵ وتەقەلادانەی سمکۆش هەربێ سوو، بوە.

سەیر ئەوەیە قاسملۆ خۆشی لەلاپەڕە(١١٢)ی کتێبەکەیدا دانی بەوەدا ناوە کە سۆڤێت نەیویستبو یارمەتی کورد بدات لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا لەباسی سێهەمی بەشی دووهەمدا ناوەڕۆکی ئەو دوکیومنیتەمان بڵاوکردۆتەوە کە سۆڤێت بە ئاشکرا نەیویستبوو یارمەتیی کورد بداتو خۆ هەڵوێستی سۆڤێت بەرامبەر کۆماری کوردستان لەمەهاباد شتێك نیە چاوی لێ بپۆشرێو پینە بکرێت وەکو بەرلەمەش ئاماژەمان بۆ کردوە.

بەو شێوەیە دەردەکەوێت لەکاتێکدا کە کورد لەژێر فشاری حکومەتی فاشستی تورکدا بوەو بەهاوکاریو لایەنگرێتی ئەمریکا کۆماری کوردستان ڕووخێنرا, لەهەردوکیان سۆڤێت بەدەنگو هاواری کوردەوە نەچوە.

لەکۆتایی ئەو ڕەخنەیەی دکتۆر قاسملۆدا دوو هەڵوێستی تری سۆڤێتیم هاتەوە بیرکە هەردوکیان لەیەك ناچنو نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە کە سۆڤێت هەمیشە سەیری پەرژەوەندیی خۆی کردوەو زۆربەی ئەو دروشمانەی بەرزی کردبوەوە ووشەی سەر کاغەزبون.

هەڵوێستی یەکەم بریتیەلەوەی لەساڵی(١٩٦٣)دا فاشستەکانی بغداد بەشمندوفەری ئەمریکا هاتنو بغدادیان داگیر کردوو دەستیانکرد بەکوشتنو قەلاچۆکردنی ئازادیخوازانی عراق کە حزبی کۆمونیستی عراق لەهەموان زۆرتری لێ کوژراو خرانە ناو زیندانەکانەوە, بەرامبەر بەم هەڵوێستە دڕندانەیەی فاشست ڕۆژنامەی پراڤدا لەلاپەڕە(٩٥)ی حزیرانی(١٩٦٣)دا باسێکی بڵاوکردەوە بەناوی((ئەو تاوانانەی لەعراقدا دەکرێت بیان وەستێنن)) هەروەها لەژمارەکانی ڕۆژی(٢٠)یونیوو لە(١٠)یتموزی هەمان ساڵدا باسی دوو تاوانی تری ڕژێمی بغدادی کردوە یەکەمیان دەربارەی ئەو جینۆسایدەی لە کوردی باشوور کرابوو لەلایەن هەمان ڕژێمەوەو دوهەم باسی ئەوەی کردوە نوێنەری سۆڤێت وەکو لەبراڤدا

ژمـارەی ڕۆژی(١١)ی تمـوزدا بـڵاوی کردبـوەوە بێزاریـی خـۆی دەربڕیبـو بەرامبـەر بەو تاوانـەی لەکوردسـتاندا دەکرێـت (کە بێگومـان هـەردو بێـزاری دەربڕینەکە لەوکاتەدا بوە کە سۆڤێت ڕژێمی بغدادی بەنەیاری خۆی حساب کردوە کەچی هەمان ڕژێمی بغداد کەلە دواییدا بون بەدۆستی سۆڤێت‌و ئەو تاوانـە گەورەیـەی هڵبجـەیانکرد کـە بـەغازی ژەهـراوی حـەوت هـەزاریان لەناوبرد، ڕۆژنامەی پراڤدا بەو پەڕی بێ شەرمیەوە بڵاوی کردەوە کە درۆیە حکومەتی عراق. غازی ژەهراویی لە هڵبجەدا بەکار نەهێناوە دژی کورد...

ئـەوی شـایانی باسـە بەرامبـەر بەهەڵوێسـتی سـۆڤێت لـەکاتی خۆیدا(جاسمی جلیل)کە ئەندامێکی حزبی شیوعی بوەو ئەندامی یەکێتی نووسەرانی سۆڤێت بوە یاداشتێکی دابوو بە (گۆرباچۆڤ) لەوەدا بێزاری خۆی دەربڕیبوو..

بێجگـە لـە جـاسمی جلیلـی، لـەو کۆنگرەیـەی لەناوەڕاسـتی مـانگی ئۆکتوبـەری(١٩١٩)دا لـەپاریس بەسـترا پرۆفیسـۆر(نـادر نـادروف)وتـارێکی خۆی بڵاوکردەوە دەربارەی ئەو هەڵوێستە نامبدئیەی سۆڤێت‌و وتـی: خـەڵك لەیـەکێتی سـۆڤێتدا شتیان لێ شـاراوەتەوەو نـەیان هێشـتوە ئاگـاداری ئـەو تاوانە گەورەیە بن کە لەکورد کراوە.

لەبەشـی یازدەهـەمی باسـی شۆڕشـی ئاگریداغـدا باسـی چـەند هەڵوێستێکی سۆگیتیمان کردوەو پێویست ناکات لێرەدا دوبارەی بکەمەوە.

٢- ئایـا لەسـنوری ئـەو ڕەخنەیـەی دوکتـۆر قـاسملۆ لـە شۆڕشـگێڕانی کـوردی گرتـوە کـە داوای یارمـەتی یـان لـە سـۆڤێت داوانـەکردبوو، بـەڵکو بەتـەمای یارمـەتیی دەوڵەتـە ئیمپریالیزمـەکان بـوون، تـۆ بلێـی ئەگـەر شۆڕشگێڕانی کورد لە شۆڕشی پیراندا کە تورکەکان بەئاشکرا ویستبویان کـورد لـەناو ببـەن، داوایـان لـە سـۆڤێت بکردایـە تۆبڵێی سۆڤێتی دۆسـتی

تورکی کمالی کە پەیمانێکی دۆستانەیان لەنێواندا هەبوە وازی لەو دۆستایەتیە بهێنایە؟ یاهەر هیچ نەبوایە فشاری بخستایەتە سەر ئەو حکومەتە تورکەی دۆستی بەو شێوە دڕندانە ڕەفتار لەگەڵ کوردو لەگەڵ دانیشتوانی بێ تاوانیان نەکات.

دوورنیە تورکەکان هەروەکو لە باسی شۆڕشی پیراندا بەدوورو درێژی باسکراوە, هەوڵیان دابوو لەووڵاتان بگەیەنن شۆڕشەکەی کورد بەهاندان و بەیارمەتیی حکومەتی بریتانیا بوە کە لەدواییداو بەپێی ئەو سەرچاوانەو ئەو دوکیومیتانەی ئاماژەمان بۆکردوون دەرکەوت ئەمانە هەمووی پڕەپاگەندەو درۆو دەلەسەی کاربەدەستانی تورك بوەو تۆبڵێ موخابەراتی سۆڤێت کە بەکونی دەرزیدا دەچوون ئەوەندە گەمژە بووبن لەدرۆو دەلەسەکانی تورك نەگەیشتبن و سەیر ئەوەشە ئەو درۆو دەلەسانەی تورك کارێکی وایکردبوو سۆڤێتەکان شۆڕشەکەی پیران و سەرکردەکانی ئەو شۆڕشەیان بەوابەستەی ئینگلیز دەزانی و یەکێکی وەکو شێخ عەبدالقادری شمزینی کە گیانی خۆی لە پێناوی ئازادی و مافی میللەتەکەی خۆیدا پێشکەشکرد سۆڤێتەکان بە شۆرشگێرێکی سەربە ئیمپریالیزیان لەقەڵەم ئەداو تاماوەیەکیش ئەو کوردانەی لە سۆڤێدا بیان ویستایە دوکتۆرا لەشۆڕشەکانی کوردا وەربگرن یاباسی ئەو شعرانەشیان بکردایە کە بۆ شۆڕشگێڕە شەهیدەکانی کورد وترابوون دوکتۆراکەیان پەسەند نەدەکرا کە ئەمە باسێکی زۆر دورو درێژەو ئەو کوردانەی بۆ خوێندن و بۆ دراسەی ئەوباسانە بچوونایە بۆ سۆڤێت کە پەیوەندی بۆ شۆڕشەکانی باکوورەوە هەبوو هەریەکەیان دەردی سەریی خۆی لەلایە کە چۆن لەو ڕوەوە بەئاسانی نەیانتوانیبو مامۆستاکانیان واڵێ بکەن کە شۆڕشەکانی کوردی باکوور بە شۆڕشێکی دژی ڕژێمێکی فاشست لەقەڵەم بدەن.

*باسی دووەمی*

## ئەو دەرس و پەندانەی پێویستە لەبەسەرهات و ڕووداوەکانی باکووری کوردستان سوودیان لێ وەربگیرێت

مێژووی میللەتان بۆ ئەوە دەنووسرێت کەبەسەرهات و ڕووداوە گرنگەکانی ئەو میللەتەی تیادا تۆمار بکرێت بۆ ئەوەی نەوەی دواڕۆژی هەر میللەتێك ئاگاداری بەسەرهات و ڕووداوەکانی وڵاتی خۆی و جیهان بێت و بزانێت هۆی ئەو ڕووداوانە چیبوەو چۆن ڕویداوەو بەچی گەیشتوەو هۆی سەرکەوتن و ژێر کەوتنی ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەی میللەتەکەی خۆی کردوێتی چیبوە بەمەبەستی سوود وەرگرتن لێیان و لەناو میللەتانی جیهاندا نەتەوەی کورد مێژوویەکی تاڵ وترش و پڕ لەکێشەو چەرمەسەری بوەو زنجیرەلێك نەپچڕاوەکانی ئەو کارەسات و بەسەرهاتانەی بەسەر کوردا هاتوون بەدە کتێب و بیست کتێب کۆتایی نایەت، بەڵام بەداخەوە تائێستە میللەتی کورد نەیتوانیوە وەکو میللەتانی تر دەرس و پەند لەڕووداو بەسەرهاتەکانی ڕابردوو وەرگرێت و ڕێگەنەدات بەدووبارە بوونەوەی ئەو هەڵە زلانە کراوەو ئەکرێت.

بێجگەلـەو کتێبە مێژووییانـەی لـەم سـەردەمەدا لەلایـەن چـەند پسپۆڕو مێـژوو نـووس‌و شـارەزایانی خۆمانـەوە نووسـراون‌و بلاوکراونەتـەوە, لـەڕابردوودا لەچـەند سەرچـاوەیەکی کـەم بـەولاوە کـە نووسـەرانی کـورد تۆماریـانکردوە وەکـو شـرفنامەکەی بـدلیس ئـەو سەرچاوانە تـر کـە باسـی مێژووی کوردیان تۆمار کردوە بریتـی بوون لـە نووسـەران‌و مێژوونووسـانی بێگانـە, بەدۆسـت‌و نـەیارەوە, بەشـارەزاو نەشـارەزاوەو ئەمانـە هـەموویان بەسەرچـاوە بـۆ نووسـەرانی خۆمـان‌و بێگانـەو لـە کتێـب‌و نووسـینەکانا ئاماژەیان بۆ کراوە.

بەداخەوەلەبـەر نـەبوونی حکومـەتێکی کـوردیی دەسڕۆیو کـە دەرفـەتی ئەوەی تیـادا هـەبوو بێـت نووسـەرانی خـۆی مشـووری تۆمارکردنی ڕووداوو بەسەرهاتەکان بن بۆ ئەوەی ببن بەسەرچاوە بۆ بەراورد کردنـی ئـەو ڕووداو بەسـەرهاتە تۆمـار کراوانـە لەگـەڵ ئـەوەی نووسـەری بێگانـە دەربارەی کـورد نوسـیویانە, بۆیـە زۆرجـار دوژمنـی کـورد لـەو کەلێنـەوە دەرفەتیان هێنـاوەو ئـەو بۆشـاییەی لەقۆناغـەکانی مێـژووی کـوردا هـەبوە بەئارەزووی خۆیـان‌و دەستڕۆ بوو کاربەدەستانی حکومەتەکانی خۆیان زۆرجار مێژووی کوردیـان چەواشـەکردوەو بەشـێوەیەکی ڕاسـت‌و دروسـت ڕووداوەکانیـان تۆمـار نەکردوەو گەیشتوەبەو ڕادەیەی هەندێ لەنووسەرانی بێگانە مێژووی کوردو ڕەگەزی کوردیان تێکەڵ کردوە بەئەفسانەو چیرۆکی جنۆکەو خێوو کەسیش نـەبوە لـەکاتی خۆیـدا وەرامـی ئـەوکارە ناڕەوایـەو ئـەو درۆو دەلەسـانەیان بداتـەوە, بۆیـە ئـەرکی نووسـەرانو مێژوونووسـان‌و شـارەزایانی کـوردە بـەو هەموو سـەرچـاوە گومـان لێکراوانـەدا بچنەوەو بژاریان بکـەن‌و بەشێوەیەکی زانیاریانـەو بەبەڵگـەی مێـژوویی کـە جێگـەی بـاوەڕبن ئـەو هـەموو درۆو

دەلەسانە پوچەڵ بکەنەوە بۆ ئەوەی ڕاست لەدرۆ جیا بکرێتەوەو میللەتان بەباشی لەمێژووی کورد بگەن.

دەربارەی ئەم هەوڵو تەقەلادانە پێویستو پیرۆزە، ماوەیەکە بەتایبەتی لەشەڕی جهانیی یەکەم بەدواوە هەندێ لەشارەزایانو مێژوونووسانی کورد لەوانەی دڵیان بەمیلەتەکەیان سووتاوە ئەم ئەرکە پیرۆزەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیانو بەتایبەتی لە دوای ئاشکرابونی بەڵگە نهێنەکانی ناو ئەرشیفی وڵاتان کە زۆربەیان ناوەڕۆکەکانیان لەکاتی ڕووداوو بەسەرهاتەکانا تۆمار کراون گەلێك بەرهەمی بەنرخ تۆمارکراوە، کەیەکێك لەوانە کتێبە بەنرخەکەی مامۆستای مێژوونووسی گەورەی کورد، مامۆستا ئەمین زەکی بەگە کە بۆیەکەم جارلە سەرەتایی ساڵی سی‌یەکانا ئەوبەرهەمە بەنرخەی بەناوی(پوختەی مێژووی کوردو کوردستان) چاپکردوە بڵاوی کردۆتەوە بێگومان بێجگە لە ئەمین زەکی بەگ گەلێك مێژوونوسی تر توانیویانە هەتا ڕادەیەك گەلێك لەو کەلێنانەی لەمێژووی کوردا هەستی پێکرابوو پڕی بکەنەوەو لەم باسەدا هەوڵئەدەین، ئەوباسە گرنگو بەسوودەی ئەمین زەکی بەگ لەکتێبەکەیدا دەربارەی ئەو کەمو کوڕی‌یانەی لەشۆڕشەکانی کوردا بەدیی کردوە کە ئەو باسەی ئەو لەگەڵ ئەم باسەی ئەم بەشەدا یەك دەگرێتەوە، کورتەیەکی پێشکەشی خوێندەواران بکەین. بەرلەوەی بچینە سەر ئەو باسەی ئەمین زەکی بەگ، داوای لێبووردن ئەکەم لەو هەموو کەسانەی کە خۆیان بە ڕێبەرو بەسەرکردەی بزووتنەوەو ڕاپەڕینو شۆڕشەکانی کورد زانیوەو دەیزانن کە لێرەدا بەو پەڕی بێلایەنێتیو دوورلە عاطفەو لایەنگرێتی ئەمو ئەو ئەم ڕەخنە ڕاستو ڕەوانە پێشکەش بە هەندێکیان بکەم کە پوختەی ئەو ڕەخنەیەم هەرلە

بۆچوونەکەی ئەمین زەکی بەگەوە وەرگرتوزە کەلەباسەکەیدا لەزۆر شوێندا داخ و خەفەتی دڵ و دەروونی خۆی هەڵرشتوە بەرامبەر بەو نەشارەزایی و لێنەهاتوییەی هەندێ لە ڕێبەرانی کورد لەوانەی جڵەوی شۆڕشیان گرتۆتە دەست و هەموو جارێکیش هەوڵ و تەقەلاکانیان لەبەرناکامی و نەشارەزایی بێسوود بوە.

ڕەخنەش بریتیەلەوەی زۆربەی ئەوانەی ڕێبەرایەتی شۆڕشەکانیان کردوە مێژووی بەسەرهات و ڕووداوەکانی بەرلە خۆیان نەخوێندۆتەوەو ئەگەر هەندێکیشیان خوێندبێتەوە لێی تێ نەگەیشتون و ئەگەر تێشی گەیشتبن سوودو پەندیان لێ وەرنەگرتوەو بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە بەزنجیرە یەک لەدوای یەک هەڵە زەق و ئاشکراکانی خۆیان دووبارە کردۆتەوە و هەروەکو فۆتۆکۆپیی یەکتر هەمان هەڵەیان دووبارە کردۆتەوە و بەداخەوە زۆریشیان لەوانەنین بەرگەی هیچ ڕەخنەلێگرتنێك بگرن و ڕۆژێك لە ڕۆژان دانیان بەو کەمو کوڕییانەی خۆیانا نەناوە.

ئای لەو هەناسە ساردو قوڵەی هەڵم کێشا دوای خوێندنەوەی یەکێك لەو دوکیومنیتانەی وەکو بەڵگەیەکی مێژوویی ئەو مۆرەیان ناوە بەسەر ناوچەوانی کوردا کە لەدۆکیومنیتی ژمارە(C.O.730-6-9700)ڕۆژی(٢٨)ی ئۆکتۆبەری(١٩٢١)لەناو دۆکیومیتەکانی ناو ئەرشیفی وزارەتی دەرەوەی بریتانیادا(کەوا دیارە بەپێی مێژووی دوکیومینتەکە دەبێ مەبەستی کاتی ڕاپەڕینەکەی کوجگیری و درسیمی یەکە مە کەلەبەرگی دوهەمدا بەرلە شۆڕشی پیران باسمانکردوە)، ئابەم شێوەیەی خوارەوە لەو ڕۆژانەدا باسی کوردی کردوە:

((پێرسی کوکس–مندوبی سامی بریتانیا له بغداد–میسوپۆتامیا–دژی ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك یارمەتی کورد بدرێت چونکه لای وایە ئەو یارمەتیدانه هیچ سوودێکی نیەو زیانی بۆ بریتانیا دەبێت)).

لەهەمان دوکیومنیتدا باسێکی(BULLARD)ی تیادایەو وتوویەتی:

((کوردەکانی باکوور بەهیچ شێوەیەك لەناو خۆیانا یەکناگرنو شۆڕشو ڕاپەڕینەکانیان هەمووی پچڕ پچڕو لێك ترازاوەو هیچی بەسەر هیچەوە نیەو هیچ لایەکیان لەگەڵ لاکانی تردا هاوکاری ناکاتو ئەو شۆڕشانە جارێك لە بدلیسو دیاربکرو درسیمو جارێکی تر لەشوێنێکی تردا هەڵدەگیرسێت که ئەو ڕاپەڕینەی دوایی کەله(شرناخ)دا کرا نمونەیەکی ئاشکرایەو هیچ گومان لەوەدانیه شۆڕشی هیچ ناوچەیەك بەتەنها سەرناکەوێتو بەتەنها خۆی پێ ڕاناگیرێتو بەرگەی سوپای ڕێكوپێکی پڕ چەکی تورك ناگرێت بۆیە یارمەتیدانمان بۆ هیچ لایەکیان سوودی نیه)).

ئالێرەدا خەفەتی ئەو هەڵوێستەی کورد لەدڵو دەروونندا زۆرتر پەنگ دەخواتەوە کەهەتا ئێستە نەیتوانیوە سوود لەو کەمو کووری یانەی خۆی وەربگرێتو تائێستە نەیتوانیوە ستراتیجیەتێك بۆ بزووتنەوەکانی لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا لەڕێگەی ڕێکخراوێکی لێهاتووەوە دەستنیشان بکات وەکو چۆن میللەتانی تر لەو قۆناغەی کوردا لەڕێگەی پێکهێنانی کۆنگرەیەکی کوردستانیەوە ئەو ستراتیجیە دەستنیشان بکات بۆئەوەی ببێت بەڕێنمای شۆڕشگێڕانو سەرکردەکانی شۆڕشەکانو بۆئەوەی هەرلایە بەهەرەمەیيو بەلەیەکترازان لەیەکتر جارلەدوای جار شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی کورد لەبارنەبەن که هەموو جارێك لەماڵ وێرانيو کاولبوونی کوردستان بەولاوە هیچ سوودێکی تریان نەبوە دەربارەی ئەو پەندو

نەسیحەتو دەرسانەی کە پێویستە لەبەسەرهاتو ڕووداوەکانی کوردستان بەشـێوەیەکی گشـتیو لەڕاپـەڕینو شۆڕشـەکانی بـاکوور وەربگرێـت، مامۆسـتای مێژوونووسـی کـورد ئـەمین زەکـی بـەگ لەلاپـەڕە(٢٤٤)ی کتێبەکەیدا بـەرگی یەکـەم سەرچاوە(٣٢) باسێکی دوورودرێـژو ووردی زۆر بەنرخی تۆمار کردوە کەلەڕاستیدا لەدوای خوێندنەوەی ئەوباسە چڕوپڕەی ئەمین زەکی فلیمێکی سینەمایی دێتەبەرچاوو لێرەدا باسەکەی ئەو وەکو خۆی چۆنی تۆمارکردوە پێشکەشی دەکەین.

ئەمین زەکی لەوباسەیدا بەقووڵایی مێژوودا چوەو لەدێر زەمانـەوە باسـی پەیوەندیی کوردو میللەتەکانی دراوسێی کردوە کە کورد چەند خزمەتی ئەو میللەتانـەی بـەخۆڕایی کـردوەو ئەنجامیشی بـەوە گەیشـتوە حکومەتـەکانی ئەو میللەتانە هەمیشە کوردستانیان کاولکردوەو کوردیان چەوساندۆتەوە کەلەمەدا کورد خۆی تاوانباری سەرەکی بوە لەو ڕووداوانەی بەسەریا هاتوە هـەروەکو ئـەمین زەکـی بـەزنجیرە ئامـاژەی بـۆ زۆربـەی ئـەو بەسـەرهاتو کارەسـاتانە کـردوەو داوای لـەکورد کـردوە دەرسو پەنـدیان لێوەربگـرن بـۆ ئەوەی لەوە زیاتر تووشی ماڵ کاولیو ماف خوراوی نەبن کە باسـەکەی بـەم شێوەیە دەست پێکردوە:

((بەشـێوەیەکی گشـتی دەتـوانین بڵـێین ئـەو هـەموو شـۆڕشو بزوتنەوانـەی کـە کـراون لەشۆڕشـەکەی کـوڕی(جانصـۆلاد-جـانبلاط-کـەمانای لەشـی پـۆڵایین دەگرێتـەوە)کـە لەبنەماڵـەی(ئـەمیر حسـن)بـوە کەسـاتی خۆیبگلربـەگی(حلـب)بـوە کەلەلایـەن حکومـەتی عوسمانیـەوە دامـەزرابوو، بـەڵام لەدواییـدا کـوڕی جـانپولاد لەحکومـەتی عوسمـانی هەڵگەڕایـەوەو لەسـاڵی (١٠١٦)ی کۆچـیدا بەرامبـەر سـاڵی (١٦٠٧)ی

زایین شەڕێکی گەورە لەنێوان ئەو و حکومەتی عوسمانیدا ڕوویداو لەدواییدا جانبولاد ناچاربوو خۆی بگەیەنێتە ئەستمبوڵو داوای لێخۆشبوونی لێ بکاتو سوڵتان لێی خۆشبوو کوردی بگلریەگی (تمشوار)کە یەکێك بوو لەناوچەکانی وڵاتانی نەمسا(کەدیارە ئەوکاتە لەلایەن عوسمانیەکانەوە داگیر کرابوو)، بەڵام(مرادپاشا)ی خوێنڕێژ ئەمەی بەدڵ نەبوو بۆیە جانبولادی کوشت لەکاتێکدا کە خەریك بوو بچێت بۆ ئەو ویلایەتە.

ئەمین زەکی لەلاپەڕە(٢٤٥)دا وتوویەتی ئەگەرچی (میر علی)ی کوڕی جانبولادیش لەدوای یاخی بوونی لەحکومەتی عوسمانی لەماوەیەکی کەمدا توانیبووی حکومەتێکی بەهێز دروست بکات بەڵام حسابی ئەوەی نەکردبوو لەئەنجامدا بەرگەی هێزەکانی حکومەتی عوسمانی ناگرێتو ئەوەبوو(قۆیوجی مراد پاشا)بە هێزێکی چل هەزارکەسییەوە کە هەرلەکورد دروستکرابوو پەلاماری داو حکومەتەکەی هەڵوەشانەوە ئەمین زەکی لەباسەکەیدا لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

ئەو ڕاپەڕینەی(میر علی)ی کوڕی جانپۆڵادو ئەوەی ئەمیر خانی برادۆستو تەیموور پاشای میللیو کوڕەزاکانیو شۆڕشەکەی ئیبراهیم پاشای میللی هەمووی بۆ یەك مەبەست بوەو دەربارەی ئەمە ئەوباسەی(میجر-میلنگ)نوسیویتی ئەم بۆچونەی ئێمە (ئەمین زەکی) پەسەند ئەکات میللەتی کورد لەزەمانی کۆنەوە توانیویەتی بوونی نەتەوایەتیی خۆیو ڕەوشتو خووی خۆی بپارێزێت لەگەڵ ئەو هەموو ڕوەداوانەی بەسەریا هاتبوو کەلەو ڕوەوە میلنگن وتوویەتی:

((ئەو ڕووداوانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەکوردستانا ڕوویدابوو دەری ئەخەن کە هەستێکی نەتەوایەتی تەواوو ڕەسەنی ئاشکرا هەبوە لەناو کوردەکانا هەر لەبزوتنەوەکانی محمد پاشای ڕەواندزیو ئەحمەد پاشای بابانو بدرخان بەگو من خۆم(میلنگن)چاوم بە ئەحمەد پاشای بابانو ڕسول پاشای ڕەواندزیو گەلێك لەسەرۆکەکانی تری کورد کەوتوەو لەگەڵ هەموویانا لەو ڕووەوە گفتوگۆمانکردوەو لەهەمویا بۆم دەرکەوتوە هەستی نەتەوایەتیو سەربەخۆیی لەناو کوردا خامۆش نەبۆتەوە-هەروەکو میلنگتن لەلاپەڕە(٢١٦)ی کتێبەکەیدا بەناوی-ژیانێکی سەرەتایی لەناو کوردا)باسی کردوە.

ئەمین زەکی دەڵێت:بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو ڕاپەڕینانەدا ئەبێ ئەوە بخەینە بەرچاومان کە هەموویان بریتی بوون لەتەقەلادانێکی ناتەواوو لەکاتی خۆیداو لەکاتی پێویستدا دەستی پێ نەکراوە, چەنکە لەڕاستیدا کورد لەوکاتەنەدا خۆی بۆسەرگرتنی مەبەستێکی وا گرنگ ئامادە نەکردوەو ئەبێ ئەوەش بزانرێت کە ڕادەی پێشکەوتنی زانیاریو ئابووریو کۆمەلأیەتیو چالاکیەکانی تری ناو ژیانی کۆمەلأیەتی دەتوانێت دەستنیشانی ئەوە بکەنو بڕیاربدەن چکاتێك باشە بۆ ئەومەبەستەو لەچ کاتێکدا بەباشی سەردەگرێتو هەرتەقەلایەك بەرلەوەی ئەم مەرجانە پێبگەن لەزیان گەیاندن بەولاوە هیچ سوودو بەرهەمێکی نابێتو بەڵگەش بۆئەمە بریتیە لەسەرەنجامی ئەو هەموو شۆڕششو بزوتنەوەو ڕاپەڕینانەی کوردە لەسەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویداوە لەگەڵ ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٢٧)(مەبەستی شۆڕشی ئاگریداغە).

لەگەڵ ئەوانەی دوای ئەویش کە جاروبار لەهەندێ ناوچەدا بەکۆمەڵ یالەلایەن تاکە کەسەوە ڕوونەدات بێجگە لەمە, دەبێ ئەوەش لەبیر نەچێت کەلەناو هۆکانی سەرنەگرتنی شۆڕشەکاندا هۆیەکی زۆر گرنگ هەیە کەبریتیە لەو ناکۆکی و ڕقەبەرایەتیەی لەناو ئەمارەتەکانی کوردا هەبوە کە هەریەکەیان بەخیلی بەوی تر بردوەو چاوی بەرایی نەهێناوە کاروباری لاکەی تر باشتربێت لەوەی لای خۆی.

بەکورتی, دان بەوەدا بنرێت هۆی سەرنەکەوتن بەهۆی ناوخۆوە زۆرکاریگەرتربوە لەهۆی دەستێوەردانی بێگانەو ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەوانەی بەوشۆڕشانە هەڵساون ئەوەندە کارامەو لێهاتوو نەبون کە بتوانن و بزانن چ حسابێك بۆ بارودۆخ و هەڵوێست و باری سیاسەتی دەوروپشتی خۆیان بکەن.

ئەوڕحمان پاشای بابان لەشەڕی دەربەندی بازیان زۆر خراپ شکا لەئەنجامی خیانەتی خالد پاشای برایدا کەلەو شەڕەدا بووبەلایەنگری والیی بغداد و ژمارەیەکی زۆری لە هێزەکەی ئەوڕحمان پاشای برای جیاکردەوەو دایە پاڵ هێزەکەی والیی بغداد کەلەئەنجامیا ئەوڕحمانپاشا شکاو وڵاتەکەی تووشی کارەسات و ماڵ کاولی بوو.

ئەم کارەساتە جەرگبڕە ناخۆشانە سێجاری تر ڕوویانداییەوە:

١- لەساڵی(١٢٢٠هـ-١٨٠٥زایین)دا لەکاتی ویلایەتی علی پاشادا.

٢- لەساڵی(١٢٢٣هـ-١٨٠٨زایین)دا لەکاتی سلێمان پاشای(اللاظ)دا.

٣- لەساڵی(١٢٢٧هـ-١٨١٢زایین)لەکاتی عبدالله پاشادا.

کەئەو سێ‌کەسە هەریەکەیان لەکاتی خۆیدا والیی بغداد بون‌و هەرسێ ڕووداوەکەش هەرلە دەربەندی بازیانـدا ڕوویانـدابوو, جـارێکیش لەنزیك(کفری)ڕوویدا.

ئـەمین زەکـی دەربـارەی هـۆی لەناوچـوونی ئەمارەتەکـەی محمد پاشا لەڕواندز وتوویەتی:

هۆی لەناوچوونی ئەو ئەمارەتە بریتیی بوە لەمانە:

١- لایەنگریتیـەکی کوێرانـەی بـێ حسـاب‌و پشـت بەسـتن بەبۆچـوونی هەندێ لە عالمە ئاینیەکان کە شارەزای کاروباری سیاسی نەبوون.

٢- ڕێك نەکەوتن لەگەڵ ئەمارەتەکانی دراوسێدا بەنیازی هاوکاریکردن‌و یەکخستنی توانای هەموویان.

٣- بەخیلی‌و بین برکێ‌یەکی سەخت لەنێوان ئەمیرەکانی ئەمارەتەکانی بابان‌و بادینان‌و عزیزان لە جزیرە.

ئەمین زەکی لەلاپەڕە(٢٤٦)دا وتوویەتی:

ئەگـەر محمـد پاشـا بەوڕادەیـە لـەخۆی بـایی نەبوایـەو ئـەمیرەکانی ئەمارەتەکانی دراوسێی لەخۆبایی نەبونایەو بین برکێ یەکی خۆ کوژانەیان لەگـەڵ یەکتریـدا نەکردایـەو ڕق‌وقـین‌و نـاکۆکیی نێـوان خۆیانیـان بخستایەتەلاوەو بیرو بۆچوونی هەموویان یەکی بگرتایەو سەرکردایەتیەکی لێهـاتووی یـەکگرتوویان هەبوایـە حکومـەتی عوسمـانی‌وا بەئاسـانی نەیدەتوانی بەسەر بزوتنەوەکانی کوردا زاڵ بوایە.

بەڵێ, دوورنیە هەندێ لایان سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت, بەڵام لەبەر نـاکۆکی‌و نـاڕێکی‌و دووبـەرەکی نێوانیـان ئـەنجامی ئەوسـەرکەوتنەش هەرپووچەڵ بۆتەوەو یەك لەدوای یەك لەناوچوون.

ئەبێ سەیری ئەوەش بکەین کە ئیسماعیل پاشای بادینانی ئەوەندە دوژمنایەتیی خۆی بەرامبەر محمد پاشای ڕواندزی توندوتیژو بەتین نەکردایە لەکاتێکدا کە حکومەتی عوسمانی ئەمارەتەکەی سۆرانی محمد پاشای دەڕووخان‌و لەناوی ئەبردو ئیسماعیل پاشا بەو لەناوچوونەی ئەمارەتی سۆران دڵی خۆش نەبوایە عوسمانیەکان بەئاسانی ئەمارەتەکانی تری دراوسێشی بەوشێوەیە نەدەڕووخان‌و ئەوی عمادییەشی وەکو ئەمارەتەکەی ڕواندز نەدەڕوخان‌و ئەمیرەکەی بەزنجیر کراوی نەدەنارد بۆ بغداد. ئەمارەتەکەی ئەحمەد پاشای بابانیش سەربەخۆییەکەی هەروەکو هی ئەمارەتەکانی تری کورد تیاچوو کە بێگومان ئەوڕق‌و قینەی لەلایەن عبدالله پاشای برایەوەو لەلایەن محمود پاشای مامیەوە دژی ئەحمەد پاشا هەیانبوو ئەدوبوە هۆی ڕووخاندنی ئەمارەتەکەی بابان.

ئەمین زەکی لەسەری ئەڕواو دەفەرموێت:

ئەگەر بەووردی بچینە بنج‌و بناوانی هۆی سەرنەکەوتن‌و سەرنەگرتنی شۆڕشەکەی بدرخان بەگ بۆمان دەردەکەوێت هۆی لەناو چوونەکە بەهۆی ناوخۆوەبوە نەك بەهۆی دەرەوەو یەکێکی وەکو عزالدین شێر(مەبەستی ئەمین زەکی یزدان شێری برازای بدرخان بەگە) گەورەترین خیانەتی کرد بەرامبەر بەنیشتمانەکەی خۆی‌و لەکاتی تووڕەبوون هەڵچوونیا لایدایە لای دوژمنی جارانیکە (عوسمان پاشا)ی عوسمانی بوو, وەلەگەڵیا ڕێك نەدەکەوت دژی خزمەکەی خۆی‌و ئەو ئەمارەتە سەربەخۆیەی کورد وابەئاسانی لەناو نەدەچوو, هەرچەند عزالدین شێر لەدواییدا ناچاربوو ئەویش دژی حکومەتی عوسمانی ڕاپەڕێت, بەڵام تازە کارلەکارترازابوو ئەو ڕاپەڕینەی دژی عوسمانی بەکەڵکی نەهات چونکە تورکەکان وەکو چۆن

ئەمارەتەکـــەی بـــدرخانیان لـــەناوبردبوو بەهـــەمان شـــێوە خۆشـــیان لەناوبرد(لەبەرگی یەکەمدا, لەباسی شۆڕشەکەی بدرخان پاشادا بەباشی ئەو هەڵوێستەی یزدان شێری برازای کراوەو لەهەمان بەرگدا باسی چۆنێتی لەناوبردنی یزدان شێریش بەدوورودرێژی کراوە).

ئـەمین زەکـی لەباسـەکەیدا داخـی دڵـی خـۆی دەربڕیـوە بەرامبـەر لـەناو چوونی ئەمارەتی کوردییەکان یەك لەدوای یەك و دەڵێت:

بەو جۆرە بۆمان دەردەکەوێت دەوڵەتی عوسمانی لەئەنجامی ئـەو هـەموو ناڕێکی و دووبـەرەکی و یەکنەگرتنـەی کوردو دوژمنایەتی یـان لـەناوخۆیانا بەرامبـەر بەیـەك بووبـەهۆی ئـەوەی هەربـە چـەکدارو سـەربازەکانی کـورد ئەمارەتـە کوردییـەکان لـەناو ببـات و ئـەمارەتی(بـدلیس)یـش لەناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهەمـدا بـەهۆی نـاکۆکی و دووبـەرەکی وقـین و ڕقـی یـەك بەرامبەربەیەك ئەم ئەمارەتەش وەکو ئەوانی‌تر لەناوببات و(شرف بگ)کە دوا ئەمیری ئەم ئەمارەتەبوە هەرچەند بۆماوەیـەك تـوانی ئەمارەتەکەی بپارێزێت بەڵام بەهۆی ناکۆکی و چەند بەرەکی و ناڕێکیی نێوان کوردەکان و کێشـەی نێـوان عەشـیرەتەکان نـەیتوانی خـۆی بگـرێ و هیچـی پـێ نـەکراو کاربـەوە گەیشـت کـەکورد خـۆی یارمـەتی تـورکی‌دا ئەمارەتەکـە لـەناو بچـێت کەلەساڵی(١٢٦٠)کۆچی بەرامبەر بەساڵی(١٨٤٩)زایین لەناو چوو.

بـەکورتی:بۆمـان دەردەکـەوێ هـەموو بزووتنـەوەکانی کـورد بۆدەسـتگیر بـوونی سـەربەخۆیی بەخـەبات و بـەپێی بیروبۆچـوونی تاکـە کـەس و بەبێ‌لایـەنگرێتی و هاوکـاریکردنی هاوڵاتیـان هیچـیان سـەرنەکەوتن و بەخیلی و حەسادەت کارێکی کوشندەو کاریگەر بوە لەو سەرنەکەوتنانەدا.

یەکێکی وەکو(میجرسۆن)لەوڕووەوە زۆر باش بۆی چوە کەوتوویەتی:

((کورد هەمیشە ئازاو چاونەترس بوەو کۆڵنەدەربوەو ئامادەنەبوە لەژێر دەستی بێگانە دا بیٚو بەهیچ جۆرێك سەری بۆکەس دانەواندوەو تەنها لەشەڕەکانی ناوخۆیدا شکاوە کە لەئەنجامدا ئەمەبوە بەهۆی ئەوەی دوژمنەکانی بەسەریا زاڵ بنو سەربکەون)).

ئەمین زەکی لەلاپەڕە(٢٤٨)دا فەرموویەتی:

بەڕاستی مێژوو ئاوێنەیەکی بالأنمایەو پێویستە دەرسو پەندو ئامۆژگاری لێوە وەربگرینو زۆر بەووردی لێی بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی سوودی لیٚ وەربگرێتو نەکەوێتە ژێر باری هەمان هەڵەو نارێکیەکانی پێشوو کەبوە بەسەرگەردانیو ماڵ وێرانی کە هۆی سەرەکیی ئەو سەرگەردانیو ماڵ وێرانیە دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی دەردی نەخوێندەواری لەناو هاوڵاتیانی کوردو سەرۆكو سەرکردەو میرو کاربەدەستانی کورد کەشارەزا نەبوون کە بەداخەوە ئێستەش هەربەو شێوەیە.

ئەبیٚ باش بزانرێت دروستبوونی دەزگایەکی سەربەخۆ بەتایبەتی لەم سەدەیەدا پێویستی بەبوونی دووشت هەیە: پێنووسو پارە... هەرمیللەتێك لەو دووشتە بیٚبەش بێت هیچ بەتەمای ئەوە نەبێت جۆرە سەرکەوتنێك بەدەس بێنێتو لەهیچ کاروبارێکی سیاسیدا سەرناکەوێتو هەربزوتنەوەیەك بناغەکەی لەسەربوونی ئەم دووشتە پێك نەهاتبێت لەماڵوێرانیو سەرگەردانیی میللەت بەولاوە هیچی تری لیٚ نایەتە بەرهەم تەنها مەگەر ڕێکەوتو بارودۆخو هەڵوێستی سیاسی دەوڵەتان ببێتەهۆی یارمەتیدانی بۆ گەیشتن بەوئامانجو مەبەستە کەلەمەشدا هێشتا میللەت بەباشی ناگاتە مەبەستەکانی چونکە لەم

کاتەشدا هەرپابەستی جۆرە وابەستەییەکی بێگانە دەبێت کەنموونەی ئەمە لەزۆرکاتدا بینراوە.

(لێرەدا ئەمین زەکی وەکو ئەحمەدی خانی بۆی نەچوە کەوتوویەتی شیروپێنوس و لام وایە ئەمین زەکی حسابی ئەوەی کردوە ئەو میللەتەی خاوەنی زاناو ڕۆشنبیرو سیاسەتمەداری لێوەشاوەبێت و پارەداربێت دەتوانێت بەپارە لەهەرکاتێکدا بیەوێ چەك پەیدا دەکات).

ئەمین زەکی لەلاپەڕە(٢٤٩)ی کتێبەکەیدا باسی ئەوەی کردوە چۆن هەمیشە بێگانەکان کوردیان بەکارهێناوە بۆ سوودی خۆیان و کورد تەنها هەر خزمەتی حکام و مەلیکە بە انصافەکانی نەکردوە لەوانەی کاروباری کوردستانیان گرتۆتە دەست و بەڕێوەیان بردوە(مەبەستی هی خۆمانەبوە), بەڵکو هی ئەو میللەتانەشی کردوە کە دەستەلآتیان هەبوە بەسەر کوردستانا, لەوانەی مافە ڕەواکانی کوردیان خستۆتە پێش چاوو بەشێوەیەکی بەویژدانانە لەگەڵ کوردا ڕەفتاریانکردوەو ئەو میللەتانە خۆشیان سوودێکی زۆریان لە کارگوزارێتی کوردو لەئازایەتی و پاکی وپاڵەوانێتی کورد دەسگیر بوەو لاپەڕەکانی مێژوو شایەتی ئەوەن کەئەوەی بەپێچەوانەی ئەمە لەگەڵ کوردا ڕەفتاری کردبێت و بەشێوەیەکی ستەمگەرانە لەگەڵ کوردا جووڵابنەوەو لەمافی خۆیان بێبەش کردوە هەمیشە لەتەقەلاکانیان سەرنەکەوتون و تووشی کارەسات و زیانێکی زۆر بوون. بۆنموونە:حاکم و پادشاکانی ئاشووری کە بەوپەڕی دڵڕەقی و خۆبەزل زانین وبێبەزەییانە ڕەفتاریان لەگەڵ کوردا کردوە. هەرلەسەرەتای دروستبوونی حکومەتەکەیانەوە هەتا کاتی لەناو چوونی, زیانێکی زۆروماڵوێرانیەکی بێشوماریان بەکوردو کوردوستان

گەیاندوەو لەئەنجامی ئەوڕەفتارو هەلۆیستە یانا تووشی زیانێکی کوشندە بوون و زۆر جار تێك شکاون بێجگە لەوەی ئاشوورییەکان، کوردستان ماوەیەك بووبە گۆڕەپانی ئەو شەڕانەی لەنێوان حکومەتەکانی(السبرث-اشغان-اشکان)و ساسانیەکان و ڕۆمانانەکاناکرابوو، لەو شەڕانەدا کورد هۆی هەرە گەورەو چالاکترین بەشداربوانی شەڕەکەبوەو هەرکوردیش بوە زۆربەی سوپای ئێرانی لێ پێك هاتبوو، کورد هەربەو شێوەیە مایەوە هەتا کاتی هاتنی ئیسلامەکان بۆناوچەکە، هەرچەند لەسەرەتادا بەربەرەکانیی ئەوانیشیانکرد بەشێوەیەکی زۆر سەخت، بەڵام لەدواییدا کورد خۆی گۆشەگیر نەکرد،و هاوکارییەکی گەرمی کرد لەکاتی دامەزراندنی خلافتی عباسیداو چەسپاندنی دەسەڵاتی ئەو خلافەتە لەناوچەکاندا کە نموونەی ئەمە لە ابا موسلمی خوراسانیدا دەردەکەوێت.

ئەمین زەکی لێرە دا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی بلەچ شیرکۆ کردوەکە وتوویەتی باوکی ابا موسلمی خوراسانی کورد بوەو بەڵگەش بۆ کوردایەتیی باوکی ابا مسلم بریتیە لەو شعرەی(ابی دلامە) کەدەربارەی ابا مسلمی خوراسانی وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| ابا مجرم ماغیر الله نعمه | علی عبده حتی یغیرها العبد |
| اقی دوله المنصور حاولت غدره | الا ان اهل الغدر اباؤك الکرد |

(سەیرئەوەیە نووسەرانی عەرەب زۆربەیان بەرپەرچی ئەوە ئەدەنەوە، کە ابا مسلمی خوراسانی کورد بووبێت چونکە لایان وانیە کورد شتی،

وای تیا هەڵکەوتبێتو وەکو مێژووی صلاح الدینی ئەیوبی یان نەخوێندبێتەوە, بەلاّم هەرکاتێك ویستبێتان کوردو ناوی کورد بزڕێنن یەکێکی وەکو ابا موسلمی خوراسانیان بەتاوانبار لەقەڵەم داوەو لەڕێگەی ئەوەوە هێرشیان بردۆتە سەر کوردو ناویان زڕاندوە, مەگەر شاعیرێکی بەویژدانی وەکو(نعیم بسیو)دانیبەم ڕاستیەدا نابێ کە وتوویەتی:

کم اکره من علمني
الدرس الاول من التاریخ
کرد یاکان صلاح الدین
وانتصر واصبح عربیا
ماذا لو هزم صلاح الدین
لاصبح جاسوسا کردیا

ئەمین زەکی بێجگە لە (ابا مەسلمی خوراسانی) ئاماژەی بۆ ئەوەکردوە کە ساتێك(ابو جعفر المنصور) بەرلەوەی ببێت بە خلیفە والیی کوردستانو ئازربایجان بوەو ئەگەر یارمەتیو هاوکاری کردنی کوردی لەگەلاّ نەبوایە نەیدەتوانی هێرشی, ڕۆمانەکان بەربەست بکاتو ئەگەر(ملکشا)ی سلچوقی بەهاوکاریکردنو یارمەتیدانی کورد نەبوایە نەیدەتوانی(قاورت)لاتەمێ بکاتو(سلطان مودود)یش بەبێ یارمەتیدانی کورد نەیدەتوانی موصلّ داگیر بکاتو (محمدی کوڕی ملکشا)یش بەبێ کورد نەیدەتوانی(شام)داگیر بکات.

پوختــەو کورتــەی ئــەم باســە ئــەوە ڕوون دەکەنــەوە کــە دانیشــتوانی کوردســتان گــەورەترین خزمــەتی خەلافــەتی ئیســلامیان کــردوەو لــەپێناویا سەروماڵو گیانی خۆیان فیدا کردوە. ئایا(الباز ابو شجاع الکردی)نەبوو کە خلیفــەی بغــدادی پاراســتو خلافەتەکــەی چەســپاندو بــەهێزی کــرد دژی(ال بویە)؟ هەروەها ئەوی لێشاوی هێرش بەرانی ڕاوەستان دژی ئیسلام لەوڵاتە ئیسلامیەکانا کوردو عەشایرەکانی کورد بوو کە بەهۆی ئازایەتیو وریایی کاربەدەستانی حکومەتی(مروانی)کوردەوە هێرشی داگیرکەران وەستێنرانو کوردەکـانی عەشـایری(حمیدیـە)ی بـەناوبانگ تووشـی زەرەرو زیـانێکی زۆر گــەورەبوون لەئــەنجامی ئــەوەی خۆیــان تــەرخانکردبوو بــۆ پاراســتنی خلیفە(المسترشد باللە)ی عباسی دژی هێرشو پەلامارەکانی (عمادالدین)ی زەنکیی ماڵ وێرانکەر.

بێجگــە لەمانــە, کــورد ئەوپــەڕی خزمــەتی پێشکەشــکردوە بــۆ (ســلطان سلیم)ی عوسمـانیو بـەو پـەڕی پـاکیو دڵسـۆزییەوە شـەڕی بـۆ کـردوە دژی حکومەتی ئێرانو ڕۆڵێکی زۆر گرنگـی هـەبوە لەسـەرکەوتنی ئەو سوڵتانەدا لەشــەڕی(چــالدیران)دا(مەبەســتی ئــەو شــەڕەیە کەلــەنێوان عوسمــانیو صفوییەکانا لەچالدیران ڕوویدا بوو), هەروەها بەپێچەوانەی ئەوە, ئەوانەی دوای شا ئیسماعیلی صفوی کاروباری ئێرانیان گرتبوە دەست سوودێکی زۆریان لە کوردەکانی(موکریان) وەرگرتبوو, شا عباس کەلەساڵی(١٠٥٤ھ)دا بەرامبـەر(١٦٤٤ی زایـین) سـاتێك کاروبـاری سـوپای ڕێکخسـت ژمارەیـەکی زۆری لەکوردەکان خستە ناو سوپاکەی خۆیەوە.

بەڵام سەیر ئەوەیە کاربەدەستانی عوسمـانی هەربـەهۆی کوردو لەڕێگـەی کوردەوە بوەتوانیبوویان بەئاسانی ئەمارەتەکانی کورد لەناو ببەن!!

بەوجۆرە, مێژووی ئێران و عوسمانی پڕن لەو نموونانەی کە بێگانەکان سوودیان لە کورد وەرگرتوەو ئەوانەی ئەو چاکەیەی کوردیان لەبەرچاو نەبوە زیانێکی زۆریان بەخۆیان گەیاندوە.

ڕووسەکان لەشەڕی ساڵی(١٢١٩)کۆچی بەرامبەر بە(١٨٠٤-١٨٠٥)ی زایین پێوەندیان بەکوردەوە کردو لەو شەڕانەی نێوانی تورك و ڕوسدا لەساڵانی(١٢٤٤)ی کۆچی بەرامبەر(١٨٢٨)ی زایین, و(١٢٩٤)ی کۆچی بەرامبەر بە(١٨٧٧) زاین و (١٢٩٥)کۆچی بەرامبەر بە(١٨٧٨)ی زاییندا ڕوویدا کورد لەوشەڕانەدا تووشی زیان و ماڵوێرانیەکی ئێجگار زۆر بوو, ئەو هاتنەپێشەوەی ڕووس بوو بەهۆی ئەوەی شارەزایی دەربارەی کورد پەیدا بکەن و ساتێك ڕووسەکان لە ئازایەتی و بەتوانایی کورد گەیشتین ئەویش توانی سوودێکی زۆر لە کورد وەربگرێت و لەساڵی(١٢٤٥)یکۆچی بەرامبەر بەساڵی(١٨٢٩)ی زایین هێزێکی تەواویان لەکوردەکان پێکهێنا و هانیان دان بۆ ئەوەی هەندێ لە عەشایرەکانی کورد بچن بۆ قفقاس و لەدوای شەڕی (قرم) لەساڵانی(١٢٦٩)تا(١٢٧٥)یکۆچی بەرامبەر(١٨٥٣-١٨٥٨)یزایین ڕووسەکان دووهێزی تریان لە کوردەکان پێکهێنا.

حکومەتی عوسمانیش هەتا کۆتایی سەدەی دوازدەهەم سودیان تەنها لە هێزی عەشایرەکانی کورد وەرگرت بەلاَم لەدوای ئەوەی عوسمانیەکان شەرەزاییان پەیداکرد لە ڕێکخستنی هێزی سوپاو لەشکرکێشیدا, ئیتر ئەمانیش هەروەکو ڕووسەکان دەستیانکرد بەوەی هێزی تایبەتی لەکوردەکان ڕێکبخەن, بەتایبەتی لەدوای شەڕی (١٢٩٤)ی کۆچی-(١٨٧٧)ی زایین,وشەڕی ساڵی(١٢٩٥)ی کۆچی بەرامبەر

بەساڵی(١٨٧٨)ی زایین کەلەوکاتانەدا ئاسایش لەکوردستاندا تێکچوبوو لەئەنجامی لاواز بوونی حکومەتی مرکزییەوەو لەپەیمانی(برلین)دا لەمادە(٦١)یدا بڕیاری ئەوە درابوو کە پێویستە دەسبەجێ باشکردن و گۆڕانکاری بکات لەناو وولاّتدا بەبیانووی پاراستنی ژیانی ئەرمەنیەکان لەهێرشی کوردو چرکسەکان.

بەلاّم حکومەتی عوسمانی بڕیارەکەی پەیمانی برلین والێکدایەوە کەتەنها بۆ سوودی ئەرمەنیەکان ئەو بڕیارە دەرچوبوو, بەپێچەوانەوە زیانێکی زۆری دەگەیاند بەدەوڵەتی عوسمانی بۆیە ئەو بڕیارەی پشتگوێ خست, لەئەنجامیا ئەرمەنیەکان دووبارە دژی تورك راپەڕین و کۆمەلاّنی ئەرمەنی لەلندن و ڕوسیاو سویسرە دەستیانکرد بەچالاکیی مادی و ئەدەبی و ئاڵۆزی کەوتە نێوان ئەرمەنی و کوردە وەو ئەو ئاشتی و برایەتیەی لە نێوانیانا هەبوو هەمووی تێکچوو, رق و قین پەرەی سەندو ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنیەکان پەنایان بردەبەر دەسڕۆیوە بەهێزەکانی کورد بۆ ئەوەی بیان پارێزن.

پاش ئەوە لەزەمانی سوڵتان عبدالحمیدی دووهەمدا لەساڵی(١٣٠٢)یکۆچی بەرامبەر(١٨٨٥)ی زایین هێزی ئێسترسوار لەکوردەکان دروستکرا(مەبەستی سوارەی حمیدیە)لە وێنەی(قۆزاق)ەکانی ڕوس بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو ئێستر سۆرانەوە بتوانێت ئاسایش لەناو کوردستانا بپارێزێت کەنەخشەکێشی ئەو هێزی ئێستر سوارە(موشیر شاکر پاشا)بوو.

عوسمانیەکان ویستیان بەهۆی ئەوەوە دۆستایەتی و لایەنگرێتی, عەشایەرەکانی کورد بۆ خۆیان موسوەگەر بکەن و ئیبراهیم پاشای سەرۆکی,

عەشایری میللی کە کوڕەزای تەیموور پاشا بوو هەموو عەشیرەتەکەی خۆی خستەناو ئەو هێزەوە وعوسمانیەکان سوودیان لەو هێزە وەرگرت هەتا کاتی اعلانیچاکردنی دەستوور(مشروطیة) ئەوسا سوارەی حمیدیە ناوەکەی گۆڕراو کرایە (خفیف سواری ئالایلری).

پاش باسی ئەم هەموو بەسەرهاتو کوێرەوەریانە ئەمین زەکی چۆتە سەرباسی بارودۆخی کوردستانو باکووری کوردستانو سەرەتای شۆڕشی پیران لەساڵی(١٩٢٥)داو داخو خەفەتی خۆی هەڵڕشتوە بەرامبەر بەوناکۆکیو ناتەباییەی لەناو کوردا هەبوەو چەن جار لەدوای جار لە زیانو ماڵ کاولی بەو لاوە هیچ شۆڕشێکیان سوودێکی دەستگیر نەبوە لەگەڵ ئەو هەموو لەخۆ بوردنو فیداکاری یانەی پێشکەش کرابونو لەو ڕوەوە فەرموویەتی:

لەکاتێکدا کە کۆمەڵی گەلان(عصبەالامم)باسی کێشەی موصڵی دەکرد شۆڕشێکی گەورەی کورد لەناوچەی(خربوط-دیاربکر) ڕوویدا بەسەرۆکایەتی شێخ سعیدی پیران لەساڵی(١٤٤٣)یکۆچی بەرامبەر بە(١٩٢٥)ی زایینو هێشتا کاتی ئەوە نەهاتوە پیاو بتوانێت حوکمێکی عادلانەی پاك بدا دەربارەی ئەو شۆڕشەو شۆڕشەکانی تر چونکە هێشتا هۆی ڕوودانی ئەو شەڕانە بەتەواوەتی نەزانراوە(مەبەستی ئەمین زەکی تاکاتی ساڵی(١٩٣١)بوە لەکتێبەکەی مێژووی کوردو کوردستانی تیادا تەواو کردوەو بڵاوی کردۆتەوە, بێگومان تا ئەو کاتەی ئەو ئاماژەی بۆکردوە, هەرچەندە ئەمین زەکی بەگ ئەفسەرێکی شارەزاو لێهاتوو بوە لەناو سوپای عوسمانیداو لاشم وایە ئاگاداری جەورو ستەمی تورکە کمالیەکان بوە کەچۆن بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە ویستبویان کورد لەناو ببەنو

ئەوی بمایە ئەوەلەناو بۆتەی تورکدا بیانتوێنێتەوە, بەلأم هێشتا ئەو سەرچاوانەی دەربارەی ئەو شۆڕشانەو ئەو ڕاپەڕینانە دواون هێشتا تائەوسا بلأو نەکرابوونەوە, بەتایبەتی ڕەنگە, ئەوسا دکیومنیتەکانی ئەرشیفی ولأتانی وەکو بریتانیا و ڕوسیا و سۆڤێت شاراوەبون و کاتێك دەرقەتی بلأوکردنەوەیان هات ئەوسا بەباشی زانرا چ کارەسات و بەسەرهاتێك بەسەر کوردا هاتبوو)

ئەمین زەکی لەسەر باسەکەی ئەڕواو دەلێت:

هەرچۆنێك بێت ئەو شۆڕشانە ئەنجامەکانی زۆر کاریگەرو زیان بەخش و دلتەزێن بون و ویژدانی مرۆڤ خۆی پیناگیرێت و ناتوانێت بێدەنگ بێت بەرامبەر بە ئەنجامەکانیان و جێگەی داخ و نیگەرانیە ئەو هەموو کارەسات و مال کاولیەی ڕویدابوو نەتوانرابوو بەشێوەیەکی ئاشتی و برایانە چارەسەر بکرێن وەکو چۆن جاران پەیوەندییەکی تاڕادەیەك دۆستایەتی و خۆشەویستی هەبوو کە بێگومان هۆی سەرنەگرتنی ئەوە ئەکەوێتە ئۆبالی حکومەتی تورکیا چونکە لەجیاتی ئەوەی پاداشی چاکەکانی ڕابردووی کوردی بدایەتەوە و دەبوایە تورك بەجۆرێك سەیری کوردی بکردایەو دانی بەمافی سروشتی ڕەوای کوردا بنایەو ڕێگەی بدایە بزوتنەوەیەکی زانیارییانەو شارستانییتی هەمەولایەکی بگرتایەتەوە و دەبوایە تورکەکان بیان زانیایە کەدانی ئەو مافە لەدەستەلأتدارێتی و حاکمیەتی حکومەتی تورکی کەم نەدەکردەوە, بەلکو بە پێچەوانەوە ئەوەندەی تر حکومەتی تورکیای پێ بەهێزترو بەسامانتر دەبوو, کوردیش بەچاوێکی ترەوە دەیڕوانیە ئەو حکومەتەی بێبەشی نەکردبوو لەمافی خۆی و ئەبوایە ئەوەی لەبیرنەچوایەتەوە کە کورد هەمیشە هۆیەکی گەورەبوە بۆ باری پێشکەوتنی

تورکیاو بۆ تێروتەسەلکردنی چ لەکاتی شەڕداو چ لەکاتی ئاشتیداو هەمیشە پاڵ پشتێکی بەهێز بوە بۆ تورك لەهەر کاتێکدا دەسدرێژی بکرایەتەسەر تورکیا.

لەگەڵ ئەو هەموو ڕەفتارانەی تورك لەگەڵ کوردا کردی، دەری دەخات کەناتوانرێت هەتا سەر ڕێگە لەمیللەتان بگیرێت کە تەقەلای ئەوە بدات خواستو ئارەزوەکانی بۆ سەربەخۆیی و سەربەستی و ئازادی موسوەگەر بکاتو کاربەدەستانی حکومەتانو لێپرسراوەکانیان، بەتایبەتی ڕۆشنبیرەکانیان پێویستە حساب بۆ ئەوە بکەن.سەربەخۆیی و ئازادی مەبەستو ئامانجی هەموو لایەك بێت بەبێ ئەوەیلە ڕێبازی بەکارهێنانی عەقل دووربکەونەوەو بیر لەوە بکەنەوە کە هەتا کاتی خۆی نەیەت بیر لەوە نەکرێتەوە موجازەفە بکرێتو پێویستە بەر لەهەموو شتێك لەگەڵ هاو وڵاتیاندا بەشێوەیەکی گشتی و جەماوەری کاربکرێت لە ڕێگەی پێشکەوتنی بیروباوەڕو ئابوورییەوە بنەمایەکی بەهێزو پتەو سازبکەن بۆ گەیشتن بەو قۆناغەی کە دەتوانرێت شۆڕشی تیادا بەرپا بکرێتو دەبێ بزانرێ تەنها بەمانە دەتوانرێت میللەت بگات بە هیواو سەرگرتنی مەبەستەکانی.

ئەمین زەکی ئەڵێ: لەڕاستیدا لەم سەدەیەدا لەتوانادا نیە سەربەخۆیی دەسگیر ببێت ئەگەر برسێتیو نەخوێندەواری زاڵ بێت بەسەر کۆمەڵایەتی ئەو میللەتەداو بەپێچەوانەوە ئەو میللەتانەی دەبنە ئامێری گەمە پێکردنو دەبن بەداردەستی بێگانەو تەنها چاو دەبڕنە سوودی تایبەتی خۆیانو میللەتەکەیان بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی خۆیان بەکار دەهێنن لەماڵوێرانی و زیان بەولاوە هیچ ئەنجامێکی تری نابێت پێویستە دەستەڵاتدارانو کاربەدەستان وەکو باوکێك چۆن دەڕوانێتە منداڵەکانی بەوشێوەیەش

سەیری هاولاَتیانی خۆی بکاتو ئەوی بەوجۆرە نەجولێتەوە هەرچەند بشتوانێت درێژە بەماوەی دەسەلاَتداریێتی خۆی بدات، بەلاَم لەئەنجامدا هەرسەرکەوتوو نابێنو ڕۆژێك دێ لەو بۆچوونو هەلوێستەی خۆی پەشیمان دەبێتەوە بەتایبەتی لەکاتی تەنگانەدا کە ئەوسا هەست بەوەدەکات چەند پێویستی بەلایەنگریێتی جەماوەر دەبێت.



**مێژوو نووسی گەورەی کورد مامۆستا محمد امین زکی**
**(بەرگی یەکەمی کتێبەکەی مێژووی کوردوکوردستان)**

*باسی سێهەم*

## هەڵویستی تورک بەرامبەر کوردو ئەویاسانەی حکومەت دژی کورد دەری کردبو

١- بـاروودۆخ لەناوچـەی کوردنشـینەکانی بـاکووری کوردسـتانداو هەڵویستی حکومەتی تورك لەدوای شۆڕشی درسیم:

حکومـەتی تورکیا کەلەسـەر بناغەیـەکی فاشسـتی پێکهاتبوو، لـەدوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی درسیم و لـەناوبردنی سـەرکردەکانی و ئاوارەکردنی کوردو تـالانکردنی موڵك و ماڵیـان، ئیتر وەنـەبێ بەمانە کۆتاییان بـەرەفتارە دڕنـدەکانی خۆیـان هێنـا بێـت، بـەڵکو ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ پـتر لـەجاران هـەوڵی تواندنـەوەو لـەناوبردنی کوردیـان ئـەداو بۆسـەرگرتنی ئـەم مەبەسـتەیان بەشـێکی زۆری بۆجـەی سـالانەیان لـەجیاتی ئـەوەی بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی وڵات تـەرخان بکـەن، چـەکێکی زۆریـان پێ‌کڕی‌و ئەگەرچـی تـورك لەشـەڕی جیهانی دوهەمدا بەشداریی نەکردبوو، بەڵام دەی ویست سوپایەکی گـەورەو بەهێزو پڕچەکی هەمیشەیی هەبێت بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا ئاواتـەکانی بهێنێتـەدی کـەبریتی بـوو لـە بوژانـەوەی بـیری طـورانیزم‌و دەسـەڵاتدارێتی

تورك بەسەر ئەو ناوچانەی دەكەوتنە نێوان توركستان و توركیاوەو لایان وابوو دەتوانن بەو سوپاو چەكە زۆرە ئیمپراتوریەتێكی تری وەكو ئەوەی جارانی عوسمانی دروست بكەنەوە، بەلاّم بارودۆخی جهانی و ڕێبازی ئەو شەڕەی لەنێوان دەوڵەتە شەڕكەرەكانی شەڕی جیهانیدا ڕوویدا بەشێوەیەك نەبوو بتوانێت سوود لە هەڵوێست وەربگرێت و ئەگەرچی توانیبووی لەنگەرێك ڕابگرێت لەنێوان بەرەی ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشتی لەلایەك و لەولاشەوە ئەمریكاو بریتانیاو سۆڤیێت و هاوكارەكانیان و لام وایە ئەگەر بەرەی یەكەم سەربكەوتایەو بەرەی دوهەم نوشوستی بهێنایە هەوڵی ئەوەی ئەدابێت بەپارسەنگی بەرەی یەكەم كەلەشەڕی جهانیی یەكەمدا هاوكاری بوو، بۆ ئەوەی تۆڵەی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتەكەی عوسمانی بكاتەوەو دەست بگرێت بەسەر زۆربەی ئەو ناوچانەی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا كەمرخی لێیان خۆشكردبوو...

وەكو لاوێكی سەردەمی شەڕی جهانی دوهەم لەبیرم دێ ئەگەرچی توركیشم نەدەزانی بەلاّم زمانزانەكانی ئەو ڕۆژانە باسەكانی حسێن جاهدیالچین و هەندێكی تریان بۆ دەكردین بەكوردی كە لەنیستگەی ئەنقەرەوە بەسەر گەرمیەكی توندو تیژەوە بەزمانی توركی باسی شەڕەكەیان لێك ئەدایەوەو بەئاشكرا قسەكانیان بۆنی ئەوەی لێ دەهات ئاواتە خوازی سەركەوتنی نازی و فاشیستەكان بوون كە بناغەی دەوڵەتەكەی خۆیان لەسەربناغەی ئەوانە دامەزرێنرابوو، بەلاّم نەیانتوانی خۆیان بەسەر هیچ لایەكدا ساغ بكەنەوە و كە شەڕ بڕایەوەو دەوڵەتە سوێند خوارەكان سەركەوتن ئیتر حكومەتی تورك چاری نەماو بایدایەوە بەلای ڕۆژئاوا دا كە قۆناغێكی تازە هاتبوە پێشەوەو لەدوای ڕوخانی ڕژێمەكانی

ئەڵمانیاو ئیتاڵیا دووبەرەی تازە هاتە کایەوە کە بریتی بوون لەبەرەی وڵاتانی سۆشیالستی بەسەرکردایەتی سۆڤیێت و بەرەی سەرمایەداران بەسەرکردایەتی ئەمریکاو تورکیای ئەو ڕۆژانە کە لەکوردی هەردوو جەژنە بوبوو, بە ئومێدی ئەوەی لە سەرڕێگەی وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە بتوانیت چارەسەری کێشەی ئابووریی خۆی بکات کەلەو ڕۆژانەدا هاووڵاتیانی تورکیا لەگەڵ ئەوەشدا وەکو شەڕی یەکەمی جهانی تووشی ماڵ کاول و کوشتار نەبوبون, بەڵام باری ئابووری یان ئێجگار قورس و لاسەنگ بوو, کەچی ئالەوبارە ئاڵۆزەشدا هێشتا لەدەمی میللەتەکەی خۆیان دەگێڕایەوەو لەجیاتی ئەوەی پرۆژەی ئاوەدانی و پیشەسازیی لێ بهێننە بەرهەم کەوتنەوە سەر کەڵکەڵەو خەیاڵەخاوەکەی جارانیان بۆ ئەوەی بەیەکێك لەدەوڵەتە گەورەکان بژمێرین و میللەتی کورد لەباکوری کوردستانا کەوتە ژێر بارودۆخێکی ئێجگار نالەبارەوەو بەئاشکرا کاربەدەستانی تورك دەستیان نابوە بینەقاقای بۆ ئەوەی بۆ ئێجگاری لەناوی ببەن.

لەوڕووەوە هەروەکو سەریابدرخان لەکتێبەکەیدا سەرچاوە(٧٩)لەلاپەڕە(٥٩)دا ئامازەی بۆ کردوە, هەواڵنێری کۆمەڵی(BROOKLYN EAGLE)لە ئەستەمبوڵەوە ڕاپۆرتێکی دەربارەی ئەو ڕۆژانە ناردوە بۆ کۆمەڵە کە تیایا وتوویەتی:

((حکومەتی تورکیا سەرڕای ئاڵۆزبوونی باری ئابووری ناوخۆو دانیشتوەکانی, باجی لەسەر هەموو شتێك داناوە کە ئەمە کارێکی زۆر خراپی کردۆتە سەر باری ژیانی هاولاتیانی و حکومەت بەرامبەر بەمە ناچاربوە قەرزێکی زۆر لەوڵاتان وەربگرێت و هەتا بێت ژمارەیەکی زۆر

لەهونەرمەنـدان و بازرگـان و پیشەسـازان ولأت بـەجیٚ دەهـیٚلٚین و ڕوودەکـەن ولأتانی دەرەوە.

ئەگـەر تورکیا بۆ ماوەیـەکی کـاتیش بتوانیـت چارەسـەری ئـەم کێشـەیە بکات بەلأم نابیٚ بەتەمای ئەوە بێت بتوانێت ئەو نەخشەیەی بۆ دانیشتوانی کوردی کێشاوە بەجیٚی بێنێت و ئەگەر مصطفی کمال تاسەر بەتەمایی ئەوە بێت کە دەتوانێت کێشـەی خۆی لەگـەلٚ کوردا بـەزۆرە ملیٚ چارەسـەر بکات ئەوا بەهەلٚەدا چوە و ئەگەر واز لە کوردستان نەهێنێت بەتـەمای ئـەوە نـەبێت باری ئابوریی ولأتەکەی چارەسەربکات.

دوکتـــۆر عزیـــز شمزینـــی لەلاپـــەڕە(١٦٢-٥)ی کتێبەکەیـــدا سەرچاوە(٤١)باسـی هەلٚویستی دڕندانـەی تـورکی کـردوە بەرامبـەر بـەکوردو وتوویەتی:

((لـەدوای دامرکانـەوەی شۆڕشـی درسـیم حکومـەتی تورکیـا ڕێگـەی نـەدابوو بـەهیچ ڕۆژنامـەنووس و پـەیامنێرێکی بێگانـە سەرلەناوچـە کـورد نشینەکان بدەن و لەگەلٚ ئەمەشدا دەنگی ناڕەزایی و بێزاریی کوردیان پیٚ کپ نەکراوە و دروستکردنی ئەو کۆسپ و بەرهەلٚستییانەی تورك کردویەتی بۆ لێکترازانی کورد لەیەکتری و بۆ دابڕینیان لـەولأتانی جهان بیٚسوود بوەو کوردەکـانی بـاکوور زۆر بـاش ئاگـاداری بـارودۆخی کوردسـتانی عـراق و ئێرانن.

لـەو ڕوەوە کـاتبێکی تـورکی بـەناو بـانگ(ئوسـتونگیل)لەلاپـەڕە(٥٢)ی یاداشتەکانیا کەلـەکاتی خۆیدا لەزینـدانی فاشستەکانا نوسیوێتی, سـەری ڕێزو نەوازش بۆ خەباتی گەلی کورد دا ئەنەوێنین و نوسیوێتی:

((بەشێوەیەکی گشتی گریك(یۆنان), کورد, ئەرمەنی, لەزگی هەموویان بەجۆرێك تووشی ئازارو ئەشکنجەی ژاندرمەکانی تورك بون و کە پیاو ئەو باسە دەخوێنێتەوە مووچرکە بەلەشیدا دێت.

شاری ماردین کە کەوتۆتە سەرچیایەك و ئەم شوێنە دوورە وای لێکراوە لەقەفەزێکی ئاسنین دەچێت کە ئاوی بەژێردا بڕوات و بەبەرچاوی خۆمانەوە لەم شوێنەدا لاوانی کوردو عەرەب لەناو قەفەزە ئاسنینەدا گیانیان دەردەچێت و دەمرن.

کوردەکانی تورکیا لەو گۆڕانکاریانەی بەسەر کوردی ئێران و عراقدا هاتوە ئاگادارن و گروپە پێشکەوتنخوازەکانی تورکیاش هەمیشە پەیوەندیان لەگەڵ ڕابەرانی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستانی عراق و ئێراندا هەیە, بێگومان بزوتنەوەی چەکدارانەی کوردەکانی عراق و دامەزراندنی کۆماری ئۆتۆنۆمی ساڵی(١٩٤٥)لەکوردستانی ئێراندا لەناو تورکیادا دەنگی دابوەوە, بەڵام کوردەکانی تورکیا نەیانتوانیوە خەباتی خۆیان لەگەڵ خەباتی براکانی ئێران و عراق یەکبخەن و ئەم دیاردەیە هۆی تایبەتی خۆی هەیە:

١- لەساڵانی دەوروبەری جەنگی جیهانی دوهەمدا, لەدوای هێرش بردن بۆسەر ستالینگراد و بەرەو پێشەوەچوونی سوپای ئەڵمانیا, ئەڵمانەکان مرخیان لەداگیر کردنی قفقاس و ئاسیای ناوەڕاست خۆشکردبوو, تورکەکانیش دەیان ویست ئەو ناوچانە بکەن بەبەشێکی جیانەکراوە لەتورکیا و بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش دەوڵەتی تورکیا پتر لە نیو ملیۆن سەربازی خۆی لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیادا, واتە لەناوچە کوردنشینەکانا مۆڵدابوو, بێگومان بوونی ئەو ژمارە زۆرەی

سوپای تورکیا که به تازەترین چەك و کەرەسەی شەڕ پڕ چەك کرابوون، ڕێگە لەبەرپا بوونی هەموو جۆرە چولانەوەیەکی چەکدارانەی کوردی ئێران و عراق گرتبوو بۆ ئەوەی هیچ جۆرە یارمەتیەکی کوردی تورکیا نەدەن و بەو شێوەیە ناوچە کورد نشینەکانی تورکیاش هەروا بەقەدەغە کراوی مانەوەو لەوناوچانەدا هەموو کاروباری بەڕێوەبردنی ڕۆژانەی ناوچەکەو دادگاکان و دەزگاکانی دەوڵەت هەمووی لەژێر دەسەلاتیی میلیتاریستەکانی تورکدا بوون.

٢- دەوڵەتە ئیمپریالسیتە گەورەکانی وەکو بریتانیا و ئەمەریکا بەهەموو جۆرێك ڕژێمی تورکیان دەپاراست دژی هەرجولانەوەیەکی کورد گەر ڕووی بدایە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەموو کردارو هەڵوێستانە هێشتا هەر نەیانتوانیبوو خەباتی گەلی کورد کپ وخامۆش بکەن و بەپێی بلاوکراوەکانی ناو ڕۆژنامەی جمهوریتی تورکی دەردەکەوێ لەئۆکتۆبەری(١٩٤٧)دا ڕاپەڕینێکی چەکدارانە بەسەرکردایەتی(مصطفی شاهێن) لەناوچەی جزیرەدا هەڵگیرساوە(مصطفی شاهێن بەگی بەرازی یەکێك بوە لە ئەندامانی دامەزرێنەری خۆیبون).

هەروەکو(ئوستونگیل)باسیکردوە, هەرچەندە ڕۆژنامەکانی ئەوروپا ئاماژەیان بۆ بەرپابوونی ئەو ڕاپەڕینە کردوە, بەڵام هیچ شتێك دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە بەشێوەیەکی تێرو تەسەل بڵاونەکراوەتەوەو بێگومان دەوڵەتی تورکیا لەکاتی خۆیدا ڕێگەی نەداوە هیچ شتێك دەربارەی بڵاوبکرێتەوە, بەڵام هەروەکو(ن.ئە.ئۆفۆسلیۆف) لەپەرتووکەکەیدا بەزمانی ڕوسی لەژێر ناوی (تورکیا)چاپی مۆسکۆ ساڵی(١٩٥١)لەلاپەڕە(٣٩)دا باسیکردوە تورکەکان لەدواییدا ناچاربوون شتێك دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە بڵاوبکەنەوەو لەو ڕووەوە(ئۆفۆسلۆف) نووسیویتی:

((لەساڵی(١٩٤٩)دا بەپێی ئەوباسانەی لەڕۆژنامەکانا بڵاوکراونەتەوە(کە بێگومان مەبەستی ڕۆژنامەکانی تورکیا بوە) لەئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانەی نێوان جووتیارەکان لەلایەكو پۆلیس‌و جندرمە لەلایەکی ترەوە بەهاوکاریی هێزە چەکدارەکانی تری حکومەت ڕوویداو لەم پێکانەدا جوتیاران دەزگا دەوڵەتی‌و فیودالەکانیان سووتاندو دەستیانگرت بەسەر کۆگاو ئاژەڵ‌و کێڵگەکانی دەوڵەتداو زەوی‌و زارێکی زۆریان داگیر کردو لەناو خۆیانا بەشیانکرد)).

هەروەکو دوکتۆر عزیز شمزینی ئاماژەی بۆ لاپەڕە(٩٢)ی کتێبەکەی (ڕامبۆ) کردوە کە لەساڵی(١٩٤٧)دا لەپاریس چاپکراوە, لەساڵی(١٩٤٨)دا لەکاتی هەڵبژاردنی ئەندامانی پارلماندا حکومەتی تورکیا ڕێگەیان لە دانیشتوانی(٦٠)گوندی کورد لەویلایتی ئەرزڕومدا

گرت بەشداری بکەن لەو هەڵبژاردنە گشتیەداو لەئەنجای ئەمەدا هەموویان مانیان گرتو بێجگە لەدەم ڕاستی دیّ کەسی تر دەنگیان نەدا.

ڕەفتارو کردەوەی کاربەدەستانی تورك بەرامبەر کورد لەشێوەی ڕەفتارو پێوەندیی نێوان کۆیلەو کۆیلەدار وابوو, لەلایەکەوە ڕقی لەکورد بوو لەلایەکی تریشەوە لەهەموو بزووتنەوەیەکی کورد دەترساو بەو پەڕی دڕندەیەتیەوە لەناوی دەبرد.

هەروەکو ڕامبۆ ئاماژەی بۆ ڕۆژنامەگەریی تورك(ئۆزاقلی گێل)ی ژمارەی ڕۆژی (١١/٠٤/١٩٤٦) کردوە کە وتوویەتی ڕۆژنامەی(سون پۆست)نوسیوێتی:

((لامان ڕوونو ئاشکرایە لە ئێرانو عراقدا کە سانێکی هوشیاری ئەوتۆ لە ئارادانین, بەلأم ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کەلەتورکیادا کوردنیە)).

هەمان ڕۆژنامە خوێندەوارەکانی دڵنیادەکاتودەڵێت(( لە تورکیا تورکی کێوی, یاخود تورکی دڕندە هەیە بۆیە پێویستە لەسەرمان بەزووترین کات بیانکەینەوە بە تورکو ئەگەر دراوسێکانمان نایانەویّ بڕوخێن, ئەوا پێویستە هەمیشە وریاو بەئاگاداربن)).

شمزینی ئەڵیّ: سەیر ئەوەیە ئەو تورانیە شۆڤێنیستە نازانێت تەنها سیّ ڕۆژ بەرلەوەی ئەو ووتارەی بلأوبکاتەوە(سەراج ئۆغلۆ)ی سەرەك وەزیرانی تورکیای ئەو ڕۆژانە بەناچاری دانی بەبوونی کوردەکانی تورکیا دانابوو, لە)٠٨/٠٤/١٩٤٦)دا سەراج ئۆغلۆ لەپرسیارەکانی چەند پەیامنێرێکی ئەمریکیدا وتبووی: ((لەتورکیادا تەنها یەك کەمەنەتەوە هەیە ئەویش کوردە

بەڵام هەموو ڕاپەڕینەکانیان زادەی چەند هۆیەکی ئاینیەو مۆرکی سیاسی بەخۆیەوە گرتوە.

دەربارەی هەڵوێستی تورك بەرامبەر بەکورد(PhilipRobins) سەرچاوە(٤٦)وتوویەتی: داڤید هونام کەلەکتێبەکەیدا(The Kurds)چاپی لندن ساڵی(١٩٤٧)لەلاپەڕە(١٧٨)نوسیویێتی:

((تورکە نەتەوە پەرستەکان لەترسی دروستبونی حکومەتی کوردو ئەرمەنی, لەکاتی حۆیدا ناکۆکیەکانی خۆیان خستبوە لاوە, بەلاّم لەگەلّ ئەوشدا شتێکی ئاسان نەبوو ئەو دوونەتەوەیە بەهەویەی تورك قایل بن و لەساڵی(١٩٦١)دالە دەستوورێکی تازەدا هەوڵدرا ئەوکێشەیە بەوە سووك بکرێت کە بوترێ: هەموو دانیشتوویەکی تورکیا بەتورك حساب دەکرێت و هەندێ ووشەی هێواش کەرەش هێنرایە ئاراوە وەکو ئەوترا تورکە شاخاوییەکان یا دانیشتوانی ناوچەکانی ڕۆژهەلاّت(کەمەبەستی کورد بوە).

سەرچاوە(٤٦)ئاماژەی بۆکتێبەکەی(ئەندرۆ مانگۆ)ی چاپی(١٩٧٥)کردوە کەلەلاپەڕە(٥٢)یدا کەنسبەتی دانیشتوانی کوردی بەگەلێك جۆر باسکردوە وەکو:١,٧٪,١٧٪,١٨٪ کە ئەمانە دوایی تۆزێك لەژمارەیەکی نزیك بەڕاست و ڕێك وپێك دەژمێرێن و بەپێی ئەو سەرژمێریەی ساڵی(١٩٩٠)داکراوە ژمارەی تورکیای بە(٧٥)ملیۆن داناوە و بەپێ‌ی ئەمە دەبێ ژمارەی کورد(١٣,٢)ملیۆن بێت بەلاّم بەهیچ شێوەیەك لە(١٠)ملیۆن کەمتر نیە.

هەمان سەرچاوە ئاماژەی بۆ کتێبەکەی(جیفری لویس) چاپی ئۆکسفۆرد ساڵی(١٩٦٨) لەلاپەڕە (٣٢٣)یدا کەباسی علویەکانی کردوە لەتورکیادا کەوتوویەتی ژمارەیان نزیکی لە(٤٠٪)ی دانیشتوانە بەلاّم ئەوانەی شارەزای

ئەو باسەن ئەم ژمارەیە ئێجگار زیادە ڕۆیی تێدایەو علویەکان لە(١٥٪-٢٠٪)ی تورکیا تێپەڕناکەن کە بەوپێ یە دەبێ ژمارەیان نزیکی(١١,٧)ملیۆن بێت(لەتورکیادا علوی لەناوترك‌و کوردا هەیە بەلاَم هیچ سەرچاوەیەك باسی ژمارەی هەردوولای بەجیا نەکردوە).

نوسەر ئەلێ لەبەر ئەوەی سونی مەزهەبەکانی تورکیا ڕقیان لە علویەکانە, بۆیە ئەمانە دوایی ئەو هەستەی سونی وای لێکردوون بەرەو چەپ ڕەوی بڕۆن کە تاقمێك لەمانەی زۆر سەر بزێون پێیان دەڵێن(قزل یۆڵ) کەبنکەکەیان ئێستە لە ئەڵمانیایەو داوای دروستکردنی حکومەتێکی جیاوازی علوی ئەکەن هەروەکو چۆن کوردەکان داوای جیابوونەوەو حکومەتێکی سەربەخۆ ئەکەن.

(سەرچاوەی ئەم بۆچوونەی(Philip Robins)بریتیە لەکتێبەکەی(ڕۆث ماندل) لەژێر ناوی (تورکیاو ئەڵمانیا), لاپەڕە(١٦٦)چاپی لندن ساڵی(١٩٩٠).

لەکۆتایی ئەو باسەدا(فلیپ ڕۆبنسن)ئەڵێ: لەڕاستیدا پێکهاتنی حکومەتێکی علوی لەتورکیادا شتێکی نەگونجاوە چونکە وەکو چێشتی سواڵکەر وان‌و بریتین لە چەند ڕەگەزێکی پێکەوە نەلکاو کەهەر لایەیان بەشێوەیەك ئەو ڕێبازی مەزهەبیەیان گرتوتەبەر.

هەمان نوسەر لەلاپەڕە(٣٩)دا لەباسێکی کوردا وتوویەتی: بەپێی سەر ژمێری ساڵی (١٩٨٥), لەناوچە کوردییەکانا لە(٢٪)ی خاوەن زەوی‌و زارەکان نزیکەی لە(٣٠٪)ئەو زەوی‌و زارانەیان بەدەستەوەیە کەبەکەڵکی کشت‌وکاڵ بێن‌و لەم ساڵانەی دواییدا خاوەن زەوی‌و زارو ئاغای گەورەکانی کورد توانیویانە خۆیان دەوڵەمەند بکەن‌و نەك هەرئێستا بەڵکو هەرلە

زەمانی عوسمانیەکانەوە ئەو ئاغاو دەرەبەگانە زۆربەیان سەربە حکومەت بون و حکومەت پاڵپشتیان بوەو بایەخی پێداون و حکومەت لەرێی ئەوانەوە توانیویێتی دەسەلآتی خۆی بەسەر ناوچە کوردیەکانا بسەپێنێت.

حکومەت لەکۆنەوە پێشکەوتن وپێشخستنی باری ئابوری و کۆمەلآیەتیی لەناو کوردەکانا پشتگوێ خستوەو هەروەکو غرفەی بازرگانیی ئەستمبول لەرۆژنامەی(Turkish daily news) لەژمارەی (٢٠)ی ئایاری(١٩٩٠)دا بلآوی کردۆتەوە نسبەتی دەرامەدی ساڵانەی کوردی ناوچە کوردییەکان لە(٤٠٪)ی دەرامەدی شوێنەکانی ترەو لەمەدا جیاوازییەکی ڕوون و ئاشکرا دەبینرێت لەنێوان هەردوولادا. دەربارەی پشتگوێ خستنی ناوچە کورد نشینەکانی تورکیا, ڕۆژنامەی گاردیانی لندنی لەژمارەی ڕۆژی(٣)ی ئایاری(١٩٩٠)دا باسێکی تیایە دەربارەی بارودۆخ لەکوردستانا و تووییەتی لەشوێنێکی وەکو دیاربەکردا پیشەسازی لەریزی نەبوان دەژمێرێت و بێجگە لەئاغاکان لەناو کوردەکانا ئەوەی تۆزێك باری ئابوریی باشتر بێت لەکوردەکانی تر تەنها بریتیین لەوانەی گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشتوەو ڕووەیانکردۆتە شارەکان و لەوێ نیشتەجێ بون و ئەوی لەو ڕوەوە زۆر سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە ئیمڕۆ شاری ئەستەمبوڵ گەورەترین شوێنە کە ژمارەیەکی زۆری کوردی تیادا کۆبۆتەوەو نیشتەجێ بوە.

دەربارەی بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان لەتورکیاداو هەڵوێست و سیاسەتی حکومەتی تورکیا لەپشتگوێ خستنی باری ژیانی کوردەکان بەپێی کتێبەکەی (ولیم هایل)

(Political and economic development Of modern Turkey) چاپی لندن سالّی (١٩٨١) لەلاپەڕە(٢٢٤)یدا وتوویەتی:

((ناوچە دیهاتیەکانی کورد لەڕووی کۆمەڵایەتی و خوێندەوارییەوە لەڕۆژهەڵات و خواروی ڕۆژهەڵاتی ئەنا دۆڵدا نزمترین و دواکەوتووترین پلەی خوێندەواری و کۆمەڵایەتیی تیادا بەدی دەکرێت کە هۆی سەرەکی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هەژاری و دەستکورتی و کەم دەرامەتی دانیشتوان و نەبوونی قوتابخانەو نەبوونی مامۆستا بۆ ئەو قوتابخانەی کەمانەی کەهەن و لەئەنجامی ئەمەدا مامۆستایان خۆیان دوور دەخەنەوە لەوناوچە پڕ هەژارو دواکەوتوە کەم ژمارانەی لەوناوچانەدا دەژین.

لەلایەکی ترەوە لووت بەرزیی تورکەکان و خۆبەزل زانین بەرامبەر کورد لەوناوچانەدا بۆتە کۆسپێکی تری زۆر گەورەو ڕێگەی لەوە گرتوە هیچ پرۆژەیەك لەناوچە کورد نشینەکانا بکرێتەوەو دەسەڵاتدارێتی دەرەبەگەکانی کوردیش بەپاڵ پشتێتی حکومەت بوە بەسەرباری ئەو دواکەوتنانەو ئەو حزبە سیاسی‌یانەش کەلەو ناوچانەدا چالاك بن تەنها هەر اعتماد ئەکەنە سەر ئەو ئاغاو دەرەبەگە دەسەڵاتدارانە بۆ ئەوەی دەنگیان بۆ کۆبکەنەوە لەکاتی دەنگداندا و لەڕاستیدا ئەو حزبانە هیچیان تەقەلای ئەوەنادەن کاروباری ئەو ناوچانە باش بکرێت و ئەو تەقەلایەی لەساڵی(١٩٧٨)دا درابوو ئەویش سەری نەگرت چونکە ڕێگەی سەرگرتنی لێگیرا.

دەربارەی هەمان شت ڕۆژنامەی(Independent)ی ڕۆژی(٠٧/٠٤/١٩٩٠) کەلە لندن دەردەچێت وتوویەتی:

((کۆچکردنی کورد لەناوچە دێهاتیە هەژارەکانەوە، لەبەر کەم دەرامەدی ڕوویانکردۆتە شارەکان و ئەم کۆچکردنەیان لەکۆچ پێکردنی پێستت ڕەشەکانی ئەمریکا دەچێت کەلەناوچەکانی خوارووەوە ڕوویانکردە ناوچە پڕ پیشە سازییەکانی باکوور لەدوای شەڕی جیهانی دووهەم)).

لەڕاستیدا تورکەکان وەنەبێ تەنها هەر دژی کوردبوونی لەباکوری کوردستانا، بەڵکو هەمیشە چاویان بڕیبوە کوردی ڕۆژهەلات و باشوریش و لەهەرلا یەکیانا بزوتنەوەیەکی نەتەوایتی کورد ڕووی بدایە تورك ئامادەبوو لەگەڵ شەیتانیشدا هاوکاری بکات بەمەرجێ ئەوەی ئەو هاوکاریکردنە ببیتە هۆی لەناو چوونی ئەو بزووتنەوەی کورد، بۆنمونەی ئەمە:

لەباشوری کوردستاندا، هەرلەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی بەدواوە، یەکەم کێشەی تورك کەلەگەڵ حکومەتی بریتانیا دا پەیدابوو لەسەر ئەوەبوو لەسەرەتادا حکومەتی بریتانیا ڕێگەی دابوو بەشێخ مەحمود بۆماوەیەکی کاتی ئەو ئیدارەیەی لەناوچەی سلێمانیدا پێکی هێنابوو جۆرە دەسەلاتدارییەکی کوردی تیا بەدی بکرێت... بۆلەناو بردن و ڕووخاندنی ئەو ئیدارەیە لەگەڵ ئەوەشدا سوودێکی ئێجگار زۆری لە سۆڤێت دەسگیر بوبوو، بەلام ساتێك ئینگلیزەکان لەتورکە کەمالیەکان گەیاند ئامادەن باسی کوردو مافی کورد لەپەیمانی سیڤەردا پشتگوێ بخەن بەمەرجێك تورکیش واز لە دۆستایەتی سۆڤێت بهێنێت و دەمودەست تورکیا بایدایەوە بەلای هاوکاریکردن لەگەڵ ڕۆژئاوا داو ئەوەبوو لەدواییدا بوو بەئەندامی پەیمانی(سعداباد)لەساڵی(١٩٣٧)دا کەیەکێك لەمبادئەکانی ئەو پەیمانە ڕێگرتن بوو لەهەر بزوتنەوەیەك لەلایەن کوردەوە بکرایە.

لەرۆژهەلاتی کوردستانیشدا لەدوای شەری جیهانیی دوهەم، ساتێك کۆماری کوردستان لەمهاباد پێکهات تورکەکان ئارامیان لێ براو کەوتنە پەلەقاژەو هاندانی دۆستەکانیان بۆ لەناو بردنی ئەو کۆمارە بەزووترین کات کەنەخشەی ئەو لەناوبردنەی کۆماری مهاباد لەلایەن حکومەتی ئەمریکاوە کێشرابوو.

لێرەدا بۆبەڵگە ئاماژە بۆناوەرۆکی دوکیومێتیکی ناو ئەرشیفی سۆفێت دەکەین کەچۆن تورکەکان پەلەقاژەی لەناوبردنی کۆماری مهابادیان کردبوو

دوکیومنتی یەکەم-دوکیومینتی سۆفێت ژمارە(ف094-ئو٤-د-١٨٨پ١٨.لەلاپەرە(١٠هەتا١٤)-کەلەگۆڤاری گزنگ لەسوید لەژمارە(١١)ی(١٩٩٦)دا بلاوکراوەتەوە دەربارەی دەربرینی نیگەرانێتی حکومەتی تورکیا بەرامبەر رووداوەکانی کوردستانی ئێران لەنێوان سالانی(١٩٣٥-١٩٣٨و١٩٤٠-١٩٤٥):

راپۆرتەکە دەڵێت:

((رۆژی پێنجەمی سبتمبر سکرتێری گشتی وزارەتی دەرەوەی تورکیا سەبارەت بەو مەسەلەیە، رای گەیاند کەلەوانەیە حکومەتی تورکیا سوپای خۆی بنێرێت بۆسەر سنوور.

سیربۆلارد(کەدیارە لێپرسراوی حکومەتی بریتانیا بوە لەو رۆژانەدا) وتوویەتی:

لەگەڵ هاوتای خۆیدا لەحکومەتی شوورەوی قسەی کردوەو ئەویش لەوەرامدا رای گەیاندوە کە هاوتای تورك لەو رووەوە خاتر جەم بکات-- مەبەست دڵنیا بکات).

لای سیربۆلارد وایە تورکەکان لەچوونی سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد بۆ (باکۆ) نیگەرانن و بەرامبەر بەمە باڵیوزی شوورەوی ڕایگەیاند کە ئەوچاوپێکەوتنانە تەنها لایەنی فەرهەنگی یان هەبوە.

لە(١٥)ی سبتمبردا دەوڵەتی تورکیا دوهەم نامەی خۆی نارد دەربارەی چالاکیی کوردەکان و حکومەتی تورکیا دەری بڕی هێزە داگیرکەرەکانی شوورەوی پشتیوانی لەکورد دەکەن و لەم ڕوەوە پێوەندیی تورکیاو ئێران تێکچوەو بارودۆخێکی نائارامی پڕ لەمەترسیی پێکهێناوە.

هەرچەندە ڕاپۆرتەکانی تورکیا زۆر زیادە ڕۆیی تێدایە بەلآم لەوانەیە ئەمە ببێتە هۆی تێکچوونی پێوەندیی نێوان ڕوسیاو تورکیا))

هەروەکو گۆڤاری گزنگ بلآوی کردۆتەوە, لەبەشی دوهەمی هەمان دوکیومنیتدا وتراوە:

لەهاوڕێ(مولوتۆف)ەوە بۆ(کریس-کەباڵیوزی حکومەتی بریتانیا بوە لەسۆڤێت لەنێوان سالآنی (١٩٤٠-١٩٤٢) نامەیەك لەڕۆژی(١٩٤١/١٢/٢٨)دا نێرراوە سەبارەت بەونامە نیگەرانییەی تورکیا کەلە(٢٠)ی دیسمبری(١٩٤١)دا نێراوە بۆ ئیدن کە وەرامەکەی مۆلۆتۆف وتوویەتی:

((حکومەتی ئێران بەهیچ جۆرێك گلەیی دەرنەبڕیوە بەرامبەر بە هەڵویستی سۆڤێت دەربارەی کوردو لەکۆبونەوەیەکی ئاغای(فروغی)ی سەرەك وەزیرانی ئێران لەگەڵ بالیۆزی شوورەوی وای ڕاگەیان کە ئینگلیزەکان پشتیوانی یان لەکوردەکان کردوەو لەهەندێ ناوچەدا کوردەکانیشیان دژی ئێران هانداوە, کەواتە تورکیا هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نیە کە بڵێت شوورەوی کوردەکانی ئازربایجان هان ئەدەن و ئەوپیوەندییەش کەکراوە بەبینینی چەند شەخسیەتێکی کورد,

سەفەری ئەوانە تەنها بۆ مەبەستی فەرهەنگی بوەو بۆ هیچ جۆرە مەبەستێکی تر نەبوە.

ئەو بۆ چوونەش کە(بۆلارد)بۆی چوە کە پێی وایە لەو ناوچانەی هێزی شوورەوی تیادایە تەئسیرێکی کەمیان هەیە لەسەر دانیشتوان و ئەمە بەڵگەیە بۆ دڵنیابوونی تورکەکان)).

تائێرە بریتی بوو لە باسی بارودۆخی باکوری کوردستان و هەڵوێستی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بەکوردو پاش ئەمە دەچینە سەر باسی ئەو بڕیارو یاسایانەی حکومەتی تورك دژی کورد دەریانکردبوو.

٢-بڕیارو یاساکانی حکومەتی تورکیا:

بۆ ئەم باسە ئاماژە بۆ دوو سەرچاوە دەکەین, یەکەمیان کتێبەکەی پرۆفیسۆر حسرتیان سەرچاوە(٤٥)دوهەهەم-ئەو کوراسەیەی لە فرنسیەوە لەلایەن انتتیۆنی کوردی لەپاریسەوە کراوە بە ئینگلیزی لەژێر ناوی(The Boning Of Kurdish Culture) ئەگەرچی لەباسی شۆڕشەکانی پیران-ئاگریداغ-درسیم دا باسی گەلێك لەویاسایانە کراون, بەڵام لەپاشکۆی ئەم بەرگە دا بەپێویستم زانی ئاماژە بۆ ئەم دوو سەرچاوەیە بکەمەوە.

پرۆفیسۆر حسرتیان لەلاپەرە(٧٤)ی کتێبەکەیدا باسی هەندێ لەوبڕیارانەی کردوە کە تورکەکان دەریانکردبوو بۆ بەربەستکردو ڕێگەگرتن لەهەموو جۆرە جموجوڵ و چالاکیی سیاسی و ئابووری لەلایەن ئەوانەوە کەتورك نەبون کەوتوویەتی:

١- ((لەبەهاری(١٩٢٤)دا پرۆژەیەك لەلایەن کاربەدەستە کۆنەپەرستەکانەوە ئامادەکرا(مەبەستی پێشنیازەکانی عابدین ئۆزمانە

کەلەباسی شۆڕشی ئاگریداغدا بەدوورودرێژی باس کراوە) بەپێی ئەوە دەسنیشانی ئەو هێلانەکرا کەبۆ نیشتەجێ بوونی کەمەنەتەوایەتیەکان ئامادەکرابوو وەبڕیاردرا ژمارەی ئەوکەمە نەتەواییانە لەهیچ شارێکدا لە(١٠٪)ی دانیشتوانی ئەوشارە تێپەڕنەکەن و بەپێی ئەوبڕیارە بڕیاردرا(٢٠٠)هەزارکەس بگوێزرێنەوە لەشوێنەکانی خۆیانەوە بۆ ئەوشوێنانەی بۆیان تەرخانکرابو(سەرچاوەی حسرتیان بۆئەمە بریتین لەبڵاوکراوەی ڕۆژهەڵاتی تازە ژمارە(١)لاپەڕە(١٢٨)چاپی ساڵی(١٩٢٥)).

٢- لەحزیرانی (١٩٢٧)دا ئەنجومەنی میللی توركی یاسای ژمارە(١٠٩٧)ی دەرکرد بۆ گواستنەوەی کورد لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەو کوردانەی حکومەت لێیان ڕازی نەبوو, لەئەنجامی ئەمەدا بەهەزاران خێزانی کورد ئاوارەکران و زەوی و زارەکانیان لەکیس چوو.

٣- لەو وتارەدا ئەمینی گشتیی حزبی شعبی جمهوری تورکی لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩٣١)دا خوێندبویەوە کە(رجب بكر)بوو, دەربارەی لێکدانەوەی ووشەی نەتەوە وتبووی:

((ئێمە هەموو دانیشتوانی تورکیا بەیەك نەتەوە دەژمێرین چ لەڕووی سیاسیەوە بێت چ لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە و ئەمە ئەوکەسانەش دەگرێتەوە کەبەخۆیان ئەڵێن نەتەوەی کورد, یاچرکس, یا(الـلان), یا(ئەلبوماکیە) و پێویستە لەسەر کمالیەکان ئەو عبارەتانەی بەهەڵە بەوناوانەوە ماونەوە هەموویان ڕاست بکرێنەوە کەلەمیراتی کۆنی مێژوەوە بۆمان ماوەتەوە(مەبەستی ماوەی خلافتی عوسمانیە). ئێمە ئەوانە بەنەتەوە ناژمێرین کە ژمارەیان (٥)هەزار, دەهەزار, یاسەدهەزار, یاملیۆنێکیش بێت).

٤- لەحزیرانی(١٩٣٤)دا ئەنجومەنی میللی تورك یاسای ژمارە(٢٥١٠)ی دەرکرد وبەپێی ئەو یاسایە حکومەت پرۆگرامێکی ئامادەکرد بۆ ئاوارەکردن و دابەشکردنی کەمەنەتەوەکان و نەخشەی تازە کێشرا بۆ تورکیا بەپێی ئەوە تورکیا کرا بەسێ بەش:

یەکەم: ئەو ناوچانەی پێویستە تەنها تورکی تیادا نیشتەجێ بێت.

دوهەم: ئەوناوچانەی بۆ ئاوارەبوەکان تەرخانکرا بەمەرجێك والەو داانیشتوانە بکرێت کەتەنها بەتورکی فێری زانستی و ڕۆشنبیری بن.

سێهەم: ئەوناوچانەی پێویستە لەبەر هۆی ئابووری و تەندروستی و ڕۆشنبیری وسیاسی و سوپایی و بەمەبەستی دابین کردنی ئاسایش چۆڵ بکرێن و ڕێگەنەدرێت کەس تیایانا نیشتەجێ بێت کەئەمەش تەنها بۆ ئەوەکرابوو کە کوردەکان بگرێتەوە و بکرێت بەبیانوو بۆ دەرکردنیان لەشوێنەکانی خۆیان و جێگەکانیان چۆڵ بکرێت(بێگومان مەبەست لەو چۆڵکردنەش ئەوەبوە حکومەت بەئارەزووی خۆی بیدات بەتورك).

٥- لەساڵی(١٩٣٤)دا گەلێك مادەی تر خرایە سەر ئەویاسایەی بەرلەمە باسیکراوە و بەپێی ئەو مادە تازانە دەسەڵات درابوو بەکار بەدەستانی حکومەت بەئارەزووی خۆیان دانیشتوانی کورد بەکۆمەڵ بگوێزنەوە.

حسرتیان ئەڵێ: دوای ئەوەی ئەوانەی بڕیاری گواستنەوەیان درابوو گوێزرانەوە, بەهیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێنەدرا پێوەندیان بەماڵ و موڵك و زەوی و زارەکانیانەوە بمێنێت.

پرۆفیسۆر حسرتیان لەباسەکەیدا لەسەری ڕۆیشتوە و وتوویەتی:

((تورکە ڕەگەز پەرستەکان ژەهری ناکۆکی و دووبەرەکی و دوژمنایەتی یان بڵاو کردەوە بەمەبەستی لەناو بردنی کەمەنەتەوەکان و توانەوەیان

لەبۆتەی ڕەگەزی تورکدا. (نهال ئادسن) کەیەکێك بوو لەتوندڕەوە ڕەگەز پەرستەکانی تورك لەوتارێکیدا بلاوی کردەوە کە پێویستە ڕگەزی تورك هەموو دانیشتوان بگرێتەوەو ئەوی لەم ڕەگەزە نەبێت پێویستە لەوولات دەربکرێن و بەهیچ شێوەیەك نابێ ڕێگە بدرێت تاقە کەسێك لەکەمە نەتەوەکان لەناو دەزگاکانی دەوڵەت و ئەفسەرانی ناو سوپا دابمێننەوە (سەرچاوەی حسرتیان بۆ ئەمە بریتیەلە: پەیامنێری ئەکادیمی علومی سۆڤیاتی ژمارە(٨)لاپەڕە(١٠١)ساڵی(١٩٤٩)).

بەوپێیە تورکەکان کوردەکانی ڕۆژهەلاتیان ئاوارە کرد بۆ ڕۆژئاوایی تورکیا و سەرۆکەکانیان نارد بۆ ئەو سەربازگانەی بۆ ئیش تەرخانکرابون بۆ ئەوەی لەوێ قورسترین و گرانترین ئیشیان پێ بکرێت و, حکومەت بەوەشەوە نەوەستا بەڵکو باجێکی تایبەتی دانرا لەسەر کەمە نەتەوەکان بۆ ئەوەی باری ژیان و گوزەرانیان گرانتر بکرێت.

حسرتیان لەلاپەڕە(٨١)ی کتێبەکەیدا باسی بارودۆخی ناوچە کورد نشینەکانی کردوە کە چۆن حکومەت سیاسەتێکی وایان بەکارهێنابوو دانیشتوانی ئەو ناوچانە لەڕووی کشتوکاڵ و تەندروستی و خوێندەواری و ڕۆشنبیریەوە بەدواکەوتووترین ناوچەکانی تورکیا بژمێرێن. ڕۆژنامەی (یەنی صباح)ی تورکی لەژمارەکانی کانونی یەکەمی(١٩٦٠)دا چەند باسێکی بلاوکردەوە کە لەلایەن(تیزگین)ی هەواڵنێریەوە بۆی نێرابوو کەبەناوچەکانی ڕۆژهەلاتدا گەڕابوو, لەوباسانەدا لەباری ژیان و هەژاری و بێ دەرامەدی و بێ بەش بوونی دانیشتوانی کورد لەمافی مرۆڤایەتی دوابوو, ئاماژەی بۆ ئەوە کردبوو چۆن حکومەت هەڵوێستێکی ئەوتۆی هەبوە بوەبە هۆی ئەوەی کوردەکان لەویلایەتی(ئورفە)دا خۆیان و وولاغەکانیان لەتاقە

ژوورێکی بێ پەنجەرەدا دەژیانو لەهاویندا ناچاردەبون لەژێر دەوارا بژینو لەیەکێك لەقەزاکانیا کەژمارەیان (١٠)هەزار کەسە تەنها(٦)قوتابخانەی تیادایەو سێ قوتابخانە لەوشەشە داخرابوونو حکومەت ڕێگەی دابوو بەئاغاو دەرەبەگەکان زەویو زارێکی زۆریان بەدەستەوە بێتو هی وایان هەبوە دەیان گوندی هەبوە لەکاتێکدا جووتیارو فەلاحەکان بێبەشکرابوون لەزەویوزار.

پرۆفیسۆر حسرتیان لەلاپەڕە(٨٢)دا دەربارەی چۆنێتی نەهێشتنی ناوی کوردو ناونەبردنی ئەو ووشەیە چەند مەڵبەندێکی تورکی کردبوەوەو لەباسێکدا ساتێك باسی کوردو تورك هاتبوە پێشەوە(فخرالدین کینین)کە مامۆستای مێژوو بوو, داوای ئەوەی کردبوو ئەوانەی خۆیان بەتورك نازانن پێویستە لەڕەگو ڕیشە دەربهێنرێن.

پرۆفیسۆر حسرتیان لەسەری ئەڕواو دەڵێت:

لەڕۆژی(٢٤)ی تشرینی دوهەمی ساڵی(١٩٦٠)دا(جمال کورسیل)ی سەرۆك کۆماری تورکیا لەشاری دیاربکر ختبەیەکیدا لەوەدا بە سەروباڵای بیرو باوەڕی شۆڤێنێتی تورك هەڵی دابوو,(ضیاء کوك ئاڵب) کەبەتورکێکی شۆڤێنی ناسراوبوو لەلایەن جمال کورسیلەوە کرا بەنموونەی تورکێکی ڕۆشنبیرو زاناو ساتێ باسی کورد هاتە ئاراوە ووتی: لای ئێمە کوردنیەو کوردو تورك هەردوولایان بەڕەگەز دەچنەوە سەریەكو لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا لەتورك بەولاوە کەسێکی تری تیادا نیەو بەدەستەوەیە یاسایەکی تازە دەرچێت هەرکەسێك لەویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا خۆی بەکورد دابنێت بەرامبەر بەمە سزا بدرێت...

ڕۆژنامەکانی تورکیش دەستیانکرد بەبڵاوکردنەوەی هەمان بەیت و بالۆرەو ڕۆژنامەی(یەنی گون) لەڕۆژی(٢٨/١٠/١٩٦٠)دا باسێکی بڵاوکردەوەو بەئاشکرا لەوباسەدا وترابوو: ئێمە کەس ناناسین کەپێی بوترێ کورد،دانیشتوانی تورکیا هەمویان تورکن و هەندێ لەڕێکخراوەکانی لاوانی ڕەگەز پەرستی تورك لەشوێنە گشتیەکانا بەزۆر خەڵکیان ناچار دەکرد تەنها هەربەزمانی تورکی بدوێن و گەنجە شۆڤێنیە ڕەگەز پەرست و قوتابیەکانیان بەسەر دوکانەکانا ئەگەڕان و نوسینیان بەدیوارەکانا هەڵدەواسی کە بەزمانی تورکی لێی نوسرابوو پێویستە لەسەر هەموو کەسێك تەنها هەر بەزمانی تورکی قسە بکەن و ئەوانەی سواری پاص و ئوتۆمبیلی حکومەت بوایە ئەگەر بەتورکی قسەی نەکردایە ماوەی سواربونیان نەئەدان کاربەدەستانی سوپای حکومەت بەتایبەتی لەئەستەنبوڵ لایەنگری ئەم نەخشەیە بون و متصرفی ئەستەنبوڵی کە(ڕفیق تولخا)بوو لەگفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانیدا بەئاشکرا وتبووی:

((داوامان لەوانە کردوە کە بەتورکی قسەناکەن نابێ کارێکی وابکەن بەقسەکردن بەزمانێکی‌تری جگە لە تورکی سەری خەڵك بیەشێنن لەبەر ئەوە پێویستە لەسەریان تەنها بەزمانی تورکی قسەبکەن))

حسرتیان لەکتێبەکەیدا ئەڵێ: بەڵام ئەم هەڵوێست و نەخشەیەی حکومەت بووبە هۆی ڕیسواکردنی حکومەتی تورك و زڕاندنی ناوبانگی لەدەرەوەی وڵاتدا، بۆیە حاکمی هێزی سوپا لە ئەستەنبوڵ ناردبوی بەشوێن سەرۆکی یەکێتی قوتابیانداو داوای لێکرد دەسبەرداری ئەو کردەوانە بن و وازی لێ بێنن.

حسرتیان لەلاپەڕە(٨٥)ی هەمان سەرچاوەدا باسی نەخشەی تورکی کردوە چۆن بەپێی ئەوە لەسەر چەوسانەوەی کورد دەڕۆیشتن و لە(٨)ی ئایاری(١٩٦٠)دا لەدوای دوو ڕۆژ بەسەر هەڵگەڕانەوەی عسکریدا(مەبەستی حسرتیان ئەو هەڵگەڕانەوەی سوپایە کەبەسەرکردایەتی جمال کورسیل لەساڵی(١٩٦٠)دا ڕوویدابوو)، کاربەدەستانی سوپا ژمارەیەکی زۆریان لەکورد گرت لەناوچەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتدا کە(١٥٠)کەس لەتاقەمانگێکدا گیراو لەکۆتایی مانگی ئەیلولدا ژمارەی گیراوەکان گەیشتە(٢٢١٨)کەس جگەلەگرتنی(٢٨)پیاوی ئاینی لەکوردەکان کەلەناو ئەمانەدا(شێخ علی رضا، شێخ صلاح الدین)بون کە هەردوکیان لەنەوەی شێخ سعیدی پیرانی سەرکردەی شۆڕشی ساڵی_١٩٢٥)بون.

لەڕۆژی(١٩/١٠/١٩٦٠)دا(لێژنەی یەکێتی نەتەوایەتی)شان بەشانی ژمارە(٢٥١٠)کەبەرلەمە دەرچووبوو یاسایەکی تری دەرکرد ژمارە(١٠٥)بەپێی ئەم یاسا تازەیە دەسەڵات درا بەکاربەدەستانی حکومەت هەرخێزانێکی کورد کە جێگەی متمانەی حکومەت نەبێت لەشوێنی خۆیان دووربخرێنەوەو بگوێزرێنەوە بۆناوچەکانی ڕۆژئاوای تورکیا و بۆ ئەو مەبەستە نامەبۆ(١٩) ویلایەت نووسرا کە بریتی بوون لە(هاتای، موش، سیرت، دیاربکر، ئورفە، ماردین، ئاگری، بدلیس، وان، ئەرزڕوم، قزل تەپە، ماراش(مرعش)، ئادیمان،ملاطیە، العزیز، تونجلی(درسیم)، بنگول، هەکاری، ئەرزنجان)و داوا لەکاربەدەستانی ئەو ویلایەتانە کرا ناوی ئەوانە دەسنیشان بکەن کەئەم یاسایە دەیانگرێتەوە.

لەسەرەتای کانونی دوهەمی(١٩٦١)دا(٤٩)کورد گیراو دران بەدادگای سوپایی لە ئەنقەرە لەزەمانی (مندریس)داو دادگاکردنی ئەوانە بەنەهێنی،

کراو تاوانی ئەوە درایە پاڵیان کە دەیانەوێ حکومەتێکی کوردییی سەربەخۆ دامەزرێنن و یەکێتی وڵاتی تورکیا تێك بدەن و ئەمانە لە(٨-١٥)ساڵ حەپس کران کەلەناویانا محامی و دکتۆرو قوتابی یان تیادا بوو.

لە(٦)ئایاری(١٩٦١)دا(٨)کورد لەشاری(بورصە)کەلەمانگی حزیرانی(١٩٦٠)دا گیرابوون بەپێی یاسای(قانون استیطان-یاسای نیشتەجێکردن) بەڕوخێنەر تاوانبارکران. بەرلەمە لەساڵی (١٩٦٠)دا (٢٧٥) کەسایەتیی ناسراوو سیاسەتمەداری کورد کەلەناویانا ئەندامی پەرلەمان و فرمانبەرو مامۆستا و پیاوی ئاینیی و سەرۆك عەشیرەت هەبوو, لەپاش دادگاکردن(٢٢٠)کەس لەو گیراوانە بڕیاری ئەوەیان بەسەرا درا کەپێویستە لەشوێنێکی تایبەتیدا بەزۆرە ملێ نیشتەجێ بکرێن و (٥٥) کەسیان هەریەکەیان بۆچەند ساڵێك بڕیاری زیندانیکردنیان دەرچوو.

لەپایزی ساڵی(١٩٦١)دا حکومەتی تورك بەسەدان خێزانیان لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە گواستەوە بۆ ڕۆژئاوا بەبیانووی ئەوەی حکومەت ویستبووی ئەو خێزانە کوردانە لەچەوساندنەوەی دەرەبەگەکان ڕزگار بکرێن (وەکو حکومەت خۆی دەستی نەبوو بێت لەوچەوساندنەوەی ئەوخێزانانە) کە سەرچاوەی پرۆفیسۆر حسرتیان بۆ ئەمە بریتیە لە:

کتێبەکەی (ئا.م.شمس الدینوف-الجمهوریە الترکیە,چاپی مۆسکۆ ساڵی(١٩٦٢) لاپەڕەکانی (٧٨-٧٩).

پرۆفیسۆر حسرتیان لەکۆتایی باسەکەیدا, لەلاپەڕە(٨٦)دا وتوویەتی:

((ئا ئەمەیە ڕەفتارو سیاسەتی شۆڤێنی و کۆنە پەرستانەی حکومەتی تورك و تاقمی کاربەدەستە دکتاتۆرە کۆنە پەرستەکانی ئەم حکومەتە بەرامبەر نەتەوەکانی کوردو ئەرمەن و یۆنانیەکان... بەڵام ئەم سیاسەتەی

تابێت لەنرخی ئەو حکومەتە کەم دەکاتەوە, لەلایەکی ترەوە مەعنەویاتی ئەو میللەتە چەوسێنراوانە هەتا بێت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرزتر دەبێتەوەو کۆڵنادەن بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی دەیانگەیەنێتە سەربەستی و ئازادی و ڕزگاربوون لەقین و ڕقی طورانیەکان کەئەم طورانیانە دەیانەوێ بەو سیاسەتە ڕەگەز پەرستانەیان ئەو میللەتانە لەناو بۆتەی خۆیانا بتوێننەوە)).

تائێرە بریتی بوو لەوباسە بەنرخەی پرۆفیسۆر حسرتیان دەربارەی ئەویاسایانەی حکومەتی تورك بەرامبەر کوردی باکوور دەریان کردبوو, پاش ئەم باسە دەچینە سەر ئەو باسەی (ئەنیستیتۆی کوردی لەپاریس) لەفرنسیەوە باسەکەی کردوە بەئینگلیزی لەژێر ناوی ( The Boning Of Kurdish Culturo) بەڵام بەرلەوەی بچینە سەر ئەو باسە ئەنستیتۆتی کوردی بەپێویستم زانی لێرەدا جارێکی‌تر کورتە باسێکی ئەو مادانەی لەپەیمانی(لۆزان)دا کردبوویان بەمەرج بەسەر حکومەتی تورکیاوە کە دەبوایە بەپێی ئەو مەرجانە حکومەت پێویست بوو ناوەڕۆکی ئەو مادانە بەجێ بهێنێت کەلەو پەیمانەدا بڕیاری لەسەر درابوو وە حکومەتی تورکیاش مۆری کردبوو.

لەبەرگی دوهەمی ئەم کتێبەدا لەباسی دووهەمی بەشی حەوتەمدا کەبۆ ئەوپەیمانە تەرخانکراوە دەربارەی ئەو مادانەی لەوپەیمانەدا دانیشتوانی کوردی گرتبووەوە لەباکووری کوردستاندا ئاماژەمان بۆ مادەکانی(٣٧,٣٨,٣٩,٤٤)کردبوو کەلەو مادانەدا کوردی دەگرتەوە وەکو لەخوارەوە باسکراون:

مادە:٣٧-حکومەتی تورکیا بەڵێن ئەدا هیچ بڕیارو یاسایەك دەرنەکات کە بەپێچەوانەی ناوەڕۆکی مادەکانی ئەم پەیمانەی(لۆزان)بێت.

مادە:٣٨-حکومەتی تورکیا بەڵێن ئەدات هەموو دانیشتوانی ولاتەکەی سەربەستییەکی تەواویان دەبێت بیٚ جیاوازی لەڕووی نەتەوایەتیو زمانو ڕەگەزو ئاینی ئەو دانیشتوانەوە.

کادە:٣٩-هیچ جۆرە فشارو بەرهەڵستیەك ناخرێتە سەر هیچ هاولاتیەکی تورکیاو ڕێگەی لیٚ ناگیرێت لەبەکارهێنانی هەر زمانێك کە بیەویٚ بەکاری بێنێت لەکاروباری خۆیدا وەکو کاروباری بازرگانیو ڕاگەیاندنو نووسینو بلاوکردنەوەی چاپەمەنی لەشوێنە گشتیەکانا.

مادە:٤٤-بەڵێنەکانی حکومەتی تورکیا لەبەجێهێنانی مادەکانی ئەم پەیمانە بریتین لەبەجێهێنانی بڕیارەکانی نێو دەوڵەتی کە بەهیچ شێوەیەك حکومەتی تورکیا بۆی نیە لیٚ یان پاشگەز بێتەوەو ئەو ولاتانەی کۆمەڵی نەتەوەکانیان لیٚ پێك دێت(مەبەست عصبە الامم)ە مافی سەرپەرشتیکردنی بەجێهێنانی ئەو مادانەیان هەیە بۆ دڵنیابوون لەوەی ئایا تورکیا بەجیٚیان دەهێنێت یانا؟ وەمافی ئەوشیان هەیە دەست لەکاروباری تورکیا وەربدەن تا ئەوکاتەی ناچاری دەکەن بەڵێنەکانی بەجیٚ دەهێنێت.

ئەوەی شایانی باسە ئەو پەیمانەلە (٢٤)ی تموزی(١٩٢٣)دا لەلایەن حکومەتەکانی: بریتانیا, فرنسە, ئیتاڵیا, ژاپۆن, یۆنان, ڕۆمانیا, صرب, کرواتیا, سلۆڤیناو تورکیاوە مۆرکراو نوێنەری تورك لەکاتی مۆرکردنی پەیمانەکەدا وتبووی:حکومەتی تورکیا بەناوی حکومەتی تورکو (٧٥)

ئەندامی کورد کە لەئەنجومەنی میللیی تورکدان لە ئەنقەرە ئەوپەیمانە مۆر دەکات...

بەڵام هەمووی چەند مانگێک تێپەڕی نەکرد بەسەر ئەو پەیمانەدا، مصطفی کمال ئەنجومەنی میللیی تورکی هەڵوەشانەوەو لەڕۆژی(٠٣/٠٣/١٩٢٤)دا زمانی کوردیو قوتابخانە کوردییەکانی قەدەغەکردو ئیتر هەربڕیارو یاسای تازە بوو لەلایەن حکومەتەوە دەرئەچوو کە هەموویان پێچەوانەی بڕیارەکانی لۆزان بونو ئەو حکومەتانەش کە بەرپرسیاربوون لە بەجێهێنانی مادەکانی لۆزانو سەرپەرشتیکردنیان هیچیان وتەیان لێوە نەهاتو ئەو(٧٥)ئەندامە کوردەش کەلەو ئەنجومەنە هەڵوەشێنراوە دابوون هیچ حسابێکیان بۆ نەکراو حکومەت بەوپەڕی دڕندەیەتیەوە سەرکوتی کردن.

بەپێیی وەرگێڕانەی ئەنیستیتۆتی پاریس لە فرنسیەوە بۆ ئینگلیزی حکومەتی تورکیا زنجیرەیەك بڕیارو یاسای دەرکرد هەروەکو لەخوارەوە باسیکراوە:

١) لەساڵی(١٩٢٤)دا یاسایەکی تازە بلاْوکرایەوە دەربارەی ڕێبازی نەتەوایەتیی ڕژێمی تورکیا کەبەو ئایدیۆلۆجیانە دەوترا(کمالیزم-Kamalism)و پاراستنی ئەو کمالیستە خرایە ئەستۆی سوپاو دەسەلاٚتێکی تەواوی پیٚدرا بۆ سەرگرتنو ئەو ئەرکەی پێی سپێرابوو، وەلە هەمان ساڵدا یاسایەك دەرچوو بەپێی ئەو یاسایە هەموو جۆرە ڕەخنە گرتنێك لە مصطفی کمال یالە ئایدیولۆجیەتی تورکیا لەڕووی ڕەگەزەوە دەبیٚ بەتورك بژمێرێنو بەوجۆرە ناوهێنانی کوردو کوردستانو باسکردنیان بەتاوان دەژمێرێت.

ئـەو یاسـایانەی لەلایـەن حکومەتـەوە دەرکـران کـە پێچـەوانەی بڕیارەکانی لۆزان بوون بریتی بوون لە:

٢) لەسـاڵی(١٩٢٦)دا بـەپێی مادەکـانی(١٤١)و(١٤٢)ئەویاسـایەی بەرچـو بەو بڕیـاردرا کـورد بـۆی نیـە مەریـەی کوردایـەتی خـۆی بـاس بکـاتو دەستنیشـانی بکـاتو بـۆی نیـە هـیچ کۆمـەڵو ڕێکخراوێکـی تایبەتیی خۆی هەبێت.

٣) لەیاسـای ژمـارە(٢٨٢٠)دا وتـراوە: نـابێ هـیچ پـارتێکی سیاسـی لـەتورکیادا دان بـەبوونی کـوردا بنێـت یـا پارێزگـاری لـەبوونو بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیریی کورد بکات.

لـە(١٩٢٦/٠٣/٠٣)دا یاسـای ژمـارە(٧٦٥)بڵاوکرایـەوە کـە پێیـی وتراوە(قانونی عقوباتی تورکی) لەمادە(١٤١)دا فقرە(٤)یدا ووتراوە:

((ئەوانـەی بـەناوی ڕەگەزایەتیـەوە هەوڵبدەن بەشـێك یاهـەموو ئـەو مافانـەی لەیاسـادا دەستنیشـانکراون لاواز بکـەن یـا تێکیـان بـدەن (٥-١٢)سـاڵ زینـدانی دەکـرێن (مەبەسـت لـەماف-مـافی دەسـەڵاتدارێتی یەسەڵاتدارانی حکومەتە).

٤) بـەپێی فقـرە(٥)ی مـادە(١٤١)ی هـەمان یاسـا(مەبەسـت یاسـای ژمـارە(٧٦٥) ئەوانـەی دەبـن بەلایـەنگری ئەوانـەی لـەفقرە(٤)داباسـکراوە بەپێی ئەویاسایە(٥-١٢)ساڵ زیندانی دەکرێن.

٥) بـەپێی فقـرە(٦)یمـادە(١٤١)ی هـەمان یاسـای پێشـوو، دەتـوانرێ ئەگەر ئەو کردارەی لەمـەدا باسـکراوە پێوەنـدیی بەیـەکێك لـەدەزگا کـانی بـەڕێوەبردنی حکومەتـەوە هـەبێت وەیـا ئـەوکارە لـەناو هـۆڵو خـانووی دەزگاکـانی حکومەتـدا ڕوویـدات کـەنرخی ئـەو هـۆڵو خـانوو شـوێنانە

بەپارەی حکومەت کرابن ئەوا دەتوانرێ سێ یەکی ئەو سزایەی دراوە بخرێتە سەر سزاکەی ئەمە خانووی نەقابەی کرێکاران و ئوتابخانەکان و دەزگا پۆلیتیکییەکانیش دەگرێتەوە.

٦) بەپێی فقرە(٨)ی مادە(١٤١)هەروەکو بونەوەی ڕێکخراوێک کەلەدووکەس پتر تیایا بەشداربن مادەکەی پێشوو دەیانگرێتەوە(دیارە ئەوانەی بەرەزامەندی حکومەت نەبوبێت).

٧) فقرە(٣)ی مادە(١٤٢)هەرکەسێك بەمەبەست و نیازی ڕەگەز پەرستێتی هەوڵ بدات بەشێك, یاهەموو ئەو دەسەلأتانەی دراون لاواز بکات یا تێکی بدات لەڕێگەی بلأوکردنەوەی پڕوپاگەندەوە بۆماوەی(٥-١٠)ساڵ زیندانی دەکرێت.

٨) فقرە(٤)ی مادە(١٤٢)هەرکەسێك ڕەفتارو کرداری ئەو تاوانبارانەی ئەو مادانە دەیانگرێتەوە بەڕاست و بەباشیان بزانێت بۆماوەی(٢-٥)ساڵ زیندانی دەکرێت.

٩) فقرە(٥)ی مادە(١٤٢)ئەگەر ڕووداوێك لەوشوێنانەدا ڕوویدا کەبەرلەمە لەفقرە(٦)ی مادە(١٤١)دا باسیکراوە ئەوا دەتوانرێت سێ یەکی ئەو مادانەش کەبۆیان دەستنیشانکراوە بخرێتەسەری.

لەم ساڵانەی دواییدا گەلێك یاسای تر دەرچوە وەکو:

١- یاسای ژمارە(٢٨٨٠)کەلە(١٩٨٣/٠٤/٢٤)دەربارەی حزب و کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی ناو تورکیا و بەپێی ئەم یاسایە گەلێك مەرجی گران و توندو تیژ دانراوە بۆ ئەو حزبانەی بۆچوون و پرۆگرامەکانیان لەگەڵ بیروباوەڕی کەمالیستەکانا یەکی نەدەگرتەوە.

٢- لە(١٠/٠٩/١٩٨٣)دا یاسای ژمارە(٢٣٩٢)دەرچوە کە تایبەت بوە بەچاپەمەنی و بڵاوکراوەکان و ڕۆژنامەو گۆڤارو فلیم و گەلێك شتی تر.

ـ ئەوەی شایانی باسە, جگە لەو دووباسە پرۆفیسۆر حسرتیان و وەرگێڕاوەکەی ئەنیستیتۆتی کوردی لەپاریس دەربارەی ئەو یاسایانەی دژی کورد دەرچوون, هەندێ سەرچاوەی تریش باسی هەندێ لەو یاسایانەیان کردوە وەکو کتێبەکەی عبدالرحمن قاسملۆ سەرچاوە(١٦)کەلە لاپەڕە(٧٨)یدا ئاماژەی بۆ کتێبەکەی ڕامبۆ کردوە دەربارەی ڕاگوێزانی کورد لەژێر ناوی (Rambour Les Kurds) کەبەرلەمە دکتۆر عزیز شمزینیش باسیکردوە بێجگە لەوە دکتۆر قاسملۆ ئاماژەشی بۆ کتێبەکەی(م.تیکیا لب)کردوە کە بەزمانی چیکی دەربارەی کەمالیەکن لەساڵی(١٩٣٨)دا چاپکراوە لەلاپەڕە(٢٢٢)یدا باسی چۆنێتی قەدەغەکردنی زمانی کوردی کردوە.

قاسملۆ ئاماژەشی بۆ کتێبی نووسەرێکی تورك کردوە(ئەحمەد رشید) کە مامۆستایەکی ئەکادیمیەو لەلاهای کتێبەکەی چاپکردوە بەناوی(مافی کەمایەتیەکان لە تورکیا لەڕابردوو لە ئێستاداو لەو کتێبەیدا کە بەئارەزووی حکومەت نوسیویتیی, هەندێ شتی بەپێچەوانەی ڕاستیەکان تۆمارکردوە کە وتوویەتی(مێژوو دەری خستوە تورکیا هەمیشە وە بە شێوەیەکی چەسپاو ڕێزی لەمافی کەمەنەتەوەکان گرتوە هەرچەند زۆرجار ڕووداوەکان لەگەڵ ناوەڕۆکی یاسادا یەکناگرێتەوەو ئەو کێشەیەش کە لەنێوان حکومەتی تورکیا و هەندێ کۆمەڵ و تاقمدا ڕوویداوە هیچ پێوەندییەکی نەبوە بەمافی کەمەنەتەوەکان)).

قاسملۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەکانی ئەو نووسەرەو ئەوانەیتر کە بیستوویانە پێ شێلکردنی مافی کەمەنەتەوەکان بشارنەوەو بیانوو درۆو دەلەسەی بۆ بدۆزنەوە, ئاماژەی بۆ ئەوبەیانو ووتارەی مصطفی کمال کردوە کەساڵی(١٩٣٦)دا لەئەنجومەنی میلليدا بەئاشکرا وتبووی:

((گەورەترین کێشەی ناوخۆ بریتییە لەکێشەی درسیم(مەبەستی شۆڕشەکەی درسیمە بەسەرکردایەتی سەید ڕەزا)و بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە پێویستە کاربەدەستانی حکومەت لەوناوچەیەدا ئەوپەڕی دەسەڵاتیان پێ بدرێت بۆ کەم کردنەوەو نەهێشتنی ئەو کێشەیە))، سەرچاوەی قاسملۆ بۆ ئەمەی مصطفی کمال بریتیەلە کێشەکەی نوری درسیمی لاپەڕە(١٠٥) لەباسی دەهەمی شۆڕشی ئاگریداغیشدا بەرلەمە ئاماژەمان بۆیاسای ژمارە(١٨٥٠)کردوەکە هەروەکو گۆڤاری(The Kkurds) بلاوی کردۆتەوە دەربارەی لێ نەپرسینەوە لەهەر کوشتارو ڕەفتارێك کەلەلایەن کاربەدەستانی سوپایی و مدنی تورکەوە کرابێت بەنیازی دابینکردنی ئاسایش لەناوچەکانی(Zelan-Ercisو ئاگریداغو ئورفەو ئەرزنجان یاله هەرشوێنێکیتری ئەناتولیا هەروەکو لەڕۆژنامەی میلليت دا بلاوکراوەتەوە.

تائێرە, لەم بەرگی سێهەمەدا باسی شەڕی جهانی دوهەمو هەندێ لەویاسایانەی دوای شەڕی دوهەمی جهانی دەرچوە خرایە پێش چاوی خوێندەوارانی بەڕێزو هیوادارم لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی مەزنی کورد لەباکور ئەوانەی لەمن شارەزاتر ئاگاداری ڕووداوەکانن زنجیرەی مێژووی باکوری کوردستان تەواو بکەنو لاشم وایە میللەتێك دوای ئەو هەموو فیداکاریو خۆبەختکردنانەی لاپەڕەکانی مێژوو تۆماریانکردوە, ئەوا

هەربەئامانجی خۆی ئەگات و ڕژێمی فاشستی وورده وورده گەندەڵ ئەبێت و ئازادی و دیموکراتی سەردەکەوێت.

لەکۆتایی ئەم بەرگەدا سوپاسێکی بێ پایانی ئەو بەڕێزانە ئەکەم کە هەندێ سەرچاوەیان بۆناردم بەتایبەتی برای بەڕێزم مامۆستا محمدی ملا کریم کەهەمیشە خەمی هەموو نووسەرێکی خواردوە بۆ دەستگیر بوونی ئەو سەرچاوانەی لەتوانایدا بوە پەیدایان بکات.

## سەر چاوەکانی بەرگی دووەم

| زنجیرە | ناوی سەرچاوە | نووسەرو وەرگێڕ | شوێن و ساڵی لەچاپدانی |
|---|---|---|---|
| ١ | گۆڤاریThe Kurds | David Macdwell | ژمارە/٣ لندن ١٩٨٢ |
| ٢ | اعلام الكرد | مير بصري | لندن-قبرص ١٩٩١ |
| ٣ | مێژووی ڕۆژنامەگەری | دکتۆر جمشيد حيدری | گۆڤاری پەیڤ ژمارە/١٦ لندن ١٩٩٢ |
| ٤ | People With Out Contry | نوسینیChallandوەرگێڕانی دکتۆر احمد عوسمان | گۆڤاری نووسەری کورد ژمارە/٤ ساڵی ١٩٨٦ |
| ٥ | ڕۆژنامەی کوردستان | دەستەی نووسەرانی گۆڤاری چوار چرا | گۆڤاری چوار چرا ژمارە/٢ ساڵی ١٩٨٦ |
| ٦ | پێوەندیی نێوان کوردو ڕوسیا | دکتۆر کمال علی | گۆڤاری چوار چرا ژمارە/٣ ساڵی ١٩٨٦ |
| ٧ | شۆڕشی درسیم | وەرگێڕنی لە تورکیەوە بۆ کرمانجی ی ژووروو لەلایەن دکتۆر جبار قادر بەپیتی لاتینیی و وەرگێڕانی حسن کوخی بۆ پیتی عەرەبی بە کوردی | گۆڤاری پێشەنگ ژمارە/١٥ سوید ساڵی ١٩٨٨و گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە/١٢٦ ساڵی ١٩٩٠ |
| ٨ | مەسئەلەکانی کورد | د.جی.نیلفنستن, وەرگێڕی عبدالقادر حشمت بۆ کوردی | لەبلاو کراوەکانی دەنگی گێتی |
| ٩ | کوردستانی تورکیا بەزەمینەی مێژوییەوە | دکتۆر عصمت شريف وانلی | گۆڤاری خوندکاری کورد پاریس ١٩٩٠ |
| ١٠ | گۆڤاری کوردستان ١٩١٩-١٩٢٠ | فەرهاد پیرباڵ | چاپی پاریس ١٩٩٠ |
| ١١ | چل ساڵ لەمیرموەریی جلادت بدرخان | کونی ڕەش | گۆڤاری هیوا پاریس ژمارە/٨ ساڵی ١٩٨٦ |
| ١٢ | البارزاني والحركة التحررية انتفاضة بارزان الاولى ١٩٣١-١٩٣٢ | مسعود بارزانی | چاپخانەی خەبات ١٩٨٦ |
| ١٣ | ملاحظة تاريخية حول نشأة الحركة القومية الكردية | سیامند احمد عوسمان | گۆڤاری دراسات كرديه-پاریس ساڵی ١٩٨٤ |
| ١٤ | ڕابەری ڕۆژنامە گەری | جمال خەزنەدار | بغداد ١٩٧٣ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | ڕۆژنامەکانی بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣ | جمال خەزنەدار | ١٩٧٣و١٩٧٤ بغداد |
| ١٦ | کردستان والاکراد | دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ | بیروت١٩٧٢ |
| ١٧ | جمهوریه مهاباد | ولیم ئیگلتن-وەرگێڕانی جرجس فتح الله بۆ عەرەبی | بیروت ١٩٧٢ |
| ١٨ | ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠ | نوسینی دکتۆر جلیلی جلیلی وەرگێڕنی دکتۆر کاوس قەفتان بۆ کوردی | بغداد ١٩٧٨ |
| ١٩ | کێشەی کورد لەسیڤەرەوە بۆ لۆزان | دکتۆر فواد حمه خورشید | گۆڤاری ڕەنگین ژمارەکانی٧٩،٨٠،٨٩ساڵانی ١٩٩٥،١٩٩٦-بغداد |
| ٢٠ | دەربارەی ڕۆژنامەی کوردستان | محمد ملا کریم | گۆڤاری ڕەنگین ژمارە/٧٩-١٩٩٥ |
| ٢١ | کوردەکانی ئیمپراتۆریتی عوسمانی | نوسینی دکتۆر جلیلی جلیل وەرگێڕانی دکتۆر کاوس قەفتان بۆ کوردی | بغداد ١٩٨٧ |
| ٢٢ | کردستان والحرکة القومیة الکردیة | جلال تاڵەبانی | بیروت ١٩٧١ |
| ٢٣ | کوردو کردستان في الوثائق البریطانیة | دکتۆر ولید حمدي الاعظمي | قبرص ١٩٩٢ |
| ٢٤ | کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی جهانیدا | دکتۆر کمال مەزهەر | بغداد ١٩٧٥ |
| ٢٥ | عرب واکراد-رؤویة عربیة | منذر الموصلي | بیروت ١٩٨٦ |
| ٢٦ | ڕۆژی کورد ساڵی ١٩١٣ | جمال خەزنەدار | بغداد ١٩٨١ |
| ٢٧ | یاداشتەکانی میجر نۆئیل | میجر نۆئیل | دوکیومنیتی-Fo.371-13947ئەرشیفی وزارتی دەرەوەی بریتانیا |
| ٢٨ | جمهوری اول تورکی | ڕیچارد رالینسۆن و ئیرج ئەمنی کردویەتی بە فارسی | چاپی تاران ١٣٥٦/٠٤/٠٧ کۆچی |
| ٢٩ | کوشتاری ئەرمەنیەکان | کاك باجلانKak Bajalan | گۆڤاریKurdish Timeژمارە/٢ ساڵی١٩٩٢ ئەمریکا |

| ٣٠ | كمال ئەتاتورك | محمد محمد تۆفیق وسماعیل فراهانی کردویتی بەفارسی | چاپخانەی موسوی-ئەراك ئێران ساڵی ١٣١٨ی کۆچی |
|---|---|---|---|
| ٣١ | کوردستان و شۆڕشەکەی | نوسینی دکتۆر جمال نەبەزو دکتۆر کوردۆ لە ئەڵمانیەوە کردویتی بە کوردی | چاپی سوید ساڵی ١٩٨٥ |
| ٣٢ | خلاصة تاریخ کردو کردستان | نوسینی ئەمین زەکی بەگ بەکوردی وەرگێڕانی محمد علی عونی بۆ عەرەبی | چاپی قاهرە ١٩٦١ |
| ٣٣ | گەشتەکەی(بیور)لەکورد ستاندا | شوکر مصطفی لەتورکیەوە کردویتی بەکوردی | گۆڤاری کۆڕی زانیاری-بغداد ژمارە/٢ ساڵی ١٩٨٣ |
| ٣٤ | کورد لای گردلیڤسکی | دکتۆر کمال مەزهەر | گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە/٢ ساڵی ١٩٨٣ |
| ٣٥ | عربۆاکرام-خصام او وئام | دکتۆر دریە محمد علی عونی | قاهرە چاپی ساڵی ١٩٩٣ |
| ٣٦ | کوردو مەسەلەکەی | میخائیل سیمۆ نۆفیچ لازاریف وەرگێرانی دکتۆر کمال علی بۆ کوردی | گۆڤاری(سوکسە)سوید |
| ٣٧ | الاکراد شعبا وقضیة | صلاح بدرالدین | بیروت ١٩٧٨ |
| ٣٨ | مێژوو-کوردو مێژوو | دکتۆر کمال مەزهەر | بغداد ١٩٨٣ |
| ٣٩ | چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد | دکتۆر کمال مەزهەر | بغداد ١٩٨٣ |
| ٤٠ | کۆمەڵ و ڕێکخراوو حزبەکوردیەکان لەنیو سەدەدا | دکتۆر عبدالستار طاهر شریف | بەرگی ١٨-١٩ گۆڤاری کۆڕی زانیاری-بغداد ١٩٨٨ |
| ٤٠/أ | الجمعیات و المنظمات والاحزاب الکردیة في نصف قرن | دکتۆر عبدالستار طاهر شریف | بغداد ساڵی ١٩٨٩ |
| ٤١ | مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا | کریس کوچرا-وەرگێڕ محمد ریانی | چاپی تاران ١٣٦٩ی کۆچی |
| ٤٢ | جولانەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کورد | نوسینی دکتۆر عزیز شمزین وەرگێرانی بۆ کوردی(ئەسە سەرد) | چاپخانەی ئیبراهیم عزو ساڵی ١٩٨٥ |
| ٤٣ | کورد | مینورسکی وەرگێرانی بۆ عەرەبی دکتۆر مارف خەزنەدار | بغداد ١٩٨٤ |

| ٤٤ | الرجل الصنم-ئەتاتورك الجزء الاول والثاني | ظابط تركي سابق وترجمه عبدالله عبد بۆ عربي | بيروت ١٩٩٢ |
|---|---|---|---|
| ٤٥ | القومية في توركيا | پرۆفیسۆر حسرتیان وەرگێرانی بۆ عربی(سیامند سرتی) | شوێن و ساڵی چاپی لەسەر نیە. |
| ٤٦ | تركيا والشرق الاوسط | Philip Robins تەرجمەی بۆ عربی-میخائیل نجم خوری | ليما سول-قبرص ١٩٩٣ |
| ٤٧ | العـرب والـترك في العهـد الدســـــــتوري العثماني١٩٠٨-١٩١٤ | دكتۆر تۆفیق برو | دمشق ١٩٩١ |
| ٤٨ | الدولـة العثمانيـة-قـراءة جديدة لعوامل الانحطاط | دكتۆر قيس جواد العزاوي | فلوريدا ١٩٩٤ |
| ٤٩ | كردســتان توركيــا بــين الحربين | پرۆفیسۆر حسرتیان و ترجمەی بۆ عربی سعدالدین ملاو باقی نازی | بيروت ١٩٨٧ |
| ٥٠ | بنەماڵەی شێخی پیران | Robertolson | جامعەی کنتاکی ١٩٨٤ |
| ٥١ | ســياحەتنامەی ئــەوليا چلبی | وەرگێڕی سعید ناکام بۆ کوردی | بغداد ١٩٧٦ |
| ٥٢ | کورد از بیرون | حســن عرفــە-وەرگێرانــی حامــد گەوهەر | سويد ١٩٨٥ |
| ٥٣ | جنبشهای کورد از بیرون تا اکنون | م.کاردوخ | یوتوبوری/سوید ١٩٩٣ |
| ٥٤ | الاكراد | باسیل نیکهتین وەرگێرانی صـلاح بروارى | ١٩٩٣ |
| ٥٥ | نهضة الاكراد الثقافية | دكتــۆر جليلــی جليــل-بــاقی نازیو(د.ولاتو)کردویانە بەعربی | بيروت١٩٨٦ |
| ٥٦ | كردســـــتان والحركـــــه القوميه الكرديه | صلاح بدرالدين | نيقوسيا ١٩٨٣ |
| ٥٧ | في ســــــــــــبيل كردستان(مذكرات | زنار سلپی(قدری جمیل پاشا) | بيروت ١٩٨٧ |
| ٥٨ | تــاريخ الدولــة العليــة العثمانية | فريد بكرى المحامی | بيروت ١٩٨١ |
| ٥٩ | جولانـــــەوەی رزگـــاری خوازیی کورد | رادۆڤان باڤیچ وەرگێرانی محمود ملا عزت | سويد ١٩٨٥ |
| ٦٠ | القضية الكردية-ماضي | بلە چ شیرکۆ(جلادت بدرخان) | بيروت دار كاوه للنشر ١٩٨٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | الكرد وحاضرهم | | |
| ٦١ | انتفاضة ئاگری-مذكرات | وەرگێرانی صلاح بروارى بۆ عربى | بيروت ١٩٩٠ |
| ٦٢ | محازەرەيـــەك دەربـــارەی كوردستان | ژنەكەی ميجرسون | لەگۆڤاری Journal The Royal Centreحزيرانی١٩٣٥ |
| ٦٣ | الحركة الكردية في الزمن الحديث والمعاصر | تاليف مجموعة من المستشرقين الروس ترجمه بۆ عربى كرم السويدى | مسۆدەيەكى چاپ نەكراوە |
| ٦٤ | The Baning Of Kurdog is Culture | نوســـينی پرۆفيســـۆر حســـرتيان ترجمە(ش.خ.محو) | انستيتوتی كوردی لە پاريس |
| ٦٥ | ياداشـــتەكانی مامۆســـتا رفيق حلمی | رفيق حلمی | چاپی دوهەم بغداد ١٩٨٤ |
| ٦٦ | The Conflict Of Tribes in Iran And Afganistan | مارتن ڤان بروسنون | لندن ١٩٨٣ |
| ٦٧ | بيرەوەريـــەكانی عزيـــز ياموڵكی | عبدالعزيز ياموڵكی | ڤۆگـــــــاری مامۆســـــــتای كورد(١٩٦٦)سويد |
| ٦٨ | گەشتەكەی (ريچ) | وەرگێرانی حەمەی حەمە باقی | چاپی تەورێز ١٩٤٢ |
| ٦٩ | ياداشـــتەكانی ئەحمـــەد تقی | ئامادەكردنی جلال تقی | بغداد ١٩٧٠ |
| ٧٠ | كوردو عجم | صـــاڵح محمـــد ئـــەمين(نوشـــيروان مستەفا) | چاپی ساڵی(١٩٩٢) |
| ٧١ | كورتـــــە ميـــــژووی بزوتنـــەوەی نەتەوايـــەتی كورد | صادق شرفكندی | سويد١٩٩٥ |
| ٧٢ | ذكر الاكرادء اصولهم من كتابات المسلمين الاوائل | دكتۆر احمد عوسمان ابوبكر | گۆڤاری كـۆڕی زانيـاری ژمـارە/١٢ ساڵی ١٩٨٥ بغداد |
| ٧٣ | شێخ و ئاغاو دەوڵەت | مـــارتن برومنـــوف بـــەرگی يەكـــەم ترجمەی دكتۆر كوردۆ علی | سويد١٩٩٦ |
| ٧٤ | الـــــتراث الكـــــردي في المؤلفات الايطالية | Mirello Galletti وەرگێرانـی دكتۆر يەنس حبی بۆ عربی | گۆڤـــــاری كـــــۆڕی زانيـــــاری ژمارە/٨ساڵی١٩٨١ |
| ٧٥ | شرفنامە | شـــــرفخانی بـــدليس-هـــــەژار لەفارسيەوە كردويێتی بەكوردی | چاپی تاران چاپخانەوی جەوهـەری ساڵی١٩٨١ |
| ٧٦ | ڕۆژنامـــەی كوردســـتان لەساڵانی١٨٩٨-١٩٠٢ | كۆكردنـەوەو لەسەرنوسـينی محمـد ئەمين بۆز ئەرسەلان | دوجلد-سويد |
| ٧٧ | گۆڤاری ژين | كۆكردنەوەو لەسەر نوسينی محمـد | چوار جلد-سويد |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | ئەمین بۆز ئەرسلان | |
| ٧٨ | ژیانی شریف پاشای خەندان | | گۆڤاری مامۆستای کورد-سوید ساڵی١٩٩٥ |
| ١/٧٨ | Dicavkaniye Swedi De Motiven Kurdi | ڕوهات ئالاکۆم | چاپی سوید ١٩٩١ |
| ٧٩ | The Case Of Kurdistan Against Turkey | سریا بدرخان | فلادلیفیا ساڵی١٩٢٨ چاپی دوهەمی سوید١٩٩٥ |
| ٨٠ | بەرگی یەکەمو دوهەمی کتێبەکەی شێخ محمودی قارەمانو دەوڵەتەکەی کوردستان | محمد رسول هاوار | ١٩٩٠ لندنو١٩٩١ ستۆکهۆڵم |
| ٨١ | گزیدەی اسناد سیاسی ئێرانو عوسمانی در دورەی قاجاریه-جلداول | دفتر مطالعات ساسي، بين الملل ئيران | تاران ١٣٦٩کۆچی |
| ٨٢ | الامبراطورية العثمانية | سعيد احمد بر جاوى | بيروت ١٩٩٣ |
| ٨٣ | الترك في العصور الوسطى وبيزنطة و سلاجقة الروم | دكتوره زبيدة عطا | كويت-دار الفكر العربي مێژووی چاپی لەسەر نیە |
| ٨٤ | The Emegenco Of Kurdish Nation alism And Shaikh Said Rebilion 1880-1925 | Robert Olson | چاپی امریکا ١٩٨٩ |
| ٨٥ | Ataturk The Birth Of Nation | Patrick Kinross | لندن١٩٩٥ |
| ٨٦ | المغول | السيد الباز العريني | بيروت ١٩٨٦ |
| ٨٧ | ژمارەکانی گۆڤارەکانی ڕۆژی نوێ | ئیسماعیل حقی شاویس | ١٩٦٠-١٩٦١ سلێمانی |
| ٨٨ | مجلات الهلال خلال سنوات | منشاها جرجى زيدان | مطبعة الهلال-فجالة-مصر |
| ٨٩ | The Otoman Empire Osoman | Wane.S.Vucinich سهیل ئازری کردویتی بەفارسی | چاپخانەی شفق/تەورێز ساڵی١٣٤٦ی کۆچی |
| ٩٠ | تاریخ عوسمانی از تشکیلات تافتح استمبول | دکتۆر ئیرج نوبخت کردویتی بەفارسی | ١٣٦٨ی کۆچی |
| ٩١ | کوردستان موکریان یا اتروپاتین | حسین حوزنی موکریانی | رواندز ١٩٣٨ |

| ٩٢ | الاكراد والعرب | ئیبراهیم ئەحمەد | بغداد چاپی یەکەم ساڵی١٩٣٧ |
|---|---|---|---|
| ٩٣ | تاریخ الامارات الكردية من الامبراطورية العثمانية | پرۆفیسۆر جلیلی جلیل وەرگێڕانی دکتۆر محمد عبدوالسنجاری بۆ عربی | دمشق١٩٨٧ |
| ٩٤ | پێوەندارێتی کورد | دکتۆر جمال نەبەز | ١٩٨٦ ستوکهۆڵم |
| ٩٥ | معاهدە سیڤەر | م.رسول هاوار | گۆڤاری الثقافة الكردية ژمارە/٢ چاپی لندن- مەڵبەندی رۆشنبیری١٩٨٨ |
| ٩٦ | الاكراد حفید المیدیین | مینورسکی وەرگێڕانی دکتۆر کمال مەزهەر | گۆڤاری کۆڕی زانیاری بغداد |
| ٩٧ | ئاوێستاو نامەی مەینەتی ئاینی زەردەشت بەشی یەکەم | ئەنداز حوێزی | سوید١٩٩٢ |
| ٩٨ | کوردستان لەچەند گەشتێکی رۆژ ئاواییەکاندا | شوکر مصطفی لەتورکیەوە کردوێتی بەکوردی | گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە/٨ ساڵی ١٩٨١ بغداد |
| ٩٩ | مێژووی حەسەنوەیلی و عەیاری | محمد جمیل رۆژ بەیانی | بغداد١٩٨٦ |
| ١٠٠ | رۆژنامە گەریی کورد | مالمیسانج(مالمیخانژ) | سوید١٩٨٩ |
| ١٠١ | دوکیومینتەکانی ئەرشیفی حکومەتی بریتانیا | نووسەری راپۆرتەکان | ....... |
| ١٠٢ | خەبات(کێشە)لەرێی کوردستاندا | پرۆفیسۆر خالفین.جلال تقی لەروسیەوە کردوێتی بەکوردی | ١٩٨٢ |
| ١٠٣ | اضواء علی قضایا دولیة | دکتۆر کمال مەزهەر | بغداد١٩٧٨ |
| ١٠٤ | مێژووی مۆسیقای کورد | محمدی حمە باقی | سەقز١٩٩٦ |
| ١٠٥ | ئیسلام مردم پەسند، ناسیونالیزمی کورد- سەرهڵدانی شێخ سعید لەتورکیا ساڵی١٩٢٥ | مارتن ڤان برنسون و Gerard Beneck وەرگێڕنی حسنی قازی بۆ کوردی | Publick Record لندن |
| ١٠٦ | بەشی سێیەمی یاداشتەکانی مامۆستا رفیق حلمی | ئامادەکردنی دکتۆرە پاکیزە رفیق حلمی | بغداد |

| ١٠٧ | Mesopotamia And Kurdistan Disgiuse | میجرسون | چاپی لندن١٩١٢ |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | کوردستان-یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی | کۆکردنەوەو لەسەر نوسینی د.کمال فوئاد | سلێمانی١٩٩٨ |
| ١٠٩ | شۆڕشی شێخ سعید | د.عوسمان علی | گۆڤاری ئاڵای ئیسلام ژمارە/١٤ ساڵی١٩٩٨ |
| ١١٠ | باسی عصبە الامم ومبادئی ولسون | دکتۆر عصمت شریف وانلی | گۆڤاری دراساتی کوردی ژمارە/٢١ بەشی عربی-پاریس |
| ١١١ | بدرخانیو جزیرە بۆتان | نوسینی مالمیانژو وەرگێڕانی بۆ عەرەبی شوکر مصطفى | اربیل١٩٩٨ |

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٧ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێڕ | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٧٠ | بیبلۆگرافیای چاپ و بڵاوکردنەوە | جەبار سابیر | بیبلۆگرافیا | چاپکردن |
| ٤٧١ | ئینسایکلۆپیدیای منداڵ/ گەردوون | ئاوات عەبدوڵڵا | منداڵان | چاپکردن |
| ٤٧٢ | ئینسایکلۆپیدیای منداڵ/ زەوی | ئاوات عەبدوڵڵا | منداڵان | چاپکردن |
| ٤٧٣ | هەرزەکاران با خۆیان بناسن | گەشاو عەبدولقادر | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٤٧٤ | رووەکەکان | سۆزان جەمال | زانستی | چاپکردن |
| ٤٧٥ | سایکس پیکۆ | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٧٦ | سەرمەشقی دالیا | عالیە عەبدولکەریم | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٧٧ | کەشکۆڵی گەردوون | جەمال محمد | زانستی | چاپکردن |
| ٤٧٨ | پیاوێك لەپەراوێزدا | ئەسعەد عەزیز | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٧٩ | چیرۆکی ئادەمیزاد | رەئوف زوهدی | چیرۆك | چاپکردن |
| ٤٨٠ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٢) | چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٨١ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٣) | چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٨٢ | رەخنەی نوێی کوردی | د. کەمال مەعروف | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٨٣ | گفتوگۆ لەسەر خوانی خوێنێن کۆرامانێك لەئەنفال | حەمەکاکە رەش | گفتوگۆ | چاپکردن |
| ٤٨٤ | رەفتار تێکچوونی منداڵ | نوری سەعید قادر | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٨٥ | پرنتەر | سەلام مارف | کۆمپیوتەر | چاپکردن |
| ٤٨٦ | کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد | عەتا قەرەداغی | رامیاری | چاپکردن |
| ٤٨٧ | ژیان لەپێناو گێڕانەوەدا | جەبار سابیر | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | چاپکردن |
| ٤٨٨ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٤) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٨٩ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٥) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٩٠ | دیوانی ئاوات حەسەن | ئاوات حەسەن | شیعر | چاپکردن |
| ٤٩١ | ئۆقیانووسێك لەتاوان | جەمال وەلی ئیبراهیم | کۆمەڵایەتی | چاپکردن |
| ٤٩٢ | دەستنووسی لەقێکان | نەجات نوری | رۆمان | چاپکردن |
| ٤٩٣ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٦) | ب. چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٤٩٤ | دیوانی غەوسە | ئا: مارف ناسراو | شیعر | چاپکردن |
| ٤٩٥ | الثدي | د. نهرین جون عزیز | تەندروستی | چاپکردن |

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێڕ | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٤٩٦ | دیوانی جەمیل ڕەنجبەر | جەمیل ڕەنجبەر | شیعر | چاپکردن |
| ٤٩٧ | زنجیرەیەك باس و لێکۆڵینەوە | و. ڕەفعەت مورادی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٩٨ | مافی سروشتی | و. دلێر میرزا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٤٩٩ | بیرەوەرییەکانی پانزە ساڵی زیندانیم | فوئاد محەمەد تۆفیق | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٥٠٠ | ئاهەنگی نیو کاتژمێر | شیرین تاهیر | چیرۆك | چاپکردن |
| ٥٠١ | ئەزموونی شانۆگەری گەرۆك | بورهان قەرەداغی | شانۆ | چاپکردن |
| ٥٠٢ | ئەفسانەی جەنگەڵ | حەمە ڕەشید ئەحمەد شانە | چیرۆك | چاپکردن |
| ٥٠٣ | هەڵۆ بەرزەکان | جەلال مەحمود عەلی | چیرۆك | چاپکردن |
| ٥٠٤ | گۆڤاری هەنار ژمارە (١٧) | چاپ و بڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٥٠٥ | بەجیهانیبوون | عومەر ڕەسوڵ شێنکی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٥٠٦ | نیشتمانی من | ئیدریس شەهداهۆ | نووسینی ڕۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٥٠٧ | نوح | ئەنوەر قادر محەمەد | چیرۆك | چاپکردن |
| ٥٠٨ | ئارمان و ئازارەکانی ژن | سەروەر کەریم | وتاری ڕۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٥٠٩ | ئاشنابوون بەئەرستۆ | و: ڕیاز مستەفا | فەلسەفە | چاپکردن |